

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **مەملەکەتی ماد**

● نووسینی: **د. ئەحمەد مەحمود ئەلخەلیل**

● وەرگێڕانی: **حەمەسەعید کەلاری**

● پێداچوونەوەی: **ڕێبوار دەلۆ - ئاری خەیات**

● **نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: ڕێدار جەعفەر**

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٣

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩٩٩) ساڵی (٢٠١١)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٨٣)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## بەرایی

نووسینەوەی مێژوو شتێکە و خوێندنەوەی مێژوو شتێکی دی، ئەرکی مێژوونووس تێبینیکردن و تۆمارکردن و بە دۆکیۆمێنتکردنی ڕووداوەکانە و پێویستیشە تۆمارکردنەکە ورد و بەڵگاندنەکەش بە ئەمانەتەوە بکرێت، بۆ هەڵێنجان و بەدەستخستنی زانیارییەکانیش ئەگەر نووسەر لە سەردەمی ڕووداوەکاندا ژیابێت، ئەوا دەشێت خۆی گەواهیدەری ڕووداوەکان بێت و تێبینی کردبێت، یاخود کەسانێک ڕووداوەکانیان بە چاوی خۆیان بینیبێت و بۆ نووسەریان گێڕابێتەوە، یاخۆ لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ئەو نووسراوانەی کە مێژوونووسە پێشینەکان نووسیوویانە، لەوانەیە نەخش یان پەیکەرێکی بەردین، ژمارەیەکی قوڕین، شتومەکی دەستکردی دیکە بێت، یان ئاسەوارێکی هونەری و نووسین، یاخۆ تۆمارێکی فەرمیی، یاخۆ ئەو نامانەی کە دەسەڵاتداران و فەرمانڕەواکان بۆ یەکتریان نووسیوە و...هتد.

بەڵام ئەوە ئەرکی خوێنەرە بۆ نووسینە مێژووییەکان بگەڕێتەوە و خوێندنەوەی قووڵ و گشتگیرییان بۆ بکات و چاودێریی ڕووداوەکان بکات و ڕاستییەکانی لە ناڕاست و خورافییەکان جودا بکاتەوە و دوای بەشبەشکردنیان، بەراوردیان بکات و شییان بکاتەوە، ئینجا ئەو پێوەندییانە بدۆزێتەوە، کە ڕووداوەکانی بە یەکەوە گرێ داوە، دواتریش بەدووی پاڵنەر و هۆکاری قەوماوەکاندا بگەڕێت، جا ئەو پاڵنەر و هۆکارانە خودی بن یاخۆ بابەتی. کۆتاش ئەوەی شایەنی دووپاتکردنەوەیە، دووپاتی دەکاتەوە و ڕاستییەکانی بە ڕاست لە قەڵەم دەدات و ئەوەشی لۆژیک قبووڵی نەکات و لەگەڵ کەتواردا نەگونجاوە، دووری دەخاتەوە.

نووسەری مێژوو، خوێنەری مێژوو، یەکێک لەم دوو کەسەن:

- له نووسین و خوێندنەوەدا، یاخۆ پێوەست دەبێت بە ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراوی وەک (خێڵەکی، نەتەوەیی، ئاینی، سیاسی و...هتد)، بۆیە هەوڵ دەدات ئەو شتانە بخاتەڕوو، کە کۆکن لەگەڵ ئایدیۆلۆژییەکەیدا و خزمەت بە ئامانجەکانی دەگەیەنێت و ئەو ڕووداو و گێڕانەوانەش پشتگوێ دەخات، کە کۆک نین لەگەڵیدا و پێچەوانەی ئامانجەکانییەتی یاخۆ بە خوێندنەوە و دیدگەیەکی مەعریفیی بابەتییانەی بێگەرد و جوامێرانە دەست پێدەکات و ئامانجی سەرەکیی لە خوێندنەوەکەیدا خزمەتکردنی کولتووری مرۆیی و ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتییە بەگشتی، بۆیە بەوریاییەوە دەکۆشێت شتەکان بزانێت و بێ پێچوپەنا و فرتوفێڵ و بێ گەورەکردنەوە و بچووککردنەوە، وەک ئەوەی هەیە، پێشکێشیان دەکات.

لەڕاستیدا، من لەم کتێبەدا خوێنەری مێژووم و لە زانیارییەکان دەکۆڵمەوە و بەدووی زانینی ڕاستییەکانەوەم وەک ئەوەی کە هەیە. ڕاستە لەم خوێندنەوەدا من بە پلەی یەکەم لە ڕۆژئاوای ئاسیادا بە دووی مێژووی کورددا دەگەڕێم، بەڵام بەوریاییەوە ئەم کارەم بە ئەنجام گەیاند، تا نەکەومە داوی (نەرگسییەتی نەتەوەییەوە) و کوردانە لێکدانەوەم بۆ مێژووی ناوچەکە نەکردووە و لەو پێوەندییە پتەوەی مێژووی کورد و مێژووی میللەتانی دی ناوچەکە چاوپۆشیم نەکردووە و هەردەم نە ویستوومە و نەدەشمەوێت لە ناوچەکەدا کورد بکەمە ناوەندی بزووتنەوە مێژوورییەکە و گەلی ئەکاد و بابلی و ئاشووری و سریان و عارەب و تورک بخەمە پەراوێزەوە.

ڕاستە ماوەی دەسەڵاتی میدییەکان، بەراورد بە لقە دێرینەکانی دیکەی پێشینانی کورد (لۆلۆ، گوتی، کاششۆ، سۆپارتۆ، میتتانی، ماننایی، خەلدیی) کورتخایەنتر بووە، بەڵام گرینگی مەملەکەتی ماد لە بینین و گێڕانی دوو ڕۆڵدا خۆی دەبینێتەوە: یەکەم یەکخستنی ئەو پانتاییە جوگرافییە بوو، کە پێشینەکانی کوردی لەسەر ژیاون. دووەم: یەکخستنی زمان و ڕۆشنبیری گشتی بوو لەو ناوچەیە، کە دوایی بە (کوردستان) ناسرا.

لە مێژووی میدییەکاندا، من گرینگی تەواوم بە پاشاکانی مەملەکەت و پیاوە ناودارەکانی داوە و بەپێی مێژووی مردنیان، ناوەکانیانم ڕێک خستووە و لەسەرم

نووسیون. ڕاستە خولّقاندنی ڕووداوە مێژووییەکان تەنیا لای دەستەبژێرەکان کورت ناکرێتەوە، بەڵام لەکۆتاییدا ڕاستییەکان پێمان دەڵێن، کە لە هەموو سەردەمەکاندا، بەتایبەتی سەردەمە کۆنەکان، ئەوە دەستەبژێرە، کە لە مێژوودا پێشەوایی گەلی کردووەو بە دەستی ئەوان زۆرینەی ڕووداوە مێژووییەکان هاتوونەتە ئاراوە و جەماوەریان یەکخستووە و نوێنەرایەتییان کردووە و هانایان بۆ بردووە.

سەرەتا ئەم کتێبەم بە دەروازەیەک دەست پێکرد و لەوێ لە ڕووی ئەتنی و جوگرافییەوە باسم لە میدییەکان کردووە و بەدوای دەروازەکەدا باسم لە ڕووداوەکان و چۆنێتی دامەزراندنی مەملەکەتی میدیا و ململانێکانی ئەم مەملەکەتە دژ بە ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور و ڕۆڵی لە ڕووخانی ئەو مەملەکەتە لە ساڵی (٦١٢ پ - ز)، کە بەرەنجامەکەی ڕزگاربوونی ڕۆژئاوای ئاسیای لێ کەوتەوە. ئینجا باسم لە هەرەسی خودی مەملەکەتەکە، بەدەستی فارسە ئەخمینییەکان لە ساڵی (٥٥٠ پ - ز) کردووە. لە کۆتاییدا چەردەیەک زانیاریم، پێوەست بە مەملەکەتی ماد، لەڕووی شارستانییەتەوە بەگشتی، خستووەتە ڕوو. هاوزەمان بەپێویستم زانی چەند نەخشەیەکی پێوەندار بەو بابەتانەی کە دەستم بۆ بردوون، لە کۆتاییدا هاوپێچ بکەم، چونکە گومانم نییە لەوەی کە دەیڵێم، هەر قسەو باسێکی مێژوویی کورت دەهێنێت و جاری وایش هەیە نەزۆک دەبێت، گەر بە نەخشەوە نەخرێتە بەرباس، چونکە مێژووی بێ جوگرافیا بوونی نییە، من پێشنیاز بۆ خوێنەر دەکەم بڕوانێتە ئەو نەخشانەی کە پێوەستن بە ڕووداوەکانەوە، چونکە ئەو کات بابەتەکان ڕوونتر دێنە پێش چاو.

لە کۆتاییدا سوپاسی **(جوان)**ی کوڕم دەکەم، کە نەخشەکانی بۆ ڕێکخستم و بە هیوام ئەم کتێبە، کتێبخانەی ڕۆژئاوای ئاسیا بەتایبەتی و کتێبخانەی مرۆڤایەتی بەگشتیی دەوڵەمەند بکات. خوا پشت و پەنابێت.

**ئەحمەد مەحمود ئەلخەلیل**

**٢٠٠٩/٩/٩**

## (١)

# ڕۆژئاوای ئاسیا: جوگرافیا و گەلان

### گەوهەری مێژوو

مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر دوو کۆڵەکە بنیات دەنرێت، ئەویش: مرۆڤ و شوێنە. هەر بۆیە ناتوانین کەتواربینانە و ورد لە مێژوو بگەین، ئەگەر لە پێوەندیی نێوان مرۆڤ و شوێن نەگەین. بۆ دڵنیابوون لەم بابەتەش هیچ پێویستیمان بە بەرچاوخستنی تیۆرەکان نییە و پێویستیش ناکات لە قووڵایی فەلسەفەدا خۆمان نقووم بکەین، بگرە هێندە بەسە هێڵێکی ڕاست و چەپ بەسەر مرۆڤ و ڕووداوەکاندا بهێنین و ئەو شوێن (جوگرافیا)یەش، کە ڕووداوەکانی لێ قەوماوە، ڕەش بکەینەوە و بپرسین: ئەرێ لە مێژووی مرۆڤایەتی شتێکمان بۆ ماوەتەوە؟ نەخێر، هیچ.

توێژینەوە جیۆلۆجییەکان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن، کە دێرزەمان ئەم گۆی زەوییە وەک ئێستەی نەبووە، بگرە جار لە دوای جار بە کەشوهەوایەکدا تێپەڕیوە، ئەو بارەش ناوی لێ نراوە (چاخە بەفرینەکان). کەشوهەوای بەفرین سەری هەڵداوە و پەلی کوتاوە و شوێنەکانی باکور و باشووری بەتەواوەتی تەنیوەتەوە، پاشان کەشوهەواکە خۆشی کردووە، ئیتر لە هەموو چاخە بەفرینەکاندا بوونەوەرەکان لەبەردەم دوو چارەنووسدا خۆیان بینیوەتەوە: یان خۆگونجاندن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا و بەردەوامیدان بەمانەوەو ژیانکردن، یاخۆ بە هۆی نەگونجانەوە قڕیان تێکەوتووە و

بەتەواوی فەوتاون. نموونەی ئەم نەگونجان و قڕتێکەوتنەش، بنبڕبوونی دەیناسۆر و جۆرەکانی (مامووس) شایەتی ئەو دۆخەن.
تەنیا گۆڕانی کەشوهەوا، چارەنووسی زیندەوەرەکانی دیاری نەکردووە، بگرە کارەساتە سرووشتییە لەناکاوەکانی وەک زەمینلەرزە و گڕکان و پەتا و تاعوون و بەبیابانبوون، هۆکارگەلێکی دی لەناوچوون بوونە. لەنێو بوونەوەرەکاندا تەنیا ئێمەی مرۆڤ بووین، کە لە سەردەمی چاخە بەفرینەکان و لە کاتی ڕوودانی کارەساتە سرووشتییەکاندا توانای خۆگونجاندنمان هەبووە.
ئەوە پرۆسەی کۆچە (هەڵاتن لە شوێنی تۆقێنەر و پەنابردن بۆ شوێنی ساز و گونجاو)، زۆرجار دەمانگەیەنێتە ڕۆخی ڕزگاری و ڕێی بەردەوامبوونمان لە ژیاندا بۆ خۆش و دەستەبەر دەکات.
لەژێر ڕۆشنایی ئەو بابەتانەی خستمانە بەرباس، شەرمی پێناوێت گەر دانی پێدابنێین و بڵێین: تاڕادەیەکی زۆر، لە پێداویستیی خۆراک لە پێناو مانەوەدا، مێژووی مرۆڤەکان دەست پێدەکات، لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییەش دەکرێ بۆ زۆرینەی چالاکییە شارستانییەکانی مێژووی مرۆڤەکان، ئاینەکان، فەلسەفەکان، زانست، داهێنانەکان، پێوەندییە سیاسییەکان، جەنگ و داگیرکاری و زۆر شتی دی، لێکدانەوە بکەین. خۆ ئەگەر ڕەگەزی مرۆیی نەکەوتایەتە ژێر باری قورسی پێداویستییەکانی مانەوە، ئەوا مێژوو ڕێڕەوێکی ڕێک پێچەوانەی ئەم ڕێڕەوەی ئێستەی دەگرتەبەر، ئەوە ڕاستییەکە و دەشێت تاڵ و بێزارکەر بێت، بەڵام هیچ چارمان نییە و دەبێت بە گیانێکی کەتوارییانە و زانستییەوە وەری بگرین و قبووڵی بکەین.
ئیتر یەکەمین مەرجی بەدەستهێنانی خۆراک، هەڵهاتن بوو لە شوێن (جوگرافیا)ی نالەبار و گواستنەوە بۆ جوگرافیایەکی ساز و لەبار.
هەر ئەم مەرجەشە لە ئەزەلەوە، لەپشت ململانێکانەوە بۆ بەدەستهێنانی شوێن (جوگرافیا)ی باشتر خۆی حەشارداوە. دەستپێکردنی ئەم زۆرانبازییە لەنێوان تاکەکان و کۆمەڵگەکان، خێڵەکان، میللەتەکان، دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەتەکاندا بوونی هەبووە، ئەگەر ئەم بوونەش شێوەی حەز و ئارەزووی لەخۆگرتبێ، بەڵام لە ڕێگەی جیاجیاوە ئەم حەزی زۆرانبازییە

گوازراوەتەوە بۆ کردەوە و هەرجارەش بەشێوەیەک بەڕێوە براوە، بۆیە لەژێر زەبری ئەم مەرجە سەخت و دژوارەدا پرۆسەی کۆچ و کۆچی زۆرەملێ لە مێژووی مرۆڤەکاندا ڕوویاندا.

بەهۆی ئەم پرۆسەیەوە بوو، کە گەلان لەم نیشتواتانەی خۆیاندا، کە ئێستە بوونیان هەیە، نیشتەجێبوون و لە پێناو پاراستنیدا چەک داهێنرا. سەرەتا دار و چەقۆ و بەرد، شمشێر و ڕم و تیر و تفەنگ و تۆپ و تانک تا گەیشتە بۆمبی ئەتۆم.

کەڕەتێک (ویل دیۆرانت) گوتی: **مێژوو کتێبێکە دەبێت مرۆڤ لە ناوەڕاستەوە دەستی پێ بکات**"[1].

ئەمە ڕاستییەکە و دەبێ لەتەک مێژوودا مامەڵەی پێ بکرێت، چونکە هیچ بەڵگەیەک لەبەردەستدا نییە دەسپێکی مێژووی کۆمەڵە مرۆڤێکمان بۆ دیاری بکات، ئیتر ئەم کۆمەڵە مرۆڤە، خێڵ بێت یان میللەتێک یان ڕەگەز بێت، ناچارین لە پێناو دەستنیشانکردنی سەرەتای مێژوو تەنیا پشت بە گومان و ئەگەر و دەشێت ببەستین. وا باوە و دەگوترێت، کە ڕەگەزی مرۆیی نێزیکەی یەک ملیۆن ساڵە لەسەر گۆی زەوی پەیدا بووە، ئەم ژمارەیەش لەژێر ڕووناکی پشکنینە زانستییەکاندا هەڵکشان و داکشان دەکات، دەکرێت لێرەدا ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین:

چەند لە ڕەگەزی مرۆڤەکان توانیویەتی بەردەوام بێت لە ژیانکردن و ئەو شوێنە کۆنترۆڵ بکات و بیپارێزێت، کە بۆ یەکەم جار تیادا پەیدا بووە؟

وەڵامەکەی ئەگەر نەیەژێن هیچ، ئەوا دەکرێت بڵێین: چەند ڕەگەزێکی فرە کەم. لەو زەمانەدا مرۆڤەکان لە شوێنەکانیان ناچار بەخزان و داکشان بوون و بەزیادبوونی ژمارەیان لە پانتایی جوگرافی دیاریکراودا، ئەم داکشانە شێوەی بڵاوبوونەوەی لەخۆگرتووە، هاوشان لەتەک سەرهەڵدانی ململانێ بۆ دەست بەسەرداگرتنی باشترین شوێن، ئەم خزان و بڵاوبوونەوەیە شێوەی داگیرکاری لەخۆگرتووە.

---

(١) ول ديورانت: قصة الحضارة، ص٣٩٩/٢

مێژوونووسان گەلانیان بەسەر چەند گرووپێکدا دابەش کرد و گرینگترینیان گەلانی ئاریا (هندو ـ ئەوروپی)یە و گەلانی سامی و گەلانی (حامی) و گەلانی ئۆراڵە تائییەکان و گەلانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و گەلی ئەسکیمۆ.

مێژوونووسان گوتویانە، کە گەلانی ئاریا پێکهاتوون لە ئەوروپییەکان و ئەمەریکییەکان و سلاڤەکان و ئەرمەن و فارس و کورد و هەندێکی دی.

(جیمس هنری برستد) یەژێ: زاراوەی (ئارياییەکان) بۆ لقە ڕۆژهەڵاتییەکەی گەلانی هندۆئەوروپی بەکار دەبرێت، ئەوانیش: ئەرمەن و فارس و میدی و بلۆشی و پاشتۆ و برێکی دیکە لەو گەلانەی کە لە وڵاتی ئەفغانستان و باکوری هیند جێگیر بوون، لەکاتێکدا ئەوروپییەکان و ئەمەریکییەکان سەر بە لقی ڕۆژئاوایین، واتە ئارياییەکان کوڕە مامی ئەوروپییەکانن، نەک باپیرە گەورەیان[٢].

لە زمانی سەنسکریتیدا وشەی (ئاری) بە واتای (خانەدان ـ نەجیبزادە) دێت، لەڕووی جوگرافیاشەوە، پێکهاتەی ئارییەکان بە ناوی (ئاریانا فیجا ـ فیجو) واتای (نیشتمانی ئاری) دەگەیەنێت، زۆرینەی مێژوونووسان دەڵێن، کە لانکەی گەلانی ئاریایی (هندۆ ـ ئەوروپی)یە The indo-eurpean کەوتووەتە ئۆراسیا (ناوچەکانی بەیەکگەیشتنی کیشوەری ئاسیاو ئەوروپا)، ئەو ناوچانەش ڕێک دەکاتە ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوێن. (ویل دیورانت) دەبژێت: کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان (زەند ئاڤێستا) باس لەم نیشتمانە دێرینە دەکات و بە "**بەهەشتێک لە بەهەشتەکان وەسفی دەکات**"[٣]. ڕۆژهەڵاتی ئەم نیشتمانە بە چیای تیان شان و چیای ئەڵتایی هەرێمەکانی ئیستبس، دەست پێدەکات و لە هەرد و هەڵەتەکانی مەغول جیایان دەکاتەوە.

لەهەمان کاتدا ئەم چیایانە بەربەستێکی سرووشتی نێوان دوو ژینگە و دوو شارستانییەتی جیاوازن، کە ئەوانیش: ژینگە و شارستانییەتی توران لە ڕۆژهەڵات و ژینگە و شارستانییەتی ئارییان لە ڕۆژئاواوەیە.

---

(٢) جیمس هنری برسد: انصار الحضارة، ص٢٤٥-٢٤٦.

(٣) ول ديورانت: قصة الحضارة، ٣٩٩/٢ .

له گەڕان و پشکنیندا میری ڕووسی پییر کرۆپۆتکین (Pierre Kropotkine) له دەشتاییەکان و ناوەڕاستی ئاسیادا لێرەوارێکی بەرفرەوان و وشکی دۆزییەوە و بۆی دەرکەوت، که له ماوەی سێ هەزار ساڵەی پێش زاین؛ ئەو ناوچانه به کەشوهەوایەکی تووش و سەختدا گوزەری کردووە، واته ئەم شوێنه (جوگرافیایه) هێنده دڵڕەق و تۆقێنەر خۆی نواندووە، مانەوە و ژیانکردن تێیدا ئەستەم بووە، بۆیه له پێناو مانەوە و خۆپاراستن له مەرگ و فەوتان سرووشتییه خەڵکەکه ئەو (شوێنه بکوژە) بەجێ بهێڵن و بۆ (شوێنی شیاو) بگوازنەوە. بۆیه برێک له ئارییەکان بەرەو باشوور به ئاراستەی نیمچه کیشوەری هیندی ڕەویان کرد و بەشێکی دیکەیان بەرەو ڕۆژئاوای ئاسیا ملیان نا، گرووپی سێیەمیان بەرەو باکور و ڕۆژئاوا کۆچیان کرد.

ئاشکرایه هەڵکەوتەی زاڵی جوگرافیای ئارییەکان (هندۆ ـ ئەورووپی) دوند و چیا بووە و تخووبی شوێنه بەرزاییەکانیش دەشت و دەری لەخۆ گرتووە، دەشت و دەرێکی بەپیت و بەرەکەت و دەوڵەمەند بەسەرچاوەی ئاودێری و لەوەڕگەی زۆروزەوەند، که بۆته سەرچاوەی ئابوورییەکی پشت بەستوو به بەروبوومی شیرەمەنی و دانەوێڵە، بۆیه دەکرێت شارستانییەتی وڵاتی ئارییەکان به (شارستانییەتی ئاژەڵ) ناوزەد بکرێت[٤].

له پەسنی لانکەی ئارییەکاندا، بنگارد لیڤین دەبێژێت: **"بەپێی (بێژەی)ی هندۆئەورووپییه دێرینەکان، که زمانناسان چاکسازییان تێدا کردووە، ئیکۆلۆجیای وڵاتی باوباپیری هندۆ ـ ئەورووپییەکان وێنەی بۆ کێشرا، ڕەسمی تایبەت به هەڵکەوته و کەشوهەوا و جیهانی گیا و گوڵ و ئاژەڵی تیادا بەرچاو دەکەوێت. دەرهاویشتەی زانستی زمان تایبەت به ژینگەی ئیکۆلۆژی سەبارەت به نیشتمانی باپیرانی هندۆئەورووپییەکان، ئەم نیشتمانه وڵاتی هەڵکەوتەی چیایی و تۆڕێکی دەوڵەمەند به ڕووبار و کەشوهەوایەکی لەبار و تێکچڕژاوی گیا و گوڵ و درەختی سەرسوڕهێنەرە، که هەردەم لەگەڵ ناوچه باشوورییه فێنکەکاندا دەست لەملانییه"**[٥].

---

(٤) رالف لنتون: شجرة الحضارة، ١٦٢/٢.

(٥) بونغارد – ليفين: الجديد حول الشرق القديم، ص٢٧٣ .

بۆنگارد درێژەی پێ دەدات و دەبێژێت: **"هەڵکەوتەی چیایی نیشتمانی باوباپیرانی هندۆئەورووپییەکان ڕاستییەکە چەند لێکۆڵەرێک جەختیان لەسەر کردووەتەوە، پاش دەرکەوتنی لێکۆڵینەوەکانی گامکری لیدزە و ئیڤانۆف، ئیتر جەختکردنی لێکۆڵەرەکانی دی لەسەر ڕاستی ئەو بابەتە هیچ گومانێک هەڵناگرێ، ئەو لیستە، کە بۆ (بێژەی)ی هندۆئەورووپییە دێرینەکان ڕێکیخستن، ئەو بڕوایەمان لا پتەو دەکات، کە هندۆئەورووپییەکان نیشتەجێی ناوچەگەلێکی چیایی یان دوند (لوتکە چیا)، گابەرد، بەردەڵان، (چیا و دەشت) (بەرزایی) (داربەڕوو) (بەڕووی چیایی) (بای باکوری چیایی)"**.[٦]

بەڵام هەردەو هەڵەتی پانوبەرینی مەغۆلەکان، کە پتر وشک و برینگ بوو، نموونەی بیابانی جوبی (Gobi)، کە سەرباری نالەبارییەکەی، لە هەمانکاتدا هێندە لەوەڕگەی لەخۆگرتبوو بەشی بەخێوکردنی مەڕومالآت و وشتر و وڵاخی بەرزە (هەسپ و ماین) بکات. جا چونکە (هەسپ و ماین) گرینگترین ئاژەڵ بوو، ئابووری ناوچەکە پشتی پێ قایم کردبوو.

بۆیە دەتوانین ئەو شارستانییەتە بە (شارستانییەتی وڵاخی بەرزە) ناوزەد بکەین و دەبینین هەمیشە ململانێ و ناکۆکی لەنێوان خێڵە ئارياييەکان و خێڵە تۆرانییە (مەغۆل)ـەکاندا سەری هەڵدەدا، لە ئەنجامدا وا دەردەکەوێت، ئارییەکان لە تۆرانییەکانەوە فێری چۆنێتی بەکاربردنی وڵاخی بەرزە لە سوراچاکی و شەڕدا بووبن.[٧]

### تایبەتمەندییەکانی شارستانییەتی ئاریایی

(ویل دیورانت) بەدرێژی قسەی لەبارەی ئەو ئاریاییانە کردووە، کە بەرەو باکوری هیند کۆچیان کردووە. ئەوەی ئەو لەمەڕ ئارییەکانەوە باسی کردووە، بەگشتیی بارودۆخی ئارییەکانمان لا ڕۆشن دەکاتەوە. ئەو دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "ئەوان (ئاریاییەکان) لەشولارێکی پتەو و بەهێز و ئارەزوویەکی بەهێزتری

---

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٧) رالف لنتون: شجرة الحضارة، ١٦٢/٢. هـ ، ج .ولز: معالم تأريخ الانسانية ،٢٠٩/٢.

خواردن و خواردنەوەیان هەبووە، ئەوان توانا و بوێرییەکی بێ وێنەیان هەبووە لە جەنگدا و بە ڕم و تیروکەوان شەڕیان کردووە و لە شەڕەکاندا جەنگاوەری قەڵغانپۆش و گالیسکەسوار پێشەنگییان دەکردن، ئەم جەنگاوەرە پێشەنگانە، کە لە دوژمن نێزیک دەبوونەوە تەوریان وەک چەک بەکار دەهێنا و دووراودووریش ڕمیان دەگرتە دوژمن، ئارياييەكان بە ڕەوشتێکی سەرەتایی وا ناسرابوون، کە هەرگیز ڕێی بە دووڕوویی نەدەدا".

(ویل دیورانت) جارێکی دیکە باس لە ئارياييەكان دەکات و دەڵێت: "ئارياييەكان، کە هێرشیان کردە سەر باکوری هیند و داگیریان کرد، ئیتر دەسبەرداری شەڕ و کوشتار دەبن و کشتوکاڵ دەبێتە پیشەی سەرەکییان، دواتر خێڵەکانیان وردە وردە پێ بەپێ دەوڵەتۆکەی خۆیان دامەزراند و پادشایەکی وابەستە بە کۆتوبەندی ئەنجومەنێک لە جەنگاوەران حوکمی دەکرد و هەر خێڵێک لەو خێڵانە (ڕاجا)یەک، یان سەرکردەیەک کە دەسەڵاتەکانی لەلایەن ئەنجومەنێکی خێڵەکییەوە دەستنیشان دەکرا، سەرکردایەتیی ئەو خێڵەی دەکرد و هەر خێڵێک لە چەند گرووپێکی لادێی سەربەخۆ لە خێڵەکانی دی پێک دەهات و نیمچە سەربەخۆییەکیان پێ دەدرا. ئیتر هەر کۆمەڵە دێهاتییەک، ئەنجومەنێکی پێکهاتوو لە سەرەک خێزانەکان حوکمی دەکرد.

دەگێڕنەوە، کەڕەتێک (بودا) بەهاوەڵە فرە نێزیکەکەی خۆی (ئەناندا)ی گوتووە: "**ئەرێ ئەناندا تۆ بیستووتە، کە بەر لە یەکلاییکردنەوەی شتێک (فاجییەکان) بۆ ڕاوێژکردن کۆدەبنەوە و لە هەر کۆبوونەوەیەکی گشتیی خێڵەکانیاندا بەشداری دەکەن؟ ئەی ئەناندا، مادام فاجییەکان ئا بەو شێوەیە کۆ دەبنەوە و بەشداری ئەو کۆبوونەوە گشتییانە دەکەن، کە خێڵەکانیان سازی دەکەن، چاوەڕوانی لێک هەڵوەشاندنەوەیان لێ ناکرێت، بگرە سەرکەوتنیان بەردەکەێت**"[8].

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لای ئارييەكان (هندۆ ئەورووپییەکان) لەسەر سێ ئاستی جیاواز دەناسرێن و جیا دەکرێنەوە، کە ئەمانەی لای خوارەوەن: کاهینەکان، جەنگاوەرەکان، بەرهەمهێن (شوانکارە). هەروەها وەک هەموو

---

(٨) ول دیورانت: قصة الحضارة، ٢١/٣.

کۆمەڵگە دێرینەکان، سیستەمە کۆمەڵایەتییەکەیان خێڵەکی سرووشت بووە، لەم ڕووەوە (ڕالف لنتون) لەبارەی ڕژێمی خێڵەکی ئارایییەکان دەڵێت: "**بەڵام سەرۆک خێڵی ئارییەکان دەوڵەمەندترین و گرینگترین سەرەک خێزانی خێڵ بوو و ماڵەکەیشی لە شێوەی ماڵی هەر سەرۆک خێزانێک وابوو، بەڵام گەورەتر و ژمارەیەکی زۆرتر لە کەسە خۆبەخشەکانی دەگرتەخۆ، کە زۆرینەی ئەو کەسانە لە کەسوکارە دوورەکانی سەرۆک خێڵ بوون، بەڵام زۆریی ژمارەی کەسەکانی دەوروبەری گرینگیی تایبەتی خۆی هەبوو**"[9]

(دکتۆر فلیپ حتی)و هاوڕێکانی، باسیان لە ماڵیکردنی وڵاخی بەرزە کردووە و دەڵێن: "**شانازیی ماڵیکردنی ئەسپ و ماین بۆ ئارییەکان دەگەڕێتەوە، لە زەمانی زوودا برێک لە شوانکارەی هۆزە هندۆئەورووپییەکان لە زەوییەکانی ڕۆژهەڵاتی قەزوین گەرمیان و کوێستانیان دەکردو ئەوان یەکەم کەس بوون، کە وڵاخی بەرزەیان ماڵی کرد، پاشان کاششییەکان و حیسبییەکان بەشێوەیەکی بەربڵاو هاوردەیان کرد، ئەم ئاژەڵە لە ڕێگەی ئەوانەوە بەر لە دوو هەزار ساڵ پێش زاین، بۆ ئاسیای ڕۆژئاوا گوازرایەوەو بەر لە چەرخی زاینی لە ڕێگەی سوریاوە گەیشتە نیمچە دورگەی عارەبی و هەکسووس(شوانەکان) ئەسپیان لە سوریاوە بۆ میسر گواستەوەو لیبییەکانیش لە ئاسیای بچووکەوە گواستیانەوە بۆ وڵاتی یۆنان**"[10]

بەڵام مێژووناس (خ. هـ . ج. ولز) لەم بارەوە بۆچوونێکی دیکەی هەیە، ئەو دەڵێت: "**مەغۆلەکانی چەرخی نوێی بەردین، گەلێکی شەڕوانی ئەسپسوار بوون، لەکاتێکدا ئارییەکانی چەرخی نوێی بەردین مانگایان بەکار دەبرد**"[11].

ئەمەش واتای وایە، کە گەلانی تورانی لەناویاندا مەغۆلەکان پێشەنگی ماڵیکردنی وڵاخی بەرزە بوونە، بۆیە هاوسێیەتی و ململانێی نێوان ئارییاییەکان و تۆرانییەکان ڕۆڵی خۆی بینیوە و ئارییاییەکان لە بەخێوکردنی وڵاخی بەرزەدا چاویان لە تورانییەکان بڕیوە، کە بە ئەورووپا و ڕۆژئاوای

---

(٩) رالف لنتون: شجرة الحضارة، ل ١٥٤. بڕوانە: صمويل نوح كريمر: أساطير العالم القديم، ص٣٠٤.

(١٠) فيليب حتي و اخرون: تاريخ العرب، ص٤٧ – ٤٨

(١١) هـ . ج .ولز: معالم تأريخ الانسانية، ص٢/٣١١.

ئاسیادا بڵاوبوونەتەوە، لەگەڵ خۆیاندا ئەسپ و ماینیان بۆ ئەو وڵاتانە گواستوەتەوە، کە لێی نیشتەجێ بوون و لە شەڕەکاندا بەکاریان هێناوە.

لە جوگرافیای پێکهاتن (ئاریانا فیجۆ) زمانی هاوبەشی ئاریاییەکان سەری هەڵداوە و لە ساڵی (١٨٠٠ پ - ز) مۆرکی هیندۆئێرانی ئەم زمانە بەدەردەکەوێت. سەرەڕای هەندێ ناوی ناسراو لە ئەنادۆڵ، ئەم مۆرکە کاشییە شۆریاش (سوریاسی هیندی) کە واتای (خۆر) دەگەیەنێت لەتەک چەندان وشەی هاوبەشدا بەدی دەکرێت. پاش چوار سەدە (دەوروبەری ١٤٠٠ پ - ز) ناوی خواوەندی میترا، ڤارۆنا، ئۆیندراو ناسایتا دەردەکەون[١٢].

ساڵی (١٧٨٦ز) مافپەروەرو ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (جۆنس)، لە ڕاپۆرتێکدا، کە لە کۆمەڵەی ئاسیایی لە کەلکەتای هیندی خوێندییەوە، هێما بۆ پێوەندیی نێوان سەنسکریتی و یۆنانی و لاتینی و سلتی و گوتی و فارسی کۆن دەکات. هەروەها پەنجە دەخاتە سەر ئەو گونجانە ڕێکوپێکە زەوەندە زمانەوانییە، سەرەڕای لێکچوون لەنێوان ڕەگ و نەژادەکان، لێکچوونی شێوە زمانەوانییەکە بەبێ هیچ گومانێک ئەوەمان لا ساغ دەکاتەوە، کە ئەم زواتانە دەچنەوە سەر یەک چاوگی هاوبەش، کە دەشێت لەم سەردەمەدا بوونی نەبێت.[١٣]

لە جوگرافیای پێکهاتوو بیروباوەڕی گەلانی ئاریایی بە شێوە ڕەنگاوڕەنگەکانی میتۆلۆجیا سەری هەڵدا، گەر لە دیاردە زەقەکانی ئاینی ئاریایی وردبینەوە، ئەوا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە لەم ئاینەدا هیچ خواوەندێک لە شێوەی ئاژەڵ و شەیتان بەرجەستە نەبووە. لە وڵاتی فارسی کۆندا، ئەوان وێنای زیندەوەری وەک (گیانی گا) (OX Spirit) بە نائاژەڵانی) پۆلێنیان دەکرد. گەلانی ئاریایی ئەو دەم مردووەکانیان دەسووتاند، ئەو کردارەش نەریتێک بوو، تا ئێستەش لە وڵاتی هیند پێڕەو دەکرێت، بەڵام باوباپیرانی ئارییەکان

---

(١٢) صمويل نوح كريمر: اساطير ألعالم ألقديم، ص٢٩٣.

(١٣) بونغارد – ليفين: الجديد حول الشرق القديم، ص٢٥٠.

گۆڕی لاکێشەییان هەڵدەکەند و مردووەکانیان لەسەر ڕوو و  لە شێوەی کەسێکی دانیشتوو دەناشت.[١٤]

ئەوان باوەڕیان وابوو، کە بە سووتاندنی جەستەی مردووەکانیان، ئەو پێوەندییەی کە مردوو دەبەستێتەوە بە زەوییەوە یەکجارەکی وردوخاش دەبێت و ئەم ڕەفتارەش ڕێ لە گەڕانەوەی مۆتەکە دەگرێت، ئەم کردارەشیان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە ئارياييەكان باوباپیرانیان نەپەرستووە. وا دەردەکەوێت، کە ئارياييەكان باوەڕیان بە (قەزا و قەدەر) هەبووبێت و شتێکی نابەرجەستەی وایان لێ بەدی کردبێت، کە باڵ بەسەر گشت خواوەندو مرۆڤدا دەکێشێت و نە نوێژبۆکردن و نەقوربانیدان و نە تەلیسم، کاری تێ ناکات. ئەمە و زۆرێک لە بیروباوەڕی ئارییەکان لە ئاینی زەردەشتیدا بوونی هەیە.[١٥]

---

(١٤) رالف لنتون: شجرة الحضارة، ص١٥٨.

(١٥) هـ . ج . ولز: معالم الانسانية، ٢١٣/٢. رالف لنتون : شجرة الحضارة، ص١٥٨.

(٢)

## کێبڕکێی ئاری - سامی

لە سەردەمی ڕاووشکار و ئاژەڵداریدا، دەشت و دۆڵ و دوند و چیا، لەبارترین شوێن بوو بۆ ژیانکردن. لەپاڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان، مرۆڤ فێری کۆکردنەوەی دانەوێڵە و چاندنی بوو، ئەم هەنگاوە گرینگەش کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە قۆناخی ڕاووشکارەوە گواستەوە بۆ قۆناخی کشتوکاڵی، لەو دەمەوە شوێنە دەشتاییەکان و گۆم و ڕووبارەکان بوون بە باشترین و بەکەڵکترین هاوڕێی مرۆڤ، هەربۆیە دەشتاییەکانی باشووری وڵاتی میسۆپۆتامیا (باشووری عێراقی ئێستە)، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاوتخوبی زنجیرە چیای زاگرۆسە[١٦] و لە ڕۆژئاوا و باشووریشەوە هاوشانی وڵاتانی عارەبە. ئەم وڵاتە دەبێتە ئەو شوێنەی کە سەرنجی گەلانی چیا و بیابانانشینەکانی دراوسێی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا.

سۆمەرییەکان دێرینترین و ڕەسەنترین گەلی چیانشینن، کە لە ناوچەی ڕۆژئاوای ئاسیادا شوێن پەنجەیان بەجێ ماوە. ئەم گەلە زاگرۆسنشینە، لەژێر

---

(١٦) زنجیرە چیایەکی گەورە و درێژە، کەوتۆتە ڕۆژئاوای ئاسیاوە و لە چیای ئاراراتی باکوری ڕۆژئاوای (نێوان ئێران و ئەرمەنستان و تورکیا)وە تا نێزیک کەنداوی فارس لە باشووری ڕۆژئاوای (ناو ئێران) درێژ دەبێتەوە، ئەم زنجیرە چیایە لەتەک زنجیرە چیای تۆرۆس، بڕبڕە پشتی نیشتمانی کوردان پێک دەهێنن.

زەبری هۆزێکی ئارییاییەکاندا بووبێت، یاخۆ گەڕان بێت بە دوای خۆراکدا، لە چیاکان هەڵکەندران و لە دەشتە بەراوییە بە پیتەکەی نێوان دۆڵی ڕووبار نیشتەجێ بوون. ئەم کۆچ و نیشتەجێبوونەی سۆمەرییەکان بە (٣٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زاین[١٧] و دەشێ زیاتریش ڕووی دابێت.

مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بە هیچ کلۆجێ، سۆمەرییەکان سامی نەژاد نەبوون و ڕاستتر وایە بە ئاری نەژاد هەژمار بکرێن و دەشێت لە ڕووی ئەتنیکییەوە پێوەندییان بە کوردەوە هەبێت، چونکە ئەوان بەگشتیی وابەستەبوونیان بۆ عێراقی ئاریی هەبووە و بەسەر پانتاییەکی جوگرافییەوە ژیاون و لەڕووی زمانیشەوە جۆرە هاوشێوەیەک لەبرێ بێژە و دارشتندا لەنێوان زمانەکانیاندا بەدی دەکرێت، جا ئەم هاوشێوەییە چ لە بواری میتۆلۆجییەوە بێت یان لە بواری ژیانی ئاسایی بێت. بەهەرحاڵ، تەنیا لێکۆڵینەوەی وردودرشت لە ئایندەدا ئەم بابەتە یەکلا دەکاتەوە.

لە باشووری ڕۆژئاوای وڵاتی میسۆپۆتامیادا، لەو دەشتە پانوپۆڕەی نیمچە دوورگەیەدا، کە پاشان بە ناوی نیمچەی دوورگەی عارەب ناسرا، خێڵە سامییە کۆچەرییەکان بە دوای لەوەڕگە و ئاودا وێڵ بوون، لەو ساڵانەدا، کە ڕێژەی بارانبارین لە ئاستێکی باشدا دەبوو، گیا و گوڵ و پنچک، لەپاڵ کانیاو و گۆماوەکاندا ڕووی زەوییە پان و بەرینەکەی دادەپۆشی و کۆچەرییەکان بە ئاسانی ئاژەڵ و ماڵاتی خۆیان تێدا دەلەوەڕاند و بەزیادیشەوە بەشی دەکردن و پاراو دەبوون، بەڵام وردە وردە ساڵ دوای ساڵ لەپاڵ هەڵکشانی ژمارەی خێڵ و هۆزە کۆچەرییەکان، ڕێژەی بارانبارینیش دای لە کزی، بێگومان وشکەساڵی دەبێتە هۆی نەمانی لەوەڕگەی پێویست و وشککردنی کانیاوەکان، بۆیە ئەو پانتاییە زەوییە، کە لە ساڵانی ڕابردوودا گەدەی کۆچەریانی تێر دەکرد، لە کورتی دەدات و دەبێتە (جوگرافیای برسێتی). ئاشکرایشە، کە لە مێژوودا برسێتی و نەمانی ئاسایش، دوو هاوڕێی ڕێگەی دوور و درێژبوونە، لەپاڵ بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان و کەمی سەرچاوەی بژێوی، ئەم دوو هاوڕێ دێرینە، کە (برسێتی و نائاسایشییە) لە نیمچە دوورگەی عارەب

---

(١٧) چەرخی دەوڵەت – شاری سۆمەرییەکان دەکەوێتە نێوان ساڵانی (٢٨٠٠-٢٣٧٠ پ.ز).

پەیدابوون. بۆیە لەو دەمەدا ئاسایی بووە، کە برێ لە خێڵە سامییەکان ڕوو بکەنە شوێنە بەپیتەکان (جوگرافیای تێربوون). ئەو جوگرافیایەی کە هاوسێی وڵاتی خۆیانە، واتە وڵاتی دوو ڕووبار، لەم کۆچڕەوەدا، ئەکەدییەکان بوون بە پێشەنگی خێڵە سامییەکان و خزان. ئەم ڕەوکردنە دەوروبەری (٢٥٠٠ پ ـ ز) ڕوو دەدات، سەرەتا خێڵە ئەکەدییەکان لە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات نیشتەجێ بوون، ئەو شوێنەی دەکەوێتە تەنیشت شارەکانی ئەریدۆ، نیپوور، ئوورو هەندێ شاری تری سەر بە دەوڵەتی سۆمەرییەکان.

بۆ ڕێکخستنەوەی خۆیان، ئەکەدییەکان چاویان لە سۆمەرییەکان بڕی و لە ڕژێمی خێڵەکییەوە گواستیانەوە بۆ ڕژێمی دەوڵەت و پاشان لەژێر دەستی (سەرگۆن)دا یەکیان گرت و زۆرانبازییان دژی شارەکانی دەوڵەتی سۆمەرییەکان دەست پێ کرد و داگیریان کرد. مێژووی دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی ئەکەدی لە وڵاتی دوو ڕوبار دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی نێوان (٢٣٧٠ – ٢٢٣٠پ ـ ز) و لەوێشەوە ئەم دەوڵەتە پەلی کێشا بۆ ئیلام[١٨].

ئا لێرەوە گەلانی ئاریایی لە چیای زاگرۆس و دەوروبەری قوت دەبنەوە، ئەم جارە گەلی گۆتی (غوتی ـ جودی) پێشەنگە و بۆ ماوەی نێزیکەی سەدەیەک لە (٢٢٣٠ – ٢١٢٠پ ـ ز) و دەشگێڕنەوە گوایە بۆ ماوەی (٩١) ساڵ دەست بەسەر سۆمەر و ئەکەددا دەگرن، پاشان لەژێر زەبر و پاڵەپەستۆی سۆمەرییەکان و ئەکەدییە نوێیەکاندا و بەسەرکردایەتیی سەرکردەی سۆمەر و ئەکەد ئورنەمۆ (Ur Nammu) گوتییەکان بەرەو چیاکان پاشەکشە دەکەن.

شایەنی باسە (ئور- نەمۆ) سەرکردەی سۆمەرییەکان بە دامەزرێنەری وەچەی ئوری سێیەم (٢١١٢ – ٢٠٠٤پ ـ ز) دەژمێردرێت.[١٩]

کۆچی برێ لە لقە ئارياييەکان، یەک بەدوایەکدا دێت و لە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای بەرزاییەکان (تەپۆلکەی) ئاریان و بەتایبەتی لە چیای

---

(١٨) رينيه لابات و اخرون: سلسلة الاساطير السورية، ص١٤.

(١٩) سبتيون موسكاتي: الحضارة السامية القديمة، ص٩٦. وليام لانجر: موسوعة تأريخ العالم، ٥/١. دياكونوف: ميديا، ص١١٠، ١١٧– ١١٨

زاگرۆس و دەوروبەریدا دای دەکوتن. هەواڵی دەرکەوتنی ئارياييەکان جارجار لە سەردەمە يەک لەدوايەکەکاندا دەبيستريێت، ئەم دەرکەوتنەش پێوەستە بە قۆناخێکی مێژووييەوە، کە لقێک لە لقەکانی ئاريانەکان، لە ڕووی سياسييەوە ناوی دەدرەوشێتەوەو لە نووسراوە سۆمەری و ئەکادی و بابلی و ئاشووری و حتيی و ميسرييەکاندا بەرچاو دەکەوێت.

سەدە لە دوای سەدە لە باکور و باشوور و ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و لە ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆدا، لقە ئارييەکان تێکەڵ بەيەک دەبن، پاشان لە ڕووی سياسی و شارستانييەوە يەک دەگرن و لەژێر ئاڵای باڵادەستترين لقدا دەوڵەتی بەهێزی خۆيان دادەمەزرێنن.

لێرەدا دەتوانين دەستنيشانی لقە بەهێزەکانی ئارياييەکان بکەين، کە پێک دێن لە: لۆلۆ- گوتی، کاشۆ (کاسيت) ميتانی (Mittani) (حووری)[٢٠]و سووباريی خەلديی (ئوورارتۆ/ نايری).

کاتێ ساميیەکان دەستيان بەسەر وڵاتی ڕافيدەيندا گرت، لە (٢٠٠٠- ١٥٩٥ پ.ز) چەرخی بابلی کۆن دەستی پێ کرد و لە نێزيک ڕووباری فورات (باکوری سۆمەر و ئەکاد) شاری بابليان بە پايتەخت هەڵبژارد و وەک هەميشە بابلييەکان پەليان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئيلام و گۆتيۆم کوتا و دەستيان بەسەردا گرت. لەو کاتەدا کاشييەکان (کاسيی- کاسيت) لە چيا دادەبەزن و هێرش دەکەنە سەر بابل و داگيری دەکەن، لەوانەيە سەردەمی پادشا ئاکۆمی گەورەی کاشييەکان (١٧٢٥-١٧٠٤ پ.ز) ئەو داگيرکارييە ڕووی دابێت، تا ساڵی (١١٦٠ پ. ز)، واتە نێزيکەی يەک سەدە کاشييەکان حوکمی وڵاتی بابليان کرد، تا ئاشوورييەکان وەدەريان نان و جێگەيان گرتنەوە.[٢١]

ئاشوورييەکان لە کۆتايی سەدەی (١٩پ.ز) و سەرەتای سەدەی (١٨پ.ز ) بوونە هێزێکی هەرێمی. ئاشکرايە، کە ئاشوورييەکان گەلێکی سامی نەژادن و لە ڕۆژئاواوە (سوريا)وە ڕوويان کردووەتە وڵاتی دوو ڕووبار. ئەمە و

---

(٢٠) جرنوت فيلهلم: دەڵێت: مەملەکەتی مەزنی حووری، کە لە چەرخی (١٦ پ.ز) دامەزراوە، بەناوی مەملەکەتی ميتانی ناونراوە" پاشان بێژەکە بۆ (ميتانی) گۆڕا. جرنوت ميلهلم: الحوريون، ص٤٨.

(٢١) دياکونوف: ميديا، ص١٢٧. سبتينو مسکاتي: الحضارات السامية القديمة، ص٦٨.

لێکۆڵەر هەیە ئاشوورییەکان بە ئاری نەژاد و سامی زوبان و فەرهەنگ لەقەڵەم دەدات. هەرچۆنێک بێت ئاشوورییەکان دەستی پۆلاینی خۆیان بەسەر ڕۆژئاوای ئاسیادا کێشا و لە باکور و ڕۆژهەڵاتەوە هەر لە دەریای قەزوینەوە تا دەگاتە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، لە باشوور و ڕۆژئاواوە خستە بندەستی خۆیانەوە و بەوپەڕی دڵڕەقییەکی ناسرووشتییەوە گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیایان چەوساندەوە و ماندوویان کردن، پاشان لە چەرخی (١٥پ.ز) بەشێوەیەکی بەرچاو بێ هێز و لاواز بوون.

لەو کاتەدا ئارییە نوێیەکان، میتانییەکان (حوورییەکان) دژیان وەستانەوە و بوون بە یەکێک لە هێزە گەورەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا و ڕکابەری حیتییەکان لە ئاسیای بچووک و میسرییەکان لە سوریا.

ململانێ بەردەوامەکانی نێوان حیتییەکان و میتانییەکان بوو بەهۆی لاوازبوونی دەسەڵاتی میتانییەکان، بۆیە ئاشوورییەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە و هێزی خۆیان کۆکردەوە و لەساڵی (١٣٦٠ پ.ز) تا ساڵی (٦١٢پ.ز)[٢٢] دەستیان گرت بەسەر ڕۆژئاوای ئاسیادا و دەسەڵاتی میتانییەکانیان لەناوبرد و دەستیان دایە پەلاماردانی گەلانی ناوچەکە و کوشتوبڕێکی بێ بەزەییانەیان ئەنجام دا، بەتایبەتی بەرانبەر بە باوباپیرانی کورد لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی میسۆپۆتامیا و باکوری ئەو وڵاتە، چونکە ئاشوورییەکان، ئەو گەلەی کە لە چیا سەختەکاندا خۆیان قایم کردبوو، بە سەرچاوەی سەرئێشە و ئاژاوە بۆ سەر دەسەڵاتی ئاشووریان لە قەڵەم دەدا، نەک هەر ئەوە، بگرە زۆرجار دەستیان دەدایە شۆڕش و دەبوون بە هەڕەشە بۆ سەر دەسەڵات و قەڵەمڕەوی ئاشوورییەکان.

---

(٢٢) سبیتینو مسکاتی: الحضارة السامیه القدیمة، ص٦٩- ٧٠.

## (٣)

# پێکهاتەی میدی لە ڕووی جوگرافیا و ئەتنۆلۆژیاوە

## پێکهاتەی جوگرافی

بەبێ جوگرافیا مێژوو بوونی نییە. زیادەڕۆیی نییە گەر بگوترێ، گەورەترین فاکتەر لە دروستکردنی مێژوودا، جوگرافیایە.

بەرایی گوتمان، کە ناوچە تەختاییەکانی تخووبی چیای زاگرۆس لە ڕۆژهەڵاتەوە، وڵاتی عارەب لە ڕۆژئاواوە مەیدانی کێبەرکێی نێوان گەلانی ئاریایی و گەلانی سامی بووە˚ لەهەمان کاتدا گۆڕەپانی ململانێ ناوەخۆییەکانی نێوان لقە جیاجیاکانی هەرتک ڕەگەز بووە. لە ناوەڕاستی سەدەی (٨ پ.ز) دوو هێزی ڕکابەر بەدەر دەکەون. هێزی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری سامی فەرهەنگ و زاڵ و هێزی تازەپێگەیشتووی میدیی خاوەن فەرهەنگی ئاریایی.

ئامادەیی میدییەکان، گرێدراو بوو بە گەورەترین دوو زنجیرە چیای ڕۆژئاوای ئاسیا:

**یەکەمیان زنجیرە چیای زاگرۆس**: ئەم زنجیرە چیایە لە سنووری کەنداوی فارس لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە درێژ دەبێتەوە بەرەو باکوری ڕۆژئاوا، لەناو ئەم زنجیرە چیایەدا، لە بەشی ناوەڕاستیدا، لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتی پێش زاین، میدیای ناوەندی لە دایک بوو و سەری هەڵدا.

**دووەمیان زنجیرە چیای تۆرۆس**: لە ڕۆژئاواوە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کەنداوی ئەسکەندەرۆنەوە درێژ دەبێتەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، لەگەڵ بەشی باکوری زنجیرە چیای زاگرۆس و نێزیک دەریاچەی (وان) بە یەک دەگەن. لە

یەکگرتنەوەی ئەم دوو زنجیرە چیایەدا، لە باکور و سەرسنووری قەوقازیا چیای ئارارات پێک دەهێنن، ئەو دەمە چیای تۆرۆس گەورەترین بەشی لە جوگرافیای باکوری میدیای گەورەی پێک دەهێنا.

گەر بڕوانینە جوگرافیای نیشتمانی کورد (کوردستان)ی ئەمڕۆ بۆمان دەردەکەوێت، کە کورد لە دەوروبەرو لەنێوان ئەم دوو زنجیرە چیایە (زاگرۆس و تۆرۆس) چڕ دەبێتەوە، ئا لێرەوە وتەکەی (باسیلی نیکیتن) سەرچاوە دەگرێت، کە دەڵێت: "**کوردو چیا لێک جودا ناکرێنەوە**".[23]

ئەم ڕاستییە پێمان دەڵێت: کورد لە سەر هەمان ئەو جێگەیە (جوگرافیا) دەژێت، کە باوباپیرە میدییەکانی لەسەری ژیاون و لە سێبەری مەملەکەتی ماددا دوا پێکهاتەی سەری هەڵدا.

جێگەی ئاماژە بۆ کردنە، کە لەم جوگرافیایەدا یەکێک لە کۆنترین شارستانییەتی ڕۆژئاوای ئاسیا لەدایک بوو، ئەویش شارستانییەتی (حەلەف ـ Halaf) بوو. مێژووی ئەم شارستانییەتە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان سالانی (٦٠٠٠ ـ ٥٠٠٠)سال پێش زاین.[24]

(جیمس میلارت) دەبیژێت: "**ئەم شارستانییەتە لە شێوەی کەوانە، لە ڕووباری فوراتەوە بە ئاراستەی زێی گەورە پەلی کوتاوە و سنووری باشووری زۆر بەوردی دەستنیشان کراوە، ئەگەری ئەوە هەیە، کە زنجیرە چیای تۆرۆس سنووری باکوری بووبێت و لێرەو لەوێ بە پێچ و پەناگەلێک لە بەرزاییەکانی ئەنادۆڵ و لە باکوری ئەم چیایە پەلوپۆی کوتابێ**".[25]

(جێمس میلارت) لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت: "**بەشێوەیەکی تایبەتی شارستانییەتی (حەلەف) بە یەکێک لە شارستانییەتە چالاکەکان دەژمێردرێت، گریمانەی ئەوە هەیە، کە دامەزرێنەرانی ئەم شارستانییەتە لە تازە**

---

(٢٣) باسیلی نیکیتن: الکرد، ص٨٨.

(٢٤) Mehrdad Izady :The Kurds ,P 25 – 26

(٢٥) جیمس میلارت: اقدم الحضارات في الشرق الادنی، ص١٥٧.

**کۆچەرییەکانی ناوچەکانی باکور بن و ئەگەری ئەوەش هەیە، کە ناوچەی میسۆپۆتامیای تورکی، نیشتمانی ئەم شارستانییەتە بووبێت.**[26]

ئەگەر لە جوگرافیای ئەو ناوچەیە، کە شارستانییەتی حەلەفی لەسەر دامەزراوە بڕوانرێت، بێگومان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو شوێنە ـ دەکەوێتە چەقی نیشتمانی مادەکان (کوردستانی ئەمڕۆ)، ئەم ڕاستییەش پێمان دەڵێت: نیشتمانی میدییەکان یەکەم دەڤەرە لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئاسیادا کۆمەڵگەی بەشەرییەتی لەسەر بونیات نراوە. دەنگدانەوەی ئەم ڕاستیەشمان بە ڕۆشنی لە (تەورات)دا دێتە بەر گوێ، کە هێما بۆ بەهەشتی عەدەن دەکات، کە سەرچاوەی ڕووباری دیجلەو فوراتی لێوە هەڵدەقوڵێت.

قورئانیش هێما بۆ چیاکانی جودی دەکات، ئەو چیایە، کە ناوەندی سەرهەڵدانی ئاوەدانیی ومرۆڤایەتیی بووە پاش لافاوی نوح. بۆ دڵنیابوون من لێرەدا لە خوێنەری بەڕێز دەخوازم بڕوانێتە نەخشەی (شارستانییەتی حەلەف)، کە لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا خراوەتە بەرچاو.

(هارڤی پۆرتەر) لەژێر ناونیشانی (سنووری مادەکان و تایبەتییە سرووشتییەکەی) دەڵێت: "**ڕۆژهەڵاتی ئاشوور و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەم وڵاتە، کە دەکاتە بەشی باکور و ڕۆژئاوای مەملەکەتی ئێرانی ئەمڕۆ، سنووری باکوری وڵاتی ئەرمەنستان و دەریای خەزەر و چیای زاگرۆسیش دەکەوێتە سنووری ڕۆژئاوای و باشوورییشی نیشتمانی فارسە، سنووری ڕۆژهەڵاتیشی دەستنیشان نەکراوە، چونکە باکوری زەوییەکی شۆرەکات و چۆڵ بووە و کەسی لێ نیشتەجێ نەبووە، زۆرترین و باشترین زەوی مادەکان چیایی بووە، لقەکانی زاگرۆس لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو بیابان درێژ دەبنەوە، زنجیرە چیایەک لە ڕۆخی دەریای خەزەرەوە، کە بە ئەلبورز (ئەلبرج) ناسراوە، لە باشووری ڕۆژئاواوە دەورەی ڕووباری داوەو بەرەو باکور پەلوپۆ دەهاوێت، لەناو ئەم چیایانەدا بەرزیی وەهای تێدایە دەگاتە (٣٠٠٠ پێ)، چیای وای تێدایە ساڵی دوازدەی مانگ بەفری لێ نابڕێ، هەوا**

---

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو. مەبەست لە (ناوچەی وڵاتی میسۆپۆتامیای تورکی) نیشتمانی کوردە، لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی تورکیای ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

**له ئەندازە بەدەر ساردە، بەرزاییەکەی لە رووی دەریاوە دەگاتە نێزیک (٣ هەزار پێ) لەسەر ئاستی دەریا و لەنێوان چیاکاندا دۆڵی بەپیت و فێنک بوونی هەیە. بۆیە لەوێش زۆرترین ژمارەی خەڵک نیشتەجێ بوون"[٢٧].**

بێکەڵک نییە لەم بوارەدا سێ زاراوەی جوگرافی لێک جودا بکەینەوە:

**١.میدیای ناوەند:** مەبەست لێی ئەو ناوچەیە، کە جێنشینی شەش خێڵە میدییەکە بووە بە ناوی (یەکەتیی خێڵە میدییەکان) ناسراوە. ئەم یەکەتییە لە سەردەمی پادشای میدی دیاکۆ، کۆمەڵگەی میدیایی پێک دەهێنا و لە باکورەوە بە ئازەربایجاندا درێژ دەبووە، لە باشوورەوە دەگەشتە سنووری ئیلام، (وڵاتی کوردان لە رۆژئاوای ئەمڕۆی ئێران و زۆرینەی نیشتمانی کوردان لە باکوری عێراقی ئەم رۆژگارە).

**٢. میدیای گەورە:** ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، کە پێشینانی کوردی تێدا نیشتەجێ بوون، ئەوانیش خێڵی لۆلۆ و گۆتی و کاشۆ و سۆبارتۆ و حۆری (میتانی)، ماننایی و خەلدی و ئۆرارتۆ / نایری بوون. حاڵیحازر گەلی کورد لە (میدیای مەزن) ژیان دەکەن، هەمان ئەو ناوچانەی کە پێشینەکانی کورد لەسەری ژیاون.

**٣. میدیای ئیمپراتۆرییەت:** ئەو ناوچە پانوبەرینانەیە، کە لەتەک میدیای گەورەدا، وڵاتی فارس لە باشووری رۆژهەڵات، سند لە رۆژهەڵات، باکتریا (خوراسان) لە باکوری رۆژهەڵات، وڵاتی ئاشوور لە رۆژئاوا و وڵاتی ئەرمەنستان لە باکور دەگرێتەخۆ.

---

(٢٧) هارفی پۆرتر: موسوعة مختصر التأريخ القديم، ص٨٢.

## پێکهاتەی ئەتنۆلۆژی

نووسینە ئاشوورییەکانی سەدەی نۆیی پێش زاین باس لە گەلێک دەکات بە ناوی گەلی (مید-Medes). ئەم گەلە پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ فارسەکانی ڕۆژهەلاتی ولاتی ئاشوور هەبووە، هەردوو پاشای ئاشووری تەغلات پلاسەری سێیەم Tiglathpileser 111 (747- 728پ. ز)و سەرگۆنی دووهەم Sargon 11 (722-705 پ.ز) باج و خەراجیان بەسەر میدییەکاندا سەپاندووە. لە نووسینە ئاشوورییەکاندا ناوی میدیەکان بە (میدییە ترسناکەکان) هاتووە، ئەوانیان بە گەلێکی خێڵەکی وەسف کردووە، کە لە بن دەسەلاتی هیچ پاشایەکدا یەکیان نەگرتووە[٢٨].

وشەی (مادەکان ـ میدییەکان) لە زمانی ئاشووریدا بە (مادای ـ Medai) (ئەمادای ـ Amadai ) (ماتای ـ Matai) هاتووە، بەلام لەسەر زاری ئیلامییە نوێیەکان بە (ماتا- پە/ Mata-pe) گۆکراوەو لای عیبرییە دێرینەکان بە (مادای) و لەسەر زاری فارسە کۆنەکان بە (مادا – Mada) ناویان هاتووە، بەلام بە زمانی یۆنانییە کۆنەکان (مادی ـ میدی - Madoi-Medoi)[29]و ئەرمەنییە کۆنەکان بە (مار- ک/ Mar-K) و پارسەکان[٣٠]، بە (مات- Mat ) گۆ کراوە. (دیاکونۆف) وای دەبینێت، کە لە واتادا نێزیکایەتییەک هەیە لەنێوان (ئەمادی) یان (مادای)و دوو وشەی (مارودی)و (ئەمارودی)دا.

ئەو دەبێژێت: **"وشەی ماردوی و ئەماردوی، لە زمانی یۆنانی کۆندا و مارتا لە ئاوێستایی (ئاڤێستا) ناوەند، هەر هەموویان واتای جەنگاوەر، یاخۆ شەڕکەر، یان هەڵگەڕاوە و یاخی چیایی دەگەیەنێت".**

---

(٢٨) دیاکونوف: میدیا، ص٧٢. طه باقر واخرون: تأریخ ایران القدیم، ص٣٧. هـ ج. ولز: معالم تأریخ الانسانیة، ص٣٥٠.

(٢٩) ئەم دوو ناوە بەو شێوە وەرگێڕاون، بەلام ڕاستییەکەی (مادوویی - میدوویی)یە.

(٣٠) پارس، بەم شێوانەش ناودەبرێت: پارت، فارس، پرس، ئەشکان، دکتۆر جەمال ڕەشید، دەڵێت: ئەوان جۆرێکن لە ئیسکیت. بڕوانە: مجموعة من الباحثين: كركوك، ص١٦٥.

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەمەڕ میدییەکان ئەنجام دراون، بۆمان دەردەکەوێت، کە میدییەکان دەوروبەری ساڵی (١١٠٠ پ.ز) ڕوویان لەو ناوچەیە کردووە، کە لەکۆتاییدا لە ڕۆژئاواو باکورو باشوورەوە بە (کوردستان) ناسرا. میدییەکان لە یەکگرتنەوەی شەش خێڵ پێک هاتوون، کە (دیاکۆنۆڤ) بە Paretaknoi, Boussi, Magoi, Boudloi, Arzantoi, Strouknates ناوی ناون و (هیرۆدۆت) بە (بووسسی و پاریتاسیین، سترۆکاتی و ئەریزانتی و بودی[٣١] و ماجی) ناوی بردوون.

ئەم شەش خێڵە یەکگرتووە، بە زمانی هاوبەش ئاخاوتوون، کە زمانی میدی بووە. بەپێی بۆچوونی (ئەرشاک سافراستیان)، لەپاشاندا گۆتیوم بە میدیا ناسراوەو دواییش ناوچەکە ناوی (کوردستان)ی لێنرا. بەپێی بۆچوونی ئەرشاک ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە میدیا درێژکراوەی جوگرافی و مێژوویی و ڕۆشنبیری گۆتیۆم بووە، چونکە گۆتییەکان و میدییەکان لە هەمان ناوچەدا ژیاون.١[٣٢]

(هارڤی بۆرتەر) دەڵێت: میدییەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونەتە ناوچەکە ناوی (ئاریانین) یان (ئیرانین)یان لەخۆ نابوو. هارڤی درێژە بە قسەکەی خۆی دەدات و دەڵێت: **"بەر لە دەرکەوتنی ئاشووری و کلدانییەکان، بە ماوەیەکی درێژ لە سەدەی هەشت یان نۆی پێش زاین، لە وڵاتی مادی، مەزنیی نەتەوەی مادەکان دەستی پێ کردووە، بۆیە بوونی لە مێژینەی ئەوان هیچ گومانێک هەڵناگرێت، چون لە سفری تەکویندا باس کراوە. لە مێژووی (پیرۆسووس) مێژوونوسی کلدانی، موسا گوتویەتی[٣٣] ، کە مادی کوڕی یافت باپیرە گەورەی نەتەوەی مادەکانە، سەلمێنراوە، کە لە ڕۆژگاری ئەودا بووە. بیرۆسووس باس لە دەستبەسەرداگرتنی زەوی کلدانەکان دەکات لەلایەن**

---

(٣١) ناوەکە بەوشێوە هاتوو، بەڵام ڕاستەکەی (بوودلوویی)یە.

(٣٢) دیاکونوف: میدیا، ص١٤٣– ١٤٦. هیرودوت: تأریخ هیرودوت: ص٨٠ أرشاک سافراستیان: الکردو کردستان، ص٢٤، ٢٥. دیلابورت: بلاد مابین النهرین، ص٣٠٨.

(٣٣) ڕووداوی پێوەست بە پێغەمبەری عیبرانی مووسا، لە میسر لەنێوان ساڵانی (١٢٢٥ – ١٢٠٠ پ.ز) بووە. ولیام لانجر: موسعة تأریخ العالم، ص٦٧/١.

**مادەكانەوە. ئەم دەستبەسەراگرتنەش لە سەدەی بیست و سێی پێش زاین بووە، جگە لەوەش (ئەلیۆنانتشیر) باس لە پەلهاوێشتنی دێرزەمانەی نەتەوەی مادەكان دەكات، لەگەڵ ئەمانەدا نەتەوەیەكمان بەرچاو دەكەوێت، كە لە نەوەی مادەكان و بەر لە سەدەی بیستی پێش زاین بوونی هەبووە، دوای بزربوونی و لێكۆلینەوە لە ئاسەواری كراوە...بەلام نەتەوەی نوێی مادەكان سەرەتا لە سەدەی نۆی پێش زاین دەردەكەوێت"[٣٤].**

گەر مەبەست لە (خاكی كلدانییەكان)، ولاتی سۆمەرو ئەكاد بێت، ئەوا ئەو دەمە لە سەدەی (٢٣ پ.ز )بیست و سێی پێش زاین، هێشتا بابلییەكان (كلدانەكان) دەرنەكەوتوون، خۆ ئەگەر دیسان وای دابنێین ئەو مەملەكەتی مادە، كە لەسەر زەوی كلدانەكان دامەزراوە، دەولەتی گوتی (غۆتی- جوتی) بووبێت، ئەو مەملەكەتەی كە بۆ ماوەی یەک سەدە حوكمی كردووە، ئەوا هیچ گومان هەلناگرێ ئەگەر بڵێین گوتییەكان و گشت ئەو گەلانەی كە لە چیای زاگرۆس و دەوروبەریدا نیشتەجێ بوون، وەک كاشییەكان و حۆرییەكان (میتانییەكان) كە دەولەتیان پێكهێناوە، هارفی پۆتەر هەرهەموویانی ناوناوە (ماد- مید).

دەبێت ئەوە بزانین، كە ناوی (مید- ماد) تایبەت نەبووە بە یەک گەل و یەک خێل، بگرە ناوێكی جوگرافیاییەو سۆمەرییەكان و ئاشوورییەكان بەو ناوچەیان گوتوە، كە لە كاتی سەرهەلدانی مێژوو پێشینانی (باوباپیری) كورد، (لۆلۆ، گوتی، كاشۆ، سۆبارتۆ، میتانی، مانتایی، خەلدی، (ئۆرارتۆ) كاردۆخی) لەسەری ژیاون، بەلام ئەو شتەی لە سەدەی حەوتی پێش زاین ڕیزی لقە جیاجیاكانی (شەش خێلە سەرەكییەكە)ی یەكخست و یەكەیەكی كۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی تۆكمەو سفتی لێ پێكهێنان، یەكێتی میدییەكان بوو، كە توانی هەر شەش خێلە سەرەكییەكە ڕێک بخات و یەكیان بخات.

میدییەكان ڕووبەڕووی ئاشوورییەكان بوونەوە و خێلە نیشتەجێكانی نێوان دەریای قەزوین و دەریای ڕەش لە باكور و كەنداوی فارس (عارەب)

---

(٣٤) هارفی بورتەر: موسعة المختصر التأريخ القديم، ص٨٤. و لعلی مقصود بـ (الیونانتشسیر ما ورد في تراث اغريقي).

لە باشوور و ئەفغانستان لە ڕۆژهەڵات و وڵاتی دوو ڕووبار (ئێراقی عارەبی) لە ڕۆژئاوا یەکخست و بەردەوام زەبری کوشندەی یەک لە دوای یەکی ئاڕاستەی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان دەکرد، تا لە کۆتادا بە هاوپەیمانی بابلییەکان و ساڵی ( ٦١٢ پ.ز) مەملەکەتی ئاشووریان تێکوپێکداو گشت گەلانی نیشتەجێی نێوان ئەفغانستان و دەریای سپی ناوینیان لە بن دەست و دەسەڵاتی ئاشوورییە دڵڕەقەکان ڕزگار کرد.

سیاسەتی کاریگەری میدییەکان کاری خۆی کرد، بەرئەنجام گەلە دێرینەکانی زاگرۆس و گەلە میدییەکانی دیکەیشی بە جوگرافیا و کولتوور و سیاسی و ئابوورییەوە لکاند بەیەکەوە. زمانی میدییەکان (ڕەگوڕیشەی کۆنی زمانی کوردی سەردەم) بۆ هەموو بوو بە زمانی زاڵ و لە سایەی قەوارەیەکی سیاسی (مەملەکەتی ماد)دا بوو بە زمانێکی یەکگرتوو.

شانازی ئەو سەرکەوتنە گرینگە بۆ هەر سێ سەرکردە مەزنەکەی میدیا (دەیاکۆ، خەشتریت، کەیخوسرۆ) دەگەڕێتەوە. ئەم سێ سەرکردە بناخەیەکی سیاسی لەبارو تۆکمەیان بۆ بەدەستهێنانی کەشوهەوایەکی لەبار هێنایە ئاراوە، ئامرازی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییان داهێنا، ئەوەش بوو بە هۆی یەکخستنی لقەکان لەچوارچێوەی یەک نەتەوەدا، کە لەکۆتاییدا بە نەتەوەی کورد ناسرا.

بۆ تیشک خستنە سەر ئەم لایەنە، پاش قسەکردنی، لەمەڕ لۆلۆ و گۆتی و کاشۆ و حوری و ئیلامی و میدی، دیاکۆنۆڤ دەدوێت و دەڵێت: "**سەبارەت بە لێکچوون و گونجانی زمانەوانی، لەنێوان ئەم نەتەوانەدا ئێمە دان بە ڕاستی و دروستی بۆچوونەکاندا دەنێین**)."[٣٥] دیاکۆنۆڤ درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: "**نەتەوەکانی بن دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی میدیای سەربەخۆ، داوای یەکێتی و یەکبوونیان دەکرد، ئەم ئارەزووەش زمانی یەکگرتوویانی بەهێزتر کردو بەم شێوەیە وردە وردە زمانە نوێیەکە (ئێرانی- میدی کۆن) لە گشت ناوچەکەدا بوو بە زمانی خێڵەکان و زمانی خۆجێیەتی**)."[٣٦] ئەم دۆخەی پێکهاتەیە، کە پلە بە پلە قەوارەی گرت، بە تەنیا پەیوەست نەبوو بە باوباپیرانی

---

(٣٥) دیاکونوف: میدیا، ص١٣٧.

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٢.

کوردەوە، بگرە عارەب و فارس و ئەرمەن و تورکانیش دەرهاویشتەی چەند لقێکی خێڵەکی گەورە بوون و لەسەر دەستی سەرکردەیەک یان چەند سەرکردەیەکدا کۆبوونەوە، ڕیزەکانی خۆیانیان ڕێکخست و لە سایەی چەند مەرجێکی دیاریکراو، جوگرافی و سیاسی و ئابووریدا، لەژێر ئاڵای یەک زمان و لەچوارچێوەی یەک قەوارەی سیاسیدا گردبوونەوە. بۆ نموونە با باسی عارەب بکەین، ئەوان چەند لقێکی خێڵەکی جیاواز لە بیروباوەڕ و شێوەزار، هەردەم لە پێناو ئاو و لەوەڕگەدا، لە زۆرانبازیدا بوون. ئەوەبوو لە سەدەی حەوتی زاینی، محەمەدی پەیامبەر پەیدابوو، لەژێر بەیداخی ئیسلامدا یەکیان گرت و بوون بەیەک نەتەوە و شێوەزاری خێڵی قورەیش- کە زمانی قورئانە- بوو بە زمانی یەکگرتوویان.

# (٤)

# پادشا (دەیاکۆ)ی میدی (یەکەم دامەزرێنەر)

## ( ساڵی ٦٧٥-٦٧٤ پ. ز مردووە)

### ئاشوورییەکان و میدییەکان

لەکاتێکدا ئاشوورییەکان لە ڕۆژئاوای ئاسیادا هێزێکی زەبروەشێن بوون، کاریان بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتێکی پانوپۆڕ دەکرد. سیاسەتی فرەوانخوازی وای دەخواست دەست بەسەر چیای زاگرۆس و دەوربەریدا بگرن، تا کۆنترۆڵی (ڕێگەی ئاوریشم) بکەن. ئەم ڕێگە بازرگانییە گرینگەی کە ئەو سەردەمە بەو ناوچەیەدا گوزەری دەکرد، بە دەربڕینێکی تر، دەبووایە ئاشوورییەکان پەلاماری نیشتمانی میدیا بدەن و کۆنترۆڵی بکەن، تا بتوانن بە ئاسانی لەگەڵ ئاسیای ناوەڕاست لە ڕۆژهەڵات و ناوچەکانی دەوروبەری قەوقاز لە باکور پێوەندیی گرێ بدەن. ئاخر هیچ ئیمپراتۆرییەتێک ڕازی دەبێت ئابوورییەکەی لە پەلەقاژەی مەرگدا بێت و بەرەو خنکان بچێت، دەستەوەستان دابنیشێت و لێی بڕوانێت؟

زۆرینەی زۆری پادشاکانی ئاشوور (بە هاندانی پیاوانی ئاینی- کاهینەکانی خواوەندی گەلی ئاشوور)، کەسانێک بوون هەردەم تەماحی داگیرکاری گەورەیان لە مێشکدا بوو. ئەوان بەرامبەر بە نەیارەکانیان (ئەوانەی کە ڕێگر بوون لەبەردەم جێبەجێکردنی پلانی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتەکەیان) فرە توندوتیژ و دڕبوون، هاوزەمان سوپایەکی بەهێز و چالاکی بەگوڕ و تین و بزێو و هەڵەشە و ئارەزوومەندی وێرانکارییان پێک هێنابوو. دواجار پادشاکانی ئاشوور ئەو وڵاتانەی کە ئەمڕۆ بە (ئێران، ئازربایجان، ئەرمەنستان، کوردستان، عێراق، سوریا و چەند بەشێک لە ئاسیای بچووک و ڕۆژئاوای ئاسیا) ناسراون، داگیرکرد. دواییش بەرەو باشوور پەلیان کوتا و وڵاتی میسریان داگیرکرد و ئیمپراتۆرییەتی ئاشووریان دامەزراند. بەپێی قسەی (ویل دیورانت)ساڵی (٨٣٧ پ.ز) لە سەردەمی پادشا شلمانەسەری سێیەم،١١١ Shalmaneser (858-828 پ.ز) یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی میدییەکان و ئاشوورییەکان ڕووی دا. ئەم پاشایە لە چیاکانی کوردستان پەلاماری وڵاتێکی دا بە ناوی (پارسووا)، لەو کاتەدا لە وڵاتی میدیا بیست و حەوت سەرۆک- پادشا، حوکمی بیست و حەوت ویلایەتیان دەکرد. ئەو دەمە دوژمنایەتییەکی بەردەوام کەوتبووە نێوان ئاشوورییەکان و میدییەکانەوەو چەند جارێک ئاشوورییەکان بەسەر میدییەکاندا زاڵ بوون، بەڵام پێیان نەدەکرا دەسەڵاتی تەواوی خۆیان بەسەردا بسەپێنن.

هەریەک لە شلمانەسەری سێهەم وشەمشی حەدەدی پێنجەم (٨٢١-٨١٠ پ.ز) و تگلاد پلاسەری سێیەم (٧٤٧-٧٢٨ پ.ز) سەرگۆنی دووەم Sargon II (722-705 پ.ز) ئەسەرحەدون (680-669) Eserhaddon پ.ز) ئاشووربانیپال Asharbanipal (668-626 پ.ز)[٣٧] شەڕی میدییەکانیان کردووە. سەرەڕای ئەو هەموو شەڕوشۆڕو داگیرکارییە، میدییەکان هەرگیز سەریان شۆڕ نەکرد، بگرە لەپێناو خۆ ڕزگارکردن لە بندەستی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری هەموو دەرفەتێکیان دەقۆستەوە، لەولاشەوە پادشاکانی ئاشوور پەیتا پەیتا پەلاماری میدییەکانیان دەدا، گوند و شارەکانیان وێران دەکرد و زیانی زۆریان لێ

(٣٧) ارشاک سافراستیان: الکرد و الکردستان، ص١٦٣. ولیام لانجز: موسوعە تأریخ العالم، ٩٣/١.

دەدان و بەرەو ناوچە دوورەدەستەکان زۆرینەیان ناچار بە کۆچ دەکردن. نموونەی ئەم کۆچی زۆرەملێیە، تغلات پلاسەری سێیەم Tiglathpileser بەرچاو دەکەوێت. ئەم پاشایە شەست و پێنج هەزار دیلی میدی لە چیاکان هێنایە خوارەوە و لە دەڤەری دیالەی (ئێستەی عێراق) نیشتەجێی کردن، هەر بەو شێوەیە چەند گرووپێک لە گەلی لۆلۆی (باوباپیرانی کورد لە چیاکانی زاگرۆس)و چەند گرووپێکی تر لە گەلی نایری (باوباپیرانی کورد، نێزیک بە گۆمی وان)ی بۆ سوریا گواستەوە و لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان شاری (حەما) و دەریای سپی ناوەڕاست نیشتەجێی کردن[٣٨].

## دەیاکۆی دامەزرێنەر

لەنێو مێژوونووساندا جۆرە کۆدەنگییەک سەبارەت بە ڕووداوەکانی پێوەست بە مادەکان بەدی دەکرێت، کەچیی لەسەر دەستنیشانکردنی مێژووی ڕووداوەکان ناکۆکی ئاشکرا هەیە، بەڵام ئەم دیاردە نامۆیە، بۆ نموونە، کە پێوەست دەکرێت بە ڕووداوەکانی تایبەت بە بابلی و ئاشووری و فارسە ئەخمینییەکان، ئەوا بەم شێوە ئاشکرایە بەدیار ناکەوێت. من وای بۆ دەچم، کە فارسەکان بەگشتی و ئەخمینییەکان بەتایبەتی لە پشت بزرکردن و شاردنەوەی ئەنقەستی هەر ڕووداوێکی پێوەست بە مادەکانەوەن، پاشان ئەو ئیمپراتورییەت و مەملەکەتانەی کە حوکمی وڵاتی میدیایان کردووە لاسایی پێشینانی خۆیانیان کردووەتەوە، ئەو دەمەی کە ئەخمینییەکان دەستیان گرت بەسەر مەملەکەتی مادداو دەستکەوت و شارستانییەتەکەیان وەک میراتیی بۆ مایەوەو کردیان بە موڵکی خۆیان، هەوڵی سڕینەوەی هەموو شتێکی پێوەست بە مەملەکەتی مادیان داوە، هەر ئەمەشە هۆی سەرلێشێوان و بەهەڵەداچوونی مێژوونووسان.

لێرەدا ئەوەی بۆ ئێمە گرینگە ڕووداوەکان و بەدوایەکدا هاتنیانە، ئەم هەڵکشان و داکشانە میدییەکانی گەیاندە ئەو بڕوایەی کە بەم پەرشوبڵاوییەوە

---

(٣٨) دیاکونوف: میدیا، ص٢٨. طه باقر واخرون: تأريخ الايران القديم، ص٣٨.

ناتوانن ڕووبەڕووی ئیمپراتورییەتی ئاشوور ببنەوە، لەهەمان کاتدا گەشتنە ئەو بڕوایەی کە تەنیا ڕێگەی ڕزگاربوون یەکخستنی ڕیز و کۆکردنەوەی وزە و توانایانە، مێژووی مرۆڤەکان پێمان دەڵێت، کە خواستی گەل بۆ ئازادی سەرکردەیەک دەخوڵقێنێ و ویستی ئەو گەلەی تێدا بەرجەستە دەبێت، ئەم حەز و ویستی ڕزگاربوونەش لە ناخ و ڕۆحی مادەکاندا چەکەرەی کرد، ئەوە بوو (دەیاکۆ) ئەو سەرکردە زرنگ و بوێور و دڵسۆز و دانایەیان تێدا هەڵکەوت.

دەیاکۆ Daiku))ی کوڕی فراورتیس (Phraortes)، ئەم پیاوە بە (دەیوکۆ)ش ناسراوە، لە سەرچاوە فارسییەکاندا بە (کەیقوباد) ناوی دەبەن، لە بڕێ سەرچاوەی یۆنانیدا بە تایبەت مێژووی هیرۆدۆت بە (دیوسیس- Dioces) ناوی هاتووە، دیاکۆنۆف یش بە (دایئوک) ناوی دەبات.

سەبارەت بە ناوی دەیاکۆ (دەیوکۆ، دیوسیس) ڕاستییەک هەیە دەبێت لەبەرچاوی بگرین، ئەویش پیتی (س)ی تایبەت بە ناوە لەلای یۆنانییەکان، ئاشکرایە لە گواستنەوەی ناو لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر گۆڕان بەسەر دەنگەکاندا دێت، بەعارەباندنی ناوەکان گۆڕان بەسەر پیتەکاندا دێت، بۆ نموونە لە عارەبیدا پیتی (ژ-j ،چ- Ç، پ-P، گ- g) بوونیان نییە، هەر بۆ نموونە لە نووسینی ژین (حیاة)ی کوردی بە پیتی عارەبی ناچارین بە شێوەی (زین) وشەکە بنووسین، ئەمە بۆ نووسینی وشەکانی دیکەیش، کە لەپێشدا هێمامان بۆ کرد ڕاستە. بێگومان لێکچوونی نێزیک لەنێوان وشەی (دەیاکۆ، دەیۆکۆ، دەیۆک، دەهۆک)دا، بوونی هەیە.

دکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد (پسپۆر لە مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵات) دەڵێت: (دەهووک) وشەیەکی میدییە و واتای خاوەن هەرێم (پاشای وڵات) دەگەیەنێت، ئاشوورییەکان بەشێوەی (دەهیاوکوو) تۆماریان کردووە.

لە پەهلەویداشێوەی (دەهاک) یان (دەهیک)ی وەرگرتوە، عارەبیش وشەی (دیهقان)ی لێ دەرهێنا و (دەهاقنە)[٣٩]یش کۆیەکەیەتی، دەبینین خزمایەتییەکی بێژەیی لەنێوان (دەیاکۆ، داییکو)دا، بەدی دەکرێ و لە زمانی کوردیشدا دووەمین شێوە واتای (بەخشندە، دەسبڵاو ـ سەخی، فرەبەخش) دێت.

---

(٣٩) مجموعة من الباحثين: كركوك، ص١٦٩.

کەسایەتی دەیاکۆش بەم ڕەوشتە ناسراو بووە. خۆزگە زمانزانە کوردەکان لەم بوارەدا ئەم تەمومژەیان دەڕەواندەوە.

فەرموون با گوێ لە (هیرۆدۆت) بگرین و بزانین لەمەڕ ئەم سەرکردەیە چیمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو دەڵێت: **"بیستوومە، کە دیۆسیسی کوڕی فراورتیس، پیاوێکی دانا بووە، بیری لەوە کردووەتەوە، دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەوروبەریدا بسەپێنێ، دیۆسیس بەتوندی دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پلانەکەی خۆی، ئەم پیاوە دەیبینی میدییەکان بە پەرشوبڵاوی لە گوندە دوورە دەستەکاندا ژیان دەکەن، ئەو دەیزانی بەبێ بوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی ئاساییە بشێوی و بێ سەروبەری بڵاو ببێتەوە دەرەنجامیش زۆر و ستەم باڵ بەسەر ناوچەکەدا بکێشێت، چونکە ئەو دەمە لە گوندەکەی خۆیدا ئەم دیاردە دزێوانە بە زەقی تێبینی دەکران، بۆیە ئەو هەمیشە خۆی ماندوو دەکرد تا دادپەروەری لەناو هۆز و کەسەکانی خۆیدا بەرقەرار بکات، ئەم پیاوە وای بۆ دەچوو، کە دادو ستەم پێچەوانەی یەکدین و بەردەوام لە ململانێدان، بۆیە ناشێت و ناکرێ پێکەوە بگونجێنرێن.**

**ئەم باوەڕە وەک مەزهەبێک لەناخیدا ڕیشەی داکوتا و بانگەشەی بۆ کرد، کە خەڵکی دەیانبینی لە یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییەکاندا بڕیارو حوکمەکانی پاک و دادپەروەرانەیە، بەرەبەرە ڕوویان تێکرد، کاتێک بڕیاری دا دەسەڵاتی بەسەر قەومەکەدا بشکێت، ئەوسا بۆ خەڵکەکە ڕوون بووەوە، کە ئەم پیاوە دادوەرێکی ڕاستگۆو پاک و بێگەردە، بۆیە سەرنجی هاوولاتییانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و ئیتر ناو و ناوبانگی لەلای گوندنشینەکانی دەوروبەر پەیداکرد، ئەو گوندنشینانەی کە بەدرێژایی مێژوو ستەمی قورس و زۆریان چەشتبوو، کە هەواڵی دیۆسیسیان پێ دەگات و دڵنیا دەبن لە دادپەروەری و پاکی بڕیارەکانی، بە کۆمەڵ لە هەموو لایەکەوە بۆ چارەسەرکردن و بەلاداخستنی شکات و داواکانیان ڕوویان تێدەکرد، تا وای لێهات بەبێ ڕکابەر متمانەی بێ چەندوچوونی گشت خەڵکێکی بەدەست هێنا.**

**بۆ بەلاداخستنی ناکۆکییەکانیان، ڕۆژانە خەڵکی ڕوویان لە دیۆسیس دەکرد، کە بینیان پیاوێکی بێ وێنەیە لە ژێریدا و بێگەردە لە دادوەرییدا، ئیتر**

متمانەی تەواویان پێ بەخشی. لەپاڵ متمانە پێ بەخشینی بێ وێنەی خەڵکەکەو سەرقاڵی زۆری خۆی بەکاروبارەکانییەوە ئەوکاتە خۆیشی هەستی بە گرینگی خۆی کرد، بەئاشکرا بە دەنگی بەرز بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند، کە لەمڕۆ بەدواوە هیچ پێوەندییەکی پێیانەوە نامێنێت و دادوەرییان ناکات، ئیتر لێیان دابڕاو ئەو تەختەی بەجێ هێشت، کە ڕۆژانە لەسەری دادەنیشت و ناکۆکییەکانیانی بەلادا دەخست، پاساوی بۆ ئەم کارەی خۆی هێنایەوەو گوتی گوایە ئەو هیچ بەرژەوەندییەکی لەخۆ خەریککردنندا بە چارەسەری ناکۆکی خەڵکەوە نییە، ناشیەوێت لەمڕۆ بەدواوە کار و فەرمانی خۆی پشتگوێ و فەرامۆش بکات، دوای ئەم دەست لەکار کێشانەوەیە دووبارە دزی و جەردەیی و بێ سەروبەری بەزیادەوە لە جاران ڕووی لە دەڤەرەکە کرد.

کاتێک شەڕ و ئاژاوە و بێ سەروبەریی بێ ئەندازە تەشەنەی کرد، پیاوماقووڵ و خودان ڕاوبۆچوونەکان بە دووی چارەسەردا کەوتنەخۆ، ژیریی پێمان دەڵێت، کە ئەو کەسانەی پرسی چارەسەریان خستووەتە بەرباس هاوڕێ و هاوەڵی دیۆسیس بوونە، ئەوان لە کردبوونەوەیەکدا دەنگیان هەڵبڕی و شکاتیان لەو ژیانە کردو گوتیان: ئەگەر ئەم نالەبارییە بەردەوام درێژە بکێشێت لەم وڵاتەدا ژیان ناکرێ و کەس بەرگەی ئەم نالەبارییە ناگرێت، باشتروایە کەسێک بە پاشای خۆمان دەستنیشان بکەین، تا کاری ڕۆژانەمان بۆ ڕایی بکات و وەکو پێویست لەم وڵاتەدا سیاسەت بکات و ئێمەش بە کاروباری خۆمانەوە خەریک بین. لە کۆتاییدا بڕیاریان دا، پادشایەک دیاری بکەن، تا کاروباری وڵاتەکەیان بەڕێوە ببات.

دوای ئەم مشتومڕە، ئیتر ئاساییە گەل کەسێک دەستنیشان بکات، تا ببێتە پاشای وڵات، کە باس گەیشتە سەر ناوی پاشا، دیۆسیس کاندید کرا. خەڵکەکە بە یەک دەنگ کەوتنە پەسن و ستایشی دیۆسیس و هەموو بەپەلە بڕیاریان دا، کە ئەم هاوەڵەیان پادشای چاوەڕانکراوە، کاتێ کە ڕوویان لێ نا پلەی پاشایەتی قبووڵ بکات، داوای لێکردن کۆشکێکی شایستە بۆ پاشا بنیات بنێن و پاسەوانی تایبەتی بۆ دەستنیشان بکەن. ئەوەی ئەو داوای کرد، میدییەکان ڕەزامەندییان لەسەر دەربڕێ و لەسەر زەوییەکی دیاریکراو

کۆشکێکی گەورە و قایمیان بۆ بونیاد نا. بابەتی پاسەوانی تایبەتییان بۆ خۆی بەجێ هێشت، تا بە ئارەزووی خۆی لە تاکەکانی گەل دیاری بکات. هەر کە پادشا لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، داوای لێکردن شارێکی گەورە و بەرفرەوان بونیاد بنێن و شارۆچکە و گوندە بچووکەکانی خۆیان چۆڵ بکەن و لەو شارەی کە چاویان تێ بریوە و لە ئایندەدا دەبێتە پایتەختی شانشین، نیشتەجێ ببن و چاودێری بکەن.

جارێکی تر میدییەکان فەرمانیان بەجێگەیاند و ئەوشارەیان بونیاد نا، کە ئەودەم بە (ئەکباتان) ناسرا. شارێک بە شوورەی پۆلایین و پتەو دەورە دراو بە شورەی بازنەیی و چین لەسەر چین و بەرەو کەشکەلانی فەلەک بەرزو بڵند. بەپێی ئەو نەخشەیەی کە بۆی کێشرابوو، هەر شوورەیەک (دیوار)ێک لەوەی پێش خۆی بڵندتر، ئەو زەوییەی کە شارەکەی لەسەر بوونیات نرا گردێکی بەرزو تاڕادەیەک گونجا لەگەڵ نەخشەکەدا، بەڵام فاکتەری تۆکمەیی و قایمی شارەکە، پشتی بە هونەری بیناسازییەکەی دەبەست. ژمارەی شوورەکانی شار حەوت شوورە بوو، کۆشکی پاشایەتی و کۆگەکان دەکەوتنە کۆتاییەوە.

بازنەی شوورەی دەرەوەی شار بە کەمێ جیاوازییەوە هاوشێوەی بازنەی شوورەی ئەسینا بوو. بەردی ئەو دیوارە سپی بوو، پاشان ڕیزێک بەردی ڕەش و قرمزی و شین و پێنجەمین ڕەنگی پرتەقاڵی، ئەو پێنج ڕیزە دیوارە بە زەیت رووپۆش کرابوو، بەڵام بەردی دوو ڕیزە دیوارەکەی کۆتایی بە ڕەنگی زیوین و ئاڵتوونی ڕووپۆش کرابوون. دیۆسیس، ئەم هەموو خۆ قایمکردنەی لە پێناو پاراستنی خۆی و کۆشکەکەیدا بوو. تاکەکانی گەلیش دەبووایە لە دەرەوەی شوورەی کۆشکی پاشایەتی ماڵ و مەسکەن بۆخۆیان دابین بکەن.

لەگەڵ بە کۆتاهاتنی بونیاتی شاردا، دیۆسیس مەرسوومێکی مەلەکی ئامادەکرد، سرووشتی پاشایەتی ئەو ڕێی نەدەدا کەس لێی نێزیک ببێتەوە، لە ڕێگەی نامەبەرەوە پێوەندیی پێوەدەکرا، چاوپێکەوتنی ڕووبەڕووی لە داروەدەستەکەی قەدەغە کرد. لە دەهەمبەریدا ، تف ڕووکردن و پێکەنینی

قەدەخە کرد، داهێنەری ئەم فەرمانانە دیۆسیس خۆی بوو، بۆ پاراستنی خۆیشی بوو لە هاوەڵەکانی، ئەو هاوەڵانەی لە ڕووی نەژاد و ڕەسەنایەتییەوە هیچیان لەو کەمتر نەبوو، بۆیە نەی دەویست نێزیک بێتەوە لێیان و دوورەپەرێز ڕادەوەستا، نەوەک شان بەشانی ئەو، بوێری و جوامێری بنوێنن و هەیبەتی کاڵ بێتەوە و خەمساردی بنوێنن و بێ گوێی بکەن، بەڵام گەر لەبەرچاویان خۆی بەدوور بگرێت ئەوساکە ناوناوبانگی لە دل و دەروونی ئەوانی تردا هەردەم دەزرنگێتەوە و سامی لێ دەکەن و وای لێک دەدەنەوە، کە پاشا لە قوڕێکی دی هەڵشێلراوە.

پاش ئەوەی فەرمان و ڕێنومایییەکانی ڕەگوڕیشەیان داکوتا، دیۆسیس لەسەر تەختی پاشایەتی دایکوتاو خەریک بوو بە کارەکانییەوە و بەدواداچوون و گرینگی بە کاروباری خەڵکی دەدا و بەدواداچوونی بۆ ناکۆکییەکانیان بەوردی و توندی دەکرد. ئیتر بوو بە باو، شکایەتکار داوای بۆ پاشا دەنووسی، پاشایش دەیخوێندەوە و بڕیاری کۆتایی دەگەیەنرایە هەردوو ناکۆک، ئەو چاوی بە سەرتاپای مەملەکەتەکەیدا دەگێڕا و هەواڵی هەر دەستدرێژی و زیادەڕۆییەکی ببیستایە، بە دووی ستەمکاردا دەینارد و بەرانبەر بەو گوناە و تاوانەی کردوویەتی سزای خۆی وەردەگرت. دیۆسیس ڕیزی میدییەکانی یەکخست و بە تەنیا حوکمی کردن. پاش مردنی، (فراورتیس)ی کوڕی جێگەکەی گرتەوە.(٤٠)

---

(٤٠) هیرودوت: تأريخ هيرودوت، ص٧٧–٨٠.

## خوێندنەوەیەکی کەتواریيانە

لە ڕاستیدا هیرۆدۆت شایەنی ڕێزلێگرتن و سوپاسە. ئەو یەکەمین و گەورەترین مێژوونووسی یۆنانییە.[٤١] هەوڵ و کۆششی بەپێزی ئەو نەبووایە، زۆر لایەنی شاراوەو گرینگی مێژووی ڕۆژئاوای ئاسیا لە سەدەی (٨ پ.ز) تا سەدەی (٥ پ.ز)مان بۆ ئاشکرا نەدەبوو. مێژوونووسان زۆرینەی زانیارییەکانی پێوەست بە مادەکانیان لە کتێبەکەی ئەوەوە هەڵێنجاوە. سەرەڕای ئەم ڕاستییەش دەبێت بەوریایی و وردبینییەوە نووسراوەکانی ئەم مێژوونووسە پایەدارە بخوێنینەوە. ئەم قسەیەشم بۆ گوناهبارکردن و تاوانبارکردنی نییە، بگرە لەبەر ئەم سێ هۆیەیە:

**یەکەم:** هیرۆدۆت، لەسەردەمی مەملەکەتی میدیادا نەژیاوەو خۆی لە کتێبەکەیدا فەرموویەتی: لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی پێوەست بە مەملەکەتی میدیا پشتم بە (**گێڕانەوەی فارسە باوەڕەپێکراوەکان**)[٤٢] بەستووە، نەک گێڕانەوەی میدییەکان.

---

(٤١) ناوی هیرۆدۆت لە دوو بڕگە پێک هاتووە (هیرۆ/ هیرا) پەرستراو - مەعبوود- ی یۆنان، ئەشێت ئەمەش شێوەیەک بێت لە شێوەکانی (ئارو/ ئارا)، واتە (ئاگر) بەو پێیەی ئاگر لەلای گەلە ئارياييەکان پیرۆز بووە، تێبینی دەکرێت، کە ناوی (هیرۆ) لای کورد هەیە و لە مێیینە دەنرێت، ناوی (هورو)یش لە نێر دەنرێت، بەڵام بڕگەی (دوت/ دەوت) واتای (بەخشش/ بەش) دەگەیەنێت، لە کوردیدا بەهەمان واتا بەکار دەهێنرێت. ناوی هیرۆدۆت (بەخششی خوداوەند هیرۆ/ هیرا) دەگەیەنێت. هیرۆدۆت خەڵکی شاری (هالکارناسوس - Halicarnassus)، کە یەکێکە لە شارەکانی باشووری ئاسیای بچوک (تورکای ئەمڕۆ)و ئەشێت لەنێوان ساڵی (٤٨٠-٤٢٦ پ.ز) ژیابێت و لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا گەشتەکەی دەست پێ کردبێت، واتە پاش ڕووخانی مەملەکەتی ماد بە نزیکەی یەک سەدەو گەشتەکەی (١٧) ساڵی خایاندووە، لە گەشتەکەیدا سەردانی یۆنان، باکوری ئەفریقا، میسر، سوریای گەورە، وڵاتی میزۆپۆتامیا و قەوقازیای کردووە: تأريخ هيرودوت، ص٢٠-٢٢

(٤٢) هيرودوت: تأريخ هيرودوت، ص٧٧

**دووەم:** ئەو بە خورافات و ئەفسانەکانیشەوە، بەبێ لێوردبوونەوە خستنەبەر لۆژیکی ئەقڵ، هەرچی بابەتێکی بیستووە خوێندووەتەوە، گواستوویەتییەوە.

**سێیەم:** ئەو نێزیکەی دوو هەزارو چوارسەد ساڵ بەر لە ئێستە ژیاوە، لەو ڕۆژەوە تا بە ئەمڕۆمان دەگات، زانست و زانستی بەراوردکاریی مێژوو، لە ڕێگەی گەڕان و شیکردنەوە، بەتایبەتی پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی زانستی، بەگشتی پێشکەوتنی بێشوماری بەدەست خستووە.

لەبەر ڕۆشنایی قسەکانی هێرۆدۆت و مێژوونووسانی دیکە لەمەڕ سەرهەڵدانی مەملەکەتی ماد، گەر خوێندنەوەیەکی کەتواربینانە بۆ ڕێڕەوە مێژوویيە سرووشتییەکەی بکەین، ئەوا دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا بلیمەتیی سەرکردەی میدی (دەیاکۆ)مان بۆ دەربکەوێت:

**یەکەم: پێکهێنانی ئاگایی نەتەوە:** دیاکونۆڤ دەڵێت: لە سەردەمی دەیاکۆدا، میدییەکان لە گوند- دەوڵەت دەژیان. ئەو درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: **"بوونی گوندە سەربەخۆکان (کۆمە) هۆیەک بوو تا ناکۆکی و ململانێکان باڵ بەسەر کۆمەڵگەدا بکێشێت و کەسانێک دەربکەون، کە ئارەزووی پاوانخوازی و دەسەلاتیان هەبوو"**[(٤٣)]، بۆیە ئەرکی سەرشانی دەیاکۆ گەلێ سەخت و قورس بوو. ئەرکی گواستنەوەی خێڵە میدییەکان لە ئینتیمای (خێڵ- دەوڵەت) بۆ باری ئینتمای( نەتەوە- دەوڵەت).

دەیاکۆ لە دامەزراندنی هاوپەیمانێتییەکی یەکگرتووی نیمچە فیدراڵی نێوان خێڵە میدییەکاندا سەرکەوتوو بوو. وا دەردەکەوێت، کە قەوارەیەک لە شێوەی بەڕێوەبردنی بە کۆمەڵ، لە سەرکردە خێڵەکییەکانی دامەزراندبێت، بەم هەنگاوە ژیرانەی خۆی، توانی پەتایەک، کە لە ناخی کەسایەتی میدییەکان و کەسایەتی ڕەگەزە کوردییەکەدا ڕەگوڕیشەی داکوتا بوو، هەڵبکێشێت. ئەو تایبەتمەندییە زیانبەخشانەی کە سەرەکیترین فاکتەری لەتلەتکردنی ناوەخۆی گەلی کورد بووە لە مێژوودا. مەبەستم تایبەتمەندی (سایکۆلۆژیای شاخ)ە. ئەو سایکۆلۆژیایەی کە دەبێتە هۆی پێداگرییەکی سەرسەختانە لەسەر

---

(٤٣) دیاکونوف: میدیا، ص١٧١،١٧٠

ڕاوبۆچوون و کەللەڕەقی و هەڵوێستی توندڕۆیی لە ناخی تاک و ناو خێڵەکاندا، بەرەنجامیش گوێ نەگرتن لە سەرکردایەتیی باڵاو یەکگرتوو. ئاشکرایە هەر نەتەوەیەک لەژێر فەرمانی یەک سەرکردایەتیدا کۆ نەبێتەوە، هەرگیز فاکتەرەکانی هێز و پێشکەوتن نابێتە هاوڕێی.

**دووەم: بنیاتنانی پایتەخت:** دەیاکۆ، شاری ئەگباتانای کرد بە پایتەختی قەوارە سیاسییە نوێیەکەو پاشان ناوی (ئامدان)ی لێ نرا، ئەم شارە پێش چەرخی میدیی ناوی (ئاکاسیا- Akessaia) بووە. ئەم ناوە لە وشەی ئاشووری (کار- کاسیی) وەرگیراوە، بە واتای شاری کاسییەکان (کاشییەکان) دێت. لە پاشان مێژوونووسە موسڵمانەکان بە (هەمەدان) گۆیان کرد. لەلایەکی ترەوە دەگوترێت گوایە دواتر هەمەدان لە نێزیک ئەو شارەوە، بوونیات نراوە.

ئاشوورییەکان ناویان لە ئەگباتانا ناوە (ماڵی دەیاکۆ)، کە پایتەختی میدییەکان بوو. قسەیەک هەیە گوایە بەر لەوەی ئەگباتانا ببێتە شاری شانشین ناوی (هەنگماتانا- Hangmatana) بووە، واتە (شوێنی بەیەککەیشتن)[٤٤].

ئەگباتانا بە واتای (جێی یەکانگیری ڕێگەی زۆر) یان (ئەنجومەنی کۆبوونەوە) دێت. ئاشکرایە، کە لێکچوونی دەنگیی و دەلالەت لەنێوان بێژەی (ئەگباتانا و دەربڕینی کوردی E gi bi tene یا Yek bi tene، واتا: (تاقانە، بێوێنە، نموونەی نییە، ئایندە)دا هەیە.

ئەم شارە بە سەرزەوییەکی بەپیت و دیمەن قەشەنگەوە هەڵکەوتووەو بەفری تەواوەی دوندو چیا نێزیکەکانی، ئاوی بۆ دابین دەکرد. دەستنیشانکردنی پایتەختێکی یەکگرتوو بۆ مەملەکەتی میدیا بە هەنگاوێکی گرینگ دێتە ئەژمار. هەڵهێنانی ئەم هەنگاوە گرینگە، دەلالەت لە زرنگی و وریایی و ئاستی بەرزی سیاسی ئەو سەرکردەیە دەکات. ئاخر پایتەخت تەنیا ماڵ و بازاڕ و فەرمانگەی دەوڵەت نییە، بگرە هێمایە بۆ یەکڕیزی و سەربەخۆیی نەتەوە.

---

(٤٤) أحمد فخري: دراسات في تأريخ الشرق القديم، ص٢٠٦، هامش (١) عبد الحميد زايد : الشرق الخالد، ص٥٧١

به قسەی (هارفی بۆرتەر) لە کۆندا وڵاتی (مادەکان) بەسەر دوو بەشدا دابەش بووە: میدیای ئەترۆبەتینەکان، کە بەشی باکور و میدیای مەزن لە بەشی باشووری بووەو لە برێ سەرچاوە ئیسلامییەکاندا، ئەم بەشەی وڵاتی میدیا بە ناوی (عێراقی عەجەم) ناسراوە. ئەو دەڵێت: دوو شار بە ناوی (ئەگباتانا) بوونی هەبووەو ئەو زانیارییەش تەنیا ئەو هێمای بۆ کردووە، ئەوەتا دەڵێت: **(ئەگبەتنا) گەورەترین شاری دێرینەو دەکەوێتە مادی مەزنەوە، لە ڕۆژهەڵاتی چیای زاگرۆس و بە هەمەدان ناسراوە، دەگوترێت گوایە بە ئەندازەی شاری نەینەوا گەورە بووە، خەڵکێکی زۆری لێ نیشتەجێ بووە، کۆشکەکەی لە جوانیدا هێندە بێ وێنە بووە زمان لە ئاست وەسفکردنیدا لاڵ دەبێت، پشتێنەکەی یەک میل بووەو خانوو و کۆڵان و پایەی زۆری لەخۆ گرتووە، سەربانەکەی لەبری قرمید، بە زیو داپۆشراو بووە، پایەو ڕایەڵ و سەرجەم دارەکانی بە زیو داپۆشراو بووە، برێکیش بە ئاڵتوون. ئاسەواری کەم ماوەتەوە، هۆی سەرەکی و دەردی فەوتانەکەشی ئەوەیە، کە بەشێکی گەورەی لە دار پێک هاتبوو.**

**لە باکوریشەوە شارێکی تر بە هەمان ناو ئەگبەتنا نێزیک بە تەختی سولەیمان، بوونی هەیەو بەپێی ئاسەوارەکەی، ئەو شارەیە، کە هیرۆدۆت وەسفی کردووەو گوتویەتی: بەسەر گردێکەوە ڕۆنراوە، حەوت شوورە بە دەوری گردەکەوەیە، هەریەکەیان لەوی دی بڵندتر و وەک پێ پلیکانە دەردەکەوێت، هەریەک لەو دیوارانە بە ڕەنگێکی تایبەت بۆیە کراوە، بەرهەیوانە نێزیکەکەی سپی، سەرووی ئەو ڕەش، سەرووتر قرمزی، بەرهەیوانی سەرووتر شین و سەرووتر پرتقالی، بەرهەیوانی زیوین دوای بەرهەیوانی ئاڵتوونی، دیمەنی شار چاوی ڕوانینی پڕ دەکردن لە جوانی، بەسەر تەپۆلکەکەوە کۆشکی پاشا و گەنجینە گرانبەهاکەی بەو حەوت شوورەیە دەورە درابوو**(٤٥).

**دووەم: دەستنیشانکردنی شوێنی پایتەخت:** دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی پایتەخت بۆ وڵاتەکانیان بەتایبەتی لە سەردەمی کۆن، لەلایەن سەرکردەی

---

(٤٥) هارفی بورتەر: الموسوعه المختصره، التأريخ القديم، ص٨٣.

گەلانەوە دەستنیشانکردنێکی سەرپێیی نەبووە، بگرە تاوتوێ کراوەو ڕێوشوێنی زۆری بۆ گیراوەتەبەر. لەوانەش لەبەرچاوگرتنی پێوەندیی هەڵکەوتەی جوگرافیی پایتەخت بە ناوچەکانی دیکەی وڵاتەوە و خاکێکی بەپیت و ئاوی سازگاری پێویست و کەشوهەوای لەبار و سەختی و پتەوی شوێنی پایتەخت گرینگی پێ دراوە، تا بەرپەرچدانەوەو بەرگریکردن لە هێرشی داگیرکاران ئاسان بێت، لەهەمان کاتدا گرینگی ئابووریش لە بەرچاو گیراوە.

وا دەردەکەوێت لە هەڵبژاردنی شوێن و جێگەی پایتەختەکەیدا دەیاکۆ ئەو هەموو حساباتانەی لەبەرچاو گرتووە. بەرچاوترینیان لە دیدی میدییەکانەوە، ئەگباتانا ناوەندێکی بازرگانی گرینگ بووە بۆ ئەو کاروانە بازرگانییانەی کە هاموشۆی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان لە (ڕێگەی ئاوریشم)ەوە دەکرد. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، مەملەکەتی تازە پێگەیشتووی مادەکان لە ڕووی جوگرافییەوە کۆنترۆڵی شادەماری بازرگانیی پڕ بەرهەمی ئابووری کردووە، لەڕووی جیۆسیاسی و لەسەر ئاستی ناوچەیی و هەرێمی و جیهانییەوە گرینگی خۆی هەبووە. لەم بارەوە دیاکۆنۆڤ یەژێت: **"گرینگترین ڕێگەکانی کاروانچیان لە ئاگباتانا یەکانگیر دەبوون"**.[٤٦]

لە ئاگباتاناوە ڕێگەی ئاوریشم لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو قەزوین و لەوێشەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بە ئاڕاستەی شاری ڕەغە Raga (الری) نێزیکی تاران، پایتەختی ئەمڕۆی ئێران دەچوو. شاری ڕەغە وێنەی شاری ئەگباتانا خاڵێکی گرینگی بازرگانی بووە، چونکە لە ڕەغەوە دووهەمین ڕێگە بەرەو ڕۆژئاوا دەچوو، سێهەمین ڕێگەش لە قەزوینەوە بەرەو تەورێزو دەشتاییەکان، تا دەگاتە دەریاچەی (ورمێ- Urmi) یا بۆ ئاشوور دەڕۆیشت[٤٧].

ڕێگەیەکی دی بە ئەگباتانادا تێ دەپەڕی، ئەو ڕێگەیە بە (ڕێگەی پاشایەتی) دەناسرا. ئەم ڕێگەیە ئاسیای ڕۆژئاوا بە ئاسیای ڕۆژهەڵاتەوە دەبەستەوە،

---

(٤٦) دیاکونوف: میدیا، ص١٧٣.

(٤٧) عبدالحمید زاید: الشرق الخالد، ص٥٨٤.

لەوێوە پاشاكانی ئاشوور بەرەو ڕۆژهەڵات دەپەڕینەوە، هەر بەو ڕێگەیەدا **دارای سێیەم** لە ساڵی (۳۳۰ پ.ز) لە دەست ئەسكەندەری مەكدۆنی هەڵات، هەر بەو ڕێگەیەشدا ئەسكەندەر پەڕییەوە ڕۆژهەڵات و تا هیندستانی داگیركرد، لە ساڵی (۵۵۰ - ۵۵۱ كۆچی) بە هەمان ڕێگەدا پادشای فارسی **یەزدەگیردی سێیەم،** لە دەست عارەبە موسڵمانەكان بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵهاتات، دیسان عارەبەكان بەهەمان ڕێگەدا پەڕینەوە و گەیشتنە ناوەڕاستی ئاسیا، لە هەمان (ڕێگەی پاشایەتییەوە) هۆلاكۆ بە سوپایەكی پڕ چەكەوە ئاودیو بوو و ساڵی (٦٥٦ ك، ١٢٥٨ز) بەغدای پایتەختی خەلافەتی موسڵمانانی وێران و خاپوور كرد.[٤٨]

لە هەڵبژاردنی شوێن بۆ پایتەختی مەملەكەتەكەی، دەیاكۆ ڕەهەندی جوانیی فەرامۆش نەكردبوو. لەڕاستیدا ڕەهەندی جوانیی بە تایبەت جوانیی سرووشت لە كەسایەتی پێشینانی كورددا، لە دێرزەمانەوە ڕەگی داكوتاوە، ویل دیورانت دەڵێ: **"ئەكباتانا واتا (جێی یەكانگیری ڕێگەكان)، دەكەوێتە ناو دۆڵێكی دیمەن جوان و دڵگیری بەپیت و پاراو بە بەفراوی لوتكەی چیاكان، دیۆسیس- یەكەم پاشایان بوو، یەكەم پایتەختی بنیاتناو بە بارەگەیەكی پاشایەتیی جوانتر ڕازاندییەوە، ئەو بارەگەیە سێیەكی میلێ چوارگۆشە زەوی داگیر كردبوو"**[٤٩].

**چوارەم: كۆشكی پاشایەتی:** لە ئەكباتانای پایتەخت، دەیاكۆ كۆشكێكی گەورەی بنیاتنا. ئەم كۆشكە، كە بەسەر شاردا دەیڕوانی، بوو بە مەڵبەندی پاشایەتی و دەیاكۆی لێ نیشتەجێ بوو. لەم هەنگاوەیدا دەیخواست لە سرووشتی سادەو ساویلكەی خێڵ ڕزگاری بێت و هەنگاو بەرەو پێشكەوتن و شارستانییەت و باڵایی بنێت. دیارە گەنجینەی دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەكەی هێندە پارەو دراوی تێدابوو، بێ ترس و بەزیادەوە بەشی تێچووی بنیاتنانی كۆشكێكی وا گەورە و ڕازاوە بكات. وا دیارە بنیاتنانی پایتەخت و كۆشكی پاشایەتی بەو گەورەیی و ڕازاندنەوە و جوانكارییە،

---

(٤٨) وليام لانجز: موسوعة تأريخ العالم، ٣٥٠/١. الهمداني: جامع التواريخ، ص٢٨١/١-٢٨٣.

(٤٩) ول ديورانت: قصة الحضارة، ص٢/ ٤٠٠.

نامەیەک بوو بێت دەیاکۆ تیایدا دەڵێت، کە مەملەکەتی میدیا و شانوشکۆی ئەم مەملەکەتە هیچی لە دەوڵەتە گەورە و هاوچەرخەکانی کەمتر نییە و سەرکردەکەیشی سەرۆک خێڵ نییە، بگرە سەرکردەی گەل و سەرۆکی میللەتێکە و پاشای مەملەکەتە.

**پێنجەم: دەرچوواندنی فەرمان و یاساکان:** بۆ دووپاتکردنەوەو پێداگری لەمەڕ گواستنەوە لە ڕژێمی خێڵەوە بۆ ڕژێمی دەوڵەت دیاکۆ، بە مەرسوم و چەند یاسایەک پێوەندیی نێوان دەسەڵات و خەڵکی ڕێک خست. لەم بارەوە هیرۆدۆت دەڵێت: بەپێی فەرمانی دەیاکۆ ڕێگە بە کەس نەدەدرا ڕووبەڕوو پاشا ببینێت، بگرە هەر کەسەو داواو خواستی خۆی ڕادەستی نامەبەری تایبەت دەکرد. پێکەنین و تف ڕووکردنە زەوی لە حزووری پاشادا بێ ئەدەبی بوو. لێکدانەوەی هیرۆدۆت بۆ ئەو فەرمان و مەراسیم و یاسایانە ئەوەیە، کە دەیاکۆ ویستوویەتی **"لەلای ئەو کەسانەی کە چاویان پێ ناکەوێت، واخۆی نیشان بدات، کە سرووشتی ئەم لە سرووشتی ئەوان جیاوازە"**.(٥٠)

دەکرا هیرۆدۆت لە ڕوانگەیەکی ترەوە تەماشای فەرمانەکانی بکردایە، وەک هەوڵێکی دەیاکۆ بۆ گواستنەوەی گەلەکەی لە ڕۆشنبیری خێڵ و بەرەڵاییەوە بۆ ڕۆشنبیری شارستانییەت و دیسپلین و بیناکردنی ئاکاری شارستانییەت، تا لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئاکارو نەریتە نوێیەدا دەسەڵات و گەل هەڵسوکەوت بکەن.

**شەشەم: دامەزراندنی سوپا:** لەپێناو پاراستنی مەملەکەتە تازە هەڵچووەکەیدا، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر کەس و لایەنێک، کە نیازی گێچەڵ و شەڕفرۆشتنی هەبێت، دەیاکۆ سوپایەکی پێک هێنا، ئەو هاوسێیەتی ئیمپراتۆرە دڕ و شەڕانگێزەکەی لە بەرچاو گرتبوو، پاشکۆیەتییەکەشی گەرچی ڕواڵەتی بوو، لە باجدان و دیاری سەپێنراودا کورتکرابووەوە، بەڵام پاشکۆیی هەر پاشکۆییە، بۆیە هەمیشە جەختی لەوە دەکردەوە، کە جەنگاوەری میدی لە ڕووی هێز و بوێری و شارەزایی و دیسپلینەوە، هیچی لە جەنگاوەری ئاشووری کەمتر نەبێت.

---

(٥٠) سەرچاوەی پێشوو، ل٢/٤٠٠.

## پرۆژەی ڕزگاری

گرینگی دەسکەوتەکانی دەیاکۆمان بۆ دەرناکەوێت، کە دوای خۆی خشتریت (فراورتیس/ فراورت)ی کوڕی تەواوی کرد، ئەگەر چاوێک بە نەخشە هەرێمایەتییەکەی ڕۆژئاوای ئاسیای نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەی پێش زایندا نەخشێنین. وڵاتی میدیای ئەودەم بە چوار مەملەکەتی بەهێز دەورە درابوو، مەملەکەتەکانیش ئەمانە بوون: لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە مەملەکەتی ماننایی (دیاکۆنۆف بە میتانیا) ناوی دەبا، لە باکوری ڕۆژئاواوە، مەملەکەتی ئورارتۆو مەملەکەتی ئاشوور لە ڕۆژئاوا و مەملەکەتی ئیلام (عیلام) لە باشوورەوە. سەرباری ئەمانەش دەوڵەتی ئیسکیت لە باکوری میدیاو نێزیک بە قەوقازیا، لەو نێوەندەدا ئەوە تەنیاوتەنیا وڵاتی میدیا بوو بەبێ سایە و سێبەری دەوڵەتێکی نەتەوەیی.

دەتوانین بێژین ئەو سەرکردە میدییە، خاوەن پرۆژەیەکی ڕزگاریی گشتگیر بوو، هەنگاو بە هەنگاو خەریکی جێبەجێکردنی بوو، بە شێوەیەکی سەرەکی (ئەو) کاری لەسەر گۆڕینی زەین زهنییەتی میدییەکان دەکرد، ئەم گۆڕانکارییەشی لەسەر پەیکەری دەسەڵاتی ئیداری و پێوەندیی نێوان دەسەڵات و گەل بە کردە چڕ کردبووەوە، چونکە گەورەترین ئامانجی دەیاکۆ ڕزگارکردنی میدییەکان بوو لەژێر زەبرو زەنگ و تەوژمی ئاشوورییەکان، بۆیە دەبووایە ئەو زهنییەتە خێڵەکییە کۆچەرییە، کە لە زۆر کاتدا ئەگەری کەوتنە داوی ساویلکەیی و نائاگایی لەئارادا بووە، پشتگوێ بخات و ئەو زهنییەتە هۆزگەرایە بگوازێتەوە بۆ پێکهێنانی زهنییەتی گەل، زهنییەتی نەتەوە، ئەو زهنییەتە تەنیا لە سایەی دەوڵەتدا پێک دێت و بەرجەستە دەبێت. دەیاکۆ سەرکردەیەکی کورتبین نەبوو، بۆیە (تا ئەسپەکەی نەکڕی، ئاخوڕی بۆ دانەبەست). ئەو، چونکە هەستێکی سەرکردایەتیکردنی تەواوی هەبوو،

دەیزانی چ بابەت پێش ئەویدی بخات و کامە بابەت لەویدی گرینگترە، کامیان سەرەکی و کامیان لاوەکییە. ئەو لە ناوەخۆوە دەستی دایەو بەرەو دەرەوە شەقاوی هەڵهێنا. سەرەتا بناخەی (هێزی خودی) دامەزراند، ئەوسا بەدووی (هێزی دەرەوە)دا گەڕا. پاش ڕێکخستنی کاروباری ناوخۆ، کە هەنگاوێکی سەرەکی گرینگ بوو هاویشتی، ئەم جارە چالاکییەکانی ئاراستەی هەرێمەکانی دەرەوە کرد، ئێمە ئێستە دەزانین ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور پەلوپۆی بۆ وڵاتانی پانوپۆڕ کوتابوو، هەر لە سنووری ئەفغانستانەوە بگرە تا لێوارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست، جار جاریش سێبەری بەسەر وڵاتی میسردا دەکێشا، بۆیە دەبێ بپرسین و بڵێین: چۆن دەوڵەتێکی تازە پێگەیشتوو، کە هێشتا کەلتووری خێڵەکی لە کۆڵ نەبۆتەوە، دەتوانێت بە تاقی تەنیا لە ڕووی ئەم ئیمپراتۆرییەتە خاوەن ئەزموونەدا ڕابوەستێت و ڕووبەڕووی ببێتەوە؟ ئەوی خاوەن سوپایەکی قاڵبوو و توانایەکی ئابووری لەبن نەهاتووی لەبەردەستدایە، دەیاکۆ گەمەیەکی هاوسەنگ و ئاڵۆزو ژیرانەی بەڕێوە دەبرد، لەنێو ململانێی هاوسێکاندا بەو پێوەندییە دژ بەیەکەی نێوان دەوڵەتەکاندا دزەی کردو چووە ژوورەوەو خێڵەکانی وڵاتی میدیای لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتدا کۆکردەوە. سەرەتا خۆی بە پاشکۆی مەملەکەتی مانتایی باکوری ڕۆژئاواوە (ئازربایجان) گرێ دا، تا لەو ڕێگەیەوە خۆی لە دەستدرێژی دەوڵەتەکانی تر، بەتایبەت ئاشوورییەکان بپارێزێت، هاوپەیمانییەتی لەگەڵ مەملەکەتی ئۆرارتۆ لە باکوری ڕۆژئاوا بەست، ئەمەو دەبێ نێزیکایەتی کەلتووری و ئەتنیکی نێوان خێڵەکانی میدی و مانناو ئۆرارتۆمان لەبیر نەچێت.

لە پشت پەردەی ئەو پاشکۆیی و هاوپەیمانییەتەوە، دەیاکۆ خەریکی ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکەی بوو، کاری بۆ بەدەستگاییکردنی پێوەندییەکانی کۆمەڵگەی میدی دەکرد، ئەو شاری ئەگباتانای کردە پایتەخت، تاجی پاشایەتی لەسەر خۆ نا، سوپای دامەزراند، ئالێرەوە ئیتر شتێکی ئاساییە، کە هێزە هەرێمایەتییە مەزنەکان (ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور) لە ئاست پەیدابوونی ئەم مەملەکەتە نوێیەدا، لێدانی

دڵی خۆی بپێوێ، چونکە دەسەڵاتدارانی ئاشوور، لە دەستەمۆکردن و سەرپێشۆڕکردنی خێڵە کوردییەکاندا ئەزموونێکی تاڵیان هەبوو، ئەی ئەوسا چۆن دەبێت گەر ئەو خێڵانە لە سایەی بەیداخی دەوڵەتێکی یەکگرتووی خاوەن سوپاو سەرکردایەتی پێشەوایەکی بوێرو دڵسۆزو خاوەن تەماحی وەک دەیاکۆ گرد ببنەوە؟!

لەم بارەوە دیۆرانت دەنووسێت و دەڵێت: "**ئەو ڕۆژانە لە سایەی ژیانێکی سرووشتی و ئابووریدا، دەست و مەچەکی ئارییەکان لە سەردەمی ئەودا بەهێزتر دەبوو، کاریگەری ژینگەو نەریتەکەیان، کە دان بەخۆداگرتن و بوێرییە ببووە پێداویستی جەنگەکان، بۆیە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا هێزێک باڵای دەکردو مەترسی و هەڕەشەی بۆ سەر ئاشوورییەکان دروست دەکرد. ئاشوورییەکان جار دوای جار هێرشیان بردە سەر مادەکان و وایان دەزانی شکستێکی ئابڕووبەرانەی وایان پێکەوتووە جارێکی تر سەر بەرز ناکەنەوە، بەڵام دواجار بۆیان دەرکەوت ئەم گەلە بۆ دەسخستنی ئازادیی خۆیان لە خەبات و کۆشش کۆڵ نادەن**"[51]

## هەڵگیرساندنی شۆڕش

دوای دامەزراندنی بەرەیەکی ناوخۆیی توندوتۆڵ و یەکگرتوو، لەپێناو بەرەنگابوونەوەی ئاشوورییەکاندا، دەیاکۆ بە دووی هاوپەیمانییەتی هەرێمایەتیدا دەگەڕا، هاوپەیمانگەلێک بەرژەوەندی هاوبەش کۆیان بکاتەوە. سەرەتا مەملەکەتی ئورارتۆی هەڵبژارد، ئەم مەملەکەتە، کە لە باکورەوە هاوسنووری وڵاتی میدیا بوو، لە سەردەستی پاشاکانی ئاشووری ستەمکارو بێبەزەییدا جار لە دوای جار زیاتر دەیناڵاند.

پاش بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ مەملەکەتی ئورارتو، دەیاکۆ شۆڕشی دژ بە ئاشوورییەکانی هەڵگیرساند و سەربەخۆیی مادی ڕاگەیاند، بێگومان لەم بوارەدا چەند هەنگاوێکی کردەیی هاویشت؛ لەوانە ڕاگرتن و نەدانی باج و

---

(51) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢ /٤٠٠.

خەراج و دیاری سەپێنراو و گوێنەدان و پابەندنەبوون بە سیاسەتەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری.

بەپێی بیرکردنەوەی ئیمپراتۆرییانە، ئاسایی بوو ئاشوورییەکان کار بۆ ڕوخاندنی مەملەکەتی مادی دەراوسێ بکەن، لەهەمان کاتدا بۆ دەیاکۆش ڕووبەڕووبوونەوەو بەرپەرچدانەوەی گێچەڵ و پەلامارەکانی ئاشوور کارێکی ئاسایی بوو، ئەم پەلامارو بەرپەرچدانەوە زۆری نەخایاندو سوپای بەهێزی دڕو خاوەن ئەزموونی ئاشوور بە سەرۆکایەتی **سەرگۆنی دووەم** پەلاماری چیاکانی میدیای داو هاوپەیمانێتی ماد- ئورارتۆی تێک شکاند و توانی شکست بە مەملەکەتی ماد بهێنێت، هەر لەو شەڕەدا ساڵی (٧١٥پ.ز) یا ساڵی (٧١٤پ.ز)، دەیاکۆ بە دیلی کەوتە بەردەستی ئاشوورییەکان و بە خۆی و خێزان و دەربارەکانییەوە، پادشای ئاشوور دووری خستنەوە بۆ شاری حەما (هامات) لە وڵاتی سوریا، پاش ماوەیەکی نادیار ئاشوورییەکان دەیاکۆیان وەک دەستبەسەر (دانیشاندنی بەزۆر) گەڕاندەوە وڵاتی ئاشوور.

لەڕاستیدا ئەم نەرمونیانی نواندنە لە ئاست دەیاکۆ بە سرووشتی دەسەڵاتدارانی ئاشوور نامۆیە، چونکە ئەوان فرە خراپ و بێ بەزەییانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەو سەرکردانەدا دەکرد، کە تووشی سەرئێشەی دەکردن و وەک دیلێکی زەلیل بۆ نەینەوایان دەبردن و بەدڕندانەترین شێوە ئەشکەنجەیان دەدان و زمانیان دەبڕین و ئەندامی جەستەیان دەقرتاندن و بەزیندوویی کەوڵیان دەکردن، سەرە بڕاوەکانیان دەکردە سەرنێزە و تیرەکانیانەوە، تا ببن بە پەندو عیبرەت بۆ ئەو کەسانەی بیر لە شۆڕش دەکەنەوە.

پرسیار لێرەدا ئەمەیە: چی ڕێی لە سەرگۆنی دووەم گرت تا بەرانبەر بەو سەرکردە میدییە، کە سوپاکەی سەرسەختانە شەڕی ئاشوورییەکانی کرد، بەدڵڕەقی و دڕندانە ڕفتار نەکات؟! ئەی بۆ تەنیا بە دوورخستنەوەی بۆ سوریا کۆڵی دا؟! لە هەمووی سەیرتر، ئەی ئەوە چ هۆیەک بوو پاڵی بە ئاشوورییەکانەوە نا تا دەیاکۆ بگێڕنەوە بۆ ئاشووری دەراوسێ و هاوسنووری وڵاتی میدیا؟!! ئەم بابەتەو برێ پرسیاری تریش پێویستیان بە

وەڵامگەلێکی دڵنیاکەرەوەو باوەڕپێکراو هەیە. لەم بارەوە ڕاستترە وا بیری لێ بکەینەوە، کە مەبەست لە هێنانەوەی دەیاکۆ و نیشتەجێکردنی لە ئاشووری هاوسێی وڵاتی ماد، ئەوەیە تا لە کاتی پێویستدا هێمنیی وڵاتی میدیای چیایی سەختی پێ بپارێزێت و لە دامرکاندنەوەی توورەیی و ڕاپەڕینی خەڵکە یاخی و عاشقەکەی بە ئازادی، دەیاکۆ کاراکتەری کاریگەر و فاکتەری سەرەکیی بێ، لە هەمانکاتدا هاوپەیمان و پشتگیری سیاسەتەکانیان بێ، بەوپێیە وڵاتی میدیا لە ناوەندی وڵاتی ماننایی و ئورارتۆ و ئیسکیتیا و ئیلامدا هەڵکەوتبوو، ئەم چوار دەوڵەتەش تاوناتاوێک سەریان لە داڕێژەرانی سیاسەت و جێبەجێکارانی ئاشوورییەکان دەشێواند و هەلی لەباریان دەقۆستەوە و لە هاوپەیمانییەتی و پاشکۆیی خۆیان دەدزییەوە.

من لە پشت نەرمونیانی چاوەڕواننەکراوی دەسەڵاتدارانی ئاشوورەوە بۆ دەیاکۆ، هۆیەکی تر بەدی دەکەم، ئەویش گرینگی وڵاتی میدیا - بەتایبەتی ئەکباتانای پایتەختە - بۆ ئابووری ئاشوورییەکان، ئاشکرایە ئەو ڕێگەیەی کە بازرگانەکان هاتوچۆیان پێدادەکرد، هەمان ئەو ڕێگەیە بوو، کە پیاوە ئاینی و دیپلۆماتکارو سوپاکانی پێدا تێدەپەڕی (**بەڵێ بازرگان و کاهین و دیپلۆماتکارو داگیرکەران، هەمان ئاڕاستەیان دەگرتەبەر**)، ئەگەر ئەم ڕاستییە لەبەرچاو بگرین، درک بە پێویستی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور دەکەین بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم ڕێگە بازرگانییە جیهانییە، کە ڕۆژئاوای ئاسیای بە ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتەوە گرێ دەدا، ئەو ڕێگە (ڕێگەی ئاوریشم) بە گەورەترین شادەمار دێتە ئەژمار، بگرە پتر لە مێژووناسێک، (ئەکباتانا) بە (شوێن یەکانگیری ڕێگەکان)و کەرەتێکی دی بە (شوێنی یەکگرتنەوەی ڕێگەی زۆر)[٥٢] ناوزەد دەکرد.

هۆی ئەم ناوهێنانەش لەوەوە هاتووە، چونکە لقێکی سەرەکی لە لقەکانی ڕێگەی ئاوریشم، بە وڵاتی میدیادا بەتایبەت بە ئەکباتانای پایتەختدا گوزەری کردووە. کەواتە کۆنترۆڵکردنی ڕێگەکانی بازرگانی لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست و بەندەرەکانی لەپێناو پێوەندییکردن بە ئەورووپا لە ڕۆژئاواوە

---

(٥٢) ول ديورانت: قصة الحضارة، ٢/ ٤٠٠. طه باقر و آخرون: تأريخ ايران القديم، ص٤٠.

لەلایەک و پشتگوێخستن و کۆنترۆڵ نەکردنی ئەو ڕێگە بازرگانییانەی کە دەیگەیاندنە بازاڕەکانی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەلایەکی ترەوە بە گیلێتییەکی سیاسی بۆ ئاشوورییەکان دەهاتە ئەژمار، خۆ ئەگەر ئەم ڕێگەیە (ڕێگەی ئاوریشم)یان کۆنترۆڵ نەکردایە، ئەوا ئیمپراتۆرییەتەکەی خۆیان تووشی خنکانی ئابووری و لاوازی سەربازی و سیاسی دەکرد، ئەم کردەیەش لە دەسەڵاتدارێتی هیچ ئیمپراتۆرییەتێک ناوەشێتەوە، کە بەردەوام پێویستی بە سوپایەکی گەورەی پڕ چەک و کاریگەر هەیە لەپێناو دەسبەسەرداگرتن و درێژەدان بە هەژموونی تەواوی بەسەر گەلانی هاوسێدا.

گریمانەی ئەوە لەئارادایە، کە دەسەڵاتدارانی ئاشوور، دەیاکۆو دەست و پێوەندەکەی ئازاد نەکردبێت، بگرە لە گەڕانەوەیاندا بۆ ئاشوور، وەک بارمتە خۆی و خێزانەکەی و سەرکردە میدییەکانی هاوەڵی بەکار هێنراون و بۆ جێبەجێکردنی سیاسەت و بەرژەوەندییەکانیان و لە ناوچەکەدا پاڵەپەستۆیان خستوونەتە سەر، بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە، هیچ سەرچاوەیەک شک نابەین باسی لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی میدییەکان و یاخیبوون دژ بە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان لە کاتی دەسبەسەرکردنی دەیاکۆ بکات.

دەیاکۆ بۆ ماوەی پەنجاو سێ ساڵ حوکمی میدیای کردووە، دوور نییە ماوەی دەسەڵاتی کەوتبێتە نێوان ساڵانی (٧٢٧-٦٧٥/ ٦٧٤پ.ز).

(٥)

# پادشا (خەشتریت) ی میدی

## دووەم دامەزرێنەر (ساڵی ٦٥٣ پ. ز مردووە)

### گەشتی ناوەکان

لەپێناو دامەزراندنی (مەملەکەتی ماد)دا، هەوڵ و تێکۆشانی دەیاکۆ بە با نەچوو، ئەو کارەی دەیاکۆ پێڕانەگەشت، (خەشتریت)ی کوڕی بە کۆتای گەیاند.

بەرلەوەی لەم بوارەدا باس لە کۆششی ئەم پیاوە بکەین، لێگەڕێن با چەند قسەیەک لەسەر گرفتی ناو، لە مێژووی کۆندا بکەین. ئەوە گرفتێکە بەبێ جیاوازیی تووشی گشت خوێنەرێکی مێژوو دەبێت، ئەم گرفتە نەک هەر بێزارکەر، بگرە چەواشەکەریشە، بۆنموونە:

* کورد بەم ناوانەوە ناسراوە، (کۆرتەش- kurtash)، کورتیی، کاردۆ، گردا- grda ، کاردۆخی، کوردۆئین، چوڕدیی، ئەکراد.

* میتانییەکان: لقی گەورەی پێشینانی کوردە و بە ئەم ناوانە ناسراون (حورییەکان)و حورییەکانیش بە (هووریی)، (حوریی)، (خووریی) و (خوریی) لە تەوراتیشدا بە (حوییم) و (حووورییم) ناویان هاتووە.

* گووتیەکان: لقێکی گەورەی پێشینانی کوردە و بەم ناوانە ناسراون: (کوتیی)، (جووتیی)، (غووتی)و (جوودیی). بەم شێوەیەش چیای (جوودیی) لە قورئاندا هاتووە، بەو پێیەی ئەم چیایە کەوتۆتە نیشتمانی گوتییەکانەوە.

* ئەزربیجان: لە مێژووی کۆندا بە (ئەلبانیا و ئەترۆپاتیا) ناسراوە.

* فورس: بە (پورس، عەجەم) ناویان هاتووە.
* یۆنان: بە ( گریک، هیللینی) ناسراوە.
*دەریای سوور: لە کۆندا بە ( دەریای ئەرتیریی) ناسراوە.
* قودس: ناوە کۆنەکانی ئەمانەن (یەبووس، ئیلیا، ئۆرشەلیم).
* حەلەب: ناوە کۆنەکانی ئەمانەن: (حەلەبۆ، خەلەب، بەرهوەیە). لەم ڕووەوە نموونەی فرەتر هەس، ئەستەمە بۆ خوێنەری مێژووی کۆن و لێکۆڵەری جوگرافیای کۆن بە باشی لە ڕووداو و کەسایەتییەکان و شوێنەکان تێ بگات ئەگەر لەتەک ناوەکاندا گەشتێک نەکات و لەو گۆڕانکارییانە نەگات، کە لە سەدەکاندا بەسەریدا هاتووە، ئەو گۆڕانکارییانەش بەرئەنجامی بڕێ شتن، کە گرینگەکانی ئەمانەن:
* جیاوازی دەنگەکان لەنێوان شێوەزاری یەک زماندا بۆ نموونە: (کوردیی kordi، کردی kirdi، چوردییchordi، لە زمانی عارەبیدا).
* جیاوازیی شێوەکان لەنێوان زمانەکاندا، نموونە (ئەخمینی akhmanish لە عارەبیدا بە (عەجەم) ناوزەد کراون و ئەم ناوانەش بەسەر دانیشتوانی وڵاتانی فارس دابڕاوەو پاشان بەسەر گشت کەسە ناعارەبەکاندا گشتێنراوە.
* ناولێنانی سەرتاپای گەلێک بە ناوی خێڵ یاخۆ کەسێکەوە، بۆ نموونە عیبرییەکانیان ناونا (ئیسرائیل)، ئیسرائیلیش نازناوی پێغەمبەری جووەکان (یەعقوب) بووە.
* سەپاندنی ناوێکی نوێ بەسەر ناولێنراوێکی دێریندا، بۆ نموونە: عارەب (دوورگەی بۆتان)یان ناو نا، دوورگەی کوڕی عومەر، هۆسمانییەکان (ئامیدانۆ/ ئامەد)یان ناو نا، دیار بەکر. ئەوان ئەم شێوەیان لە ناوی (دیاربەکر) خواست، کە کاتی خۆی عارەبەکان ناوچەکەیان بەم ناوە ناساندبوو نەک شاری دیاربەکر، بەڵگەش بۆ ڕاستی و دروستی ئەم بۆچوونەمان ناوی (ئامەد ـ ئامێد) خراوەتە پاڵ ناوی ئەو زاناو بیرمەندانەی بەر لە سەردەمی هۆسمانییەکان نازناوی (ئامیدی) بووە، نەک (دیاربەکریی ـ دیاربەکرلیی)، دیارترین نموونە: ڕەخنەگری گەورە (ئەبولقاسم ئەلحەسەن بن

بیشری ئەلئامیدی) لەدایکبووی (٣٧٠ک/ ٩٨٠ز) خاوەن کتێبی ڕەخنەیی ناسراو (هاوتاسازیی لەنێوان شیعری ئەبی تەممام و بوحتەری)دا.

**میراتی قورس**

قسەکانی پێشوومان بۆ ناوی (خەشتریت) ڕاست لە جێی خۆیدایە، بۆیە ئەشێت بە (خاشتریت) گۆ بکرێ، لە هەردوو بارد او لە کوردیدا واتای (چالاکترین و بەختەوەرترین) دەگەیەنێت. دەبێت لە بیرمان نەچێت، کە زمانی کوردیی هاوچەرخ گەلێ لە شێوە و دەنگی میدیایی کۆنی لەخۆگرتووە، ئەوەتا ناوی زۆرمان بەرچاو دەکەوێت، کە بە بڕگەی (خاش) دەست پێدەکات، ئەم حاڵەتەش لە ناوی ناودارانی میدییەکان بەتایبەتی و کورد بەگشتی دەبینرێ، وەک: کەیخوسرو، کە عارەب بە (کسرا) گۆی دەکات و ئەشێت لە بناخەدا (کەی خشروە/ خاشرو/ خاش – ڕوو (پاشای بەختەوەر) بووبێت، ئەگەر (ڕوو– Ro )، کە واتای (ڕوومەت، ڕووخسار) دەبەخشێت بە Ru گۆ بکەین، ئەوا واتای خشڕوو (ڕووخۆش) دەگەیەنێ، ناوی (خۆشناڤ– خۆشناو) khoshnav نموونەیەکی زەقی کوردییە، کە زۆر کەڕەت شێوەگەی (خووش) (خاش)، کە دەنگەکانی لە زمانی کوردیدا جێگۆڕکێیان پێ دەکرێت، لە برێ سەرچاوەدا، (خەشتریت) بووەبە گەشتریتی و خۆشاتریتا khshaturitd ، ئەگەر بڕوانینە نووسین و نەخشەکانی چیای بەهەستوون (بێستوون)، کە لە سەردەمی سێیەمین مەلیکی ئەخمینی، دارای یەکەم ( ٥٢٢–٤٨٠ پ.ز) هەڵکۆڵراوە، ئەو ڕاستییەمان بەرچاو دەکەوێت. لە برێ سەرچاوەدا دەبینین، کە هیرۆدۆت بە (فراووریس) phraortes ناوی دەبات و جارجاریش بۆ (فرورتیش) دەگۆڕێت. برێ لە وەرگێڕە عارەبەکان بە شێوەی (فراورتیس) نووسیویانەو کەسانی دیکەیش بە (براورتیش/ برائورت) ناویان بردووە. دیاکۆنۆف بە (براورتیش/ فرائورت)ی نووسیوە، بەڵام ئێمە بەباشترمان زانی ناوی ئەم پاشایە بە شێوە میدییەکە (خەشتریت) گۆی بکەین، چونکە (خەشتریت) ڕەسەنترو هاسانترە.

زۆرینەی ئەو سەرچاوانەی کە باسیان لە ژیاننامەی ئەم پاشایە کردووە، بە کوڕی پاشای میدی (دەیاکۆ)یان لە قەڵەم داوە، کەچی دیاکۆنۆڤ، بە

نەوەی دەیاکۆی دەزانێت. خۆ ئەگەر چاوێک بە پەیژە زەمەنییەکەی سەردەمی هەریەک لە دەیاکۆو خەشتریتدا بخشێنین و بەجێگەیاندنی ئەرکە قورس و زۆرو زەوەندەکانی خەشتریت لەبەرچاو بگرین، بۆمان ساغ دەبێتەوە، کە ئەو کوڕی دەیاکۆ بووە نەک نەوەی.

بە بۆچوونێکی تر ئەگەر بێژین، ئەو پیاوەی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازیدا، ئەو هەموو ئەرک و کارە گرینگانەی ڕاپەڕاندووە پیاوێکی کامڵ و پێگەشتوو و خاوەن ئەزموون بووە، نەک گەنجێکی هەرزەکارو سەرکردە و سیاسەتمەدارێکی تازە پێگەشتوو.

بەرایی گوتمان: دەیاکۆ سەرکردەی میدییەکان، یەکەم کەس بوو دەنگی هۆزەکانی وڵاتی میدیای یەکخست و یەکەم کەس بوو بەوپەڕی پشوودرێژی و وریاییەوە، بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگەی میدی لە ڕژێمێکی خێڵەکی (گوند-دەوڵەت)ەوە بۆ ڕژێمێکی دەوڵەتی یەکگرتوو بەرگریکار، سەرسەختانە بۆ بنج داکوتانی ئاگایی دامەزراوەیی لە زهنییەتی مرۆڤی میدیدا کاری کردووەو تێکۆشاوە.

ئەو درکی بەو ڕاستییە کردبوو، کە زهنییەتی خێڵەکی تەسک و دەمارگیر ناتوانێت کۆمەڵگەیەکی شارستانی پێکەوە بنێت، جا خاوەنی ئەو زهنییەتە خێڵەکییە با نەترس و سوارچاک و قوربانیدەر بێت، هەرگیز ناتوانێت بەرەنگاری دەزگە و دامەزراوەکانی دەوڵەتێکی ناوەندی بەدەسەڵات و خاوەن بڕیار بێتەوە، دەسەڵاتێکی خاوەن توانای باڵا، گشت سەرچاوەکانی مادی و هێزی مەعنەویی خۆی لە پێناو گەیشتن و پێکانی ئامانجە دیاریکراوەکانی دەخاتە کار.

## به کۆتاگەیاندنی پرۆژەی ڕزگاری

ساڵی (٦٧٥- ٦٧٤پ.ز) دەیاکۆ مردو خەشتریتی کوڕی دەسەڵاتی گرتە دەست، هیچ زانیارییەک لەمەڕ ئەم پیاوە لە سەردەمی باوکیدا لەبەردەستدا نییە. لەم بارەوە دیاکۆنۆف دەڵێت: لە سەردەمی دوورخستنەوەی باوکیدا، خەشتریت لە وڵاتی ئاشوور پەروەردە بوو، ئەم مێژوونووسە درێژە بە قسەکانی دەداو یەژێت: **"ئاشوورییەکان بڕوایان وابوو ئەمیش دەسەڵاتدارێکی سەر بە ئەوان دەبێت و بەپێی بەرژەوەندی ئاشوورییەکان سیاسەت دەکات، چون ئەو کەسانەی لە ڕابردوودا خۆیان پەروەردەیان کردبوون، لەدواییدا پاشاو دەسەڵاتداری گوێڕایەڵیان لێ پەیدا بووە"**[٥٣]

لەودەمەدا پاشای ئاشوور، سەرگۆنی دووەمII sargon(722-705 پ.ز) دەمرێت و سەنحاریبی sennacherib (704-680پ.ز) کوڕە جێگرەوەی بە دەستی یەکێک لە کوڕەکانی دەکوژرێت و کوڕی دووەمی بە ناوی ئەسرحەدوون esehddon (680-669پ.ز) دەسەڵات دەگرێتە دەست. وادیارە ئەم گۆڕانکارییە لە پێوەندییە سیاسیە هەرێمایەتییەکەدا، خەشتریتی هان داوە تا لە ڕێکەوتنەکانی نێوان باوکی و دەسەڵاتدارە ئاشوورییەکان پاشگەز ببێتەوە، خۆ دووریش نییە هەر خۆی فاکتەرێکی کاریگەرو یارمەتیدەری ئەو گۆڕانکارییانە بووبێت، چونکە بڕوام نییە خەشتریت پەروەردەی بندەستی دەیاکۆی باوکی، ئەو سەرکردە بەتواناو بوێرو ژیرە خاوەن ئارزووەو کۆڵنەدەرە لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز خەمساردیی نواندبێت لە جێبەجێکردنی پرۆژە ڕزگاریخوازەکەی باوکی و لەو پێناوەدا خاوەخلیچک بووبێت.

زانراوە، کە تا بە ئەمڕۆمان دەگات زۆرینەی زانیارییەکانی تایبەت بە مەملەکەتی میدیاو شۆڕشی ڕزگاریخوازی ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەی لە ڕۆژئاوای ئاسیا لە بن داروپەردوو و وێرانەی قەڵاو شارەکانی میدیای ناوەنددا بزرو شاراوەیە، ئەم دۆخەش جێی گلەیی و داخی زۆرینەی ئەو

---

(٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٥.

کەسانەن، کە بە دووی مێژووی میدییەکانەوەن، بۆیە هەر بۆشایی و چاڵ و چۆڵییەکمان دێتەڕێ، بە گریمانەو ئەشێ گونجاو لەگەڵ لۆژیکی قەوماوەکانی ئەو سەردەمەدا دەکرێت پڕی بکەینەوە، یەکێک لەو قۆرتانەی لەپڕێکدا دێتە ڕێمان هاوپەیمانێتی خەشتریتە لەگەڵ بڕێ لە سەرکردە دراوسێکان و هەڵگیرساندنی شۆڕشە دژ بە ئاشوورییەکان، لەکاتێکدا هەمان سەرچاوە، بەتایبەت هیرۆدۆت، بە دوورو درێژی بەر لە هەنگاونانی بۆ دەرەوەی سنوور و بانگەشەی سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە ئاشوور باس لەو هەنگاو و کارانەی خەشتریت دەکات، کە لەسەر ئاستی ناوەخۆ هاوێشتوونی و بە ئەنجامی گەیاندوون.

بڕوا ناکەین خەشتریت، ئەو سەرکردە ژیر و وریایە پاشاگەردانی و بێ سەروبەری میدییەکانی لەناوخۆدا پشتگوێ خستبێت و هەڵپەی دۆزینەوەی هاوپەیمانی کردبێت و پەڵەی بەستن و گرێدانی پەیماننامەی لەگەڵ دەرەوەدا دابێت و دژ بە ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور دەستی دابێتە شۆڕش. لۆژیکی ڕووداوەکان وا دەخوازێت بڵێین: خەشتریت خۆی لەناو کۆمەڵگەیەکی بڕێ گەورەو یەککرتوودا بینیوەتەوە، ئەو کۆمەڵگە یەککرتووەی کە دەیاکۆی باوکی کۆڵەگەی دامودەزگاو دامەزراوەکانی داکوتا. ئاشکرایە ئەو قەوارە سیاسییەی کە دەیاکۆ بناخەی بۆ دانا قەوارەیەکی سیاسی ناوەندیی نەبوو، بگرە قەوارەیەکی یەککرتووی نێوان هۆزە میدییەکان بوو، (بە زاراوەی باوی ئەمڕۆ پێی دەگوترێت، قەوارەی فیدراڵی).

لەو قەوارە سیاسییەدا ئەنجومەنێک لە سەرۆک هۆزەکان پێک دەهات و سەرۆکێکی ژیرو پێگەشتوو و شارەزا بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری ئەنجومەنەکە هەڵدەبژێردرا.

پاش هاتنەوەی دەیاکۆ لە مەنفاو سەرلەنوێ دەستبەکاربوونی، وادیارە قەوارە فیدراڵییەکەی میدیا هۆشی بەبەرخۆدا هاتبێتەوەو بگرە بەهێزتریش بووبێت، چونکە گومانی تێدا نییە، کە دەیاکۆ دوور لەبزواندنی هەست و تووڕەکردنی ئاشوورییەکان بەوپەڕی وریایی و کپییەوە کاری بۆ بەهێزکردنی قەوارە سیاسییەکە کردووە، مادام دەیاکۆ بەڵێنی بە

ئاشوورییەکان داوە، کە ڕێ لە ئاژاوە دەگرێت و هێمنی دەپارێزێت، دەکرێ بڵێین لەو کاتەدا یەکگرتوویی و بەهێزبوونی ئەو قەوارە سیاسییە لە بەرژەوەندی ئاشوورییەکانیشدا بوو بێت.

کەواسا بۆ ئەودەمە، باشتر وابووە ئەو قەوارە سیاسییە وەک خۆی هەیە بمێنێتەوە، نەک بە یەکجاری شیرازەی بپچڕێت و تێک بچێت، چونکە لە حاڵەتی پارچە پارچەبوونیدا، وەک ئەفسانە یۆنانییەکە دەڵێت: دەبێت بە (سندووقێکی تەماتە)و ماری لەبندا دێتەدەر، ئەو کات مارەکان بە جەستەی ئیمپراتۆرە ئاشوورییەکەوە دەدەن و پەکی دەخەن.

نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت، کە دەیاکۆ سەرکردەیەکی ئاسایی نەبووە، بگرە ئەو بە سەرکردەیەکی ئیستراتیجی پلە یەک دەژمێردرێت. بەڵێ ئەو بە سەرکردەیەکی خاوەن پرۆژەی ڕاچڵەکێنەری وریاکەرەوە و ڕزگاریخواز و سەرتاپاگیر لە قەڵەم دەدرێت. ڕاستە بارە هەرێمایەتییەکە یارمەتیدەری نەبوو تا هەموو ئامانجەکانی خۆی بپێکێت، ئامانجی ڕزگاربوون لە بندەستیی و گەشتن بە سەربەخۆیی، بەڵام لە مێژووی مرۆڤەکاندا بەڵگەی زۆر هەن پێماندەڵێن: خاوەن پرۆژە گەورەکان بەتایبەتی ئەو پرۆژانەی کە گۆڕانکاریی ستراتیجی و گەوهەری لەخۆدەگرن، لە یەکەمین شکستدا دەسبەرداری پرۆژەکانیان نابن، بگرە دەزانن چۆنچۆنی سوار پشتی شەپۆل دەبن، یان لە کاتی پێویستدا پشتی بۆ دادەنوێنن و بەردەوام دەبن لە چاندنی تۆوی سەرکەوتن و ڕزگاری لە دڵ و ئەقڵییەتی گەلەکەیاندا بەردەوام دەبن لە گەشەپێدانی ئەو دامەزراوانەی کە دەستەبەری پاراستنی پرۆژەکە دەکەن و چاوەڕوانی هەلێکی لەبار دەبن تا بیقۆزنەوە و بگەنە ئامانج.

## هاوسەنگییە هەرێمایەتییەکان

لەم ڕووەوە شتێک نییە ڕێگەمان لێ بگرێت تا چاوەڕوانی خێر لە سەرکردەی مەزنی میدی و خەشتریتی کوڕ و جێنشینی نەکەین، کوڕێک لە سایەو سێبەری باوکێکی واداو لەژێر چاودێری ئەو پێشەوا مەزنەدا پەروەردە بووبێت، کوڕێک لەتەک باوکیدا هاوبەشێکی سەرەکی بووبێت لە بەرەوپێشچوونی پرۆژەی ڕێنیسانسە میدییەکەداو لەپێناو توندوتۆڵکردنی بەرەی ناوخۆی کۆمەڵگەی میدیدا خەباتی کردووەو کۆشاوەو کۆمەڵگەو دامەزراوە دەوڵەتییەکانی ئامادە کردووە تا لە قۆناخی نەخشە و پلانەوە پرۆژە ڕاچڵەکێنەرە ئازادیخوازەکە بگوازێتەوە بۆ قۆناخی گەشە و جێبەجێکردن، ئەوا ئەو کوڕە هیچ گومانێکی خراپی لێ ناکرێت.

بێگومان، ئەو گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە بەبێ گونجاندنی بارە هەرێمایەتییەکە و هاوپەیمانیی بەستن لەگەڵ هێزە ناوچەییەکاندا، ناتوانێ پرۆژەکەی بپارێزێت و جێبەجێی بکات.

ئابەو شێوەیە خەشتریت قۆڵی لێ هەڵماڵی و لەژێر سەرکردایەتیی خۆیدا زۆرینەی زۆری هۆزە میدییەکانی یەکخست. خەشتریت بەوەوە ڕانەوەستاو بڕێ هۆزی تری بۆ لای خۆی ڕاکێشا. گرینگترین ئەو هۆزانەش ئەمانە بوون: سیمیرییەکان (کیمرییەکان- Cimmerians)و (ئیسکیت – scytuians)، ئەمەو هۆزە فارسەکانی ڕۆژهەلاتی باشووری ئێران، ئەوانەی کە لە سەدەی هەشتی پێش زاین نیشتەجێی ئەو دەڤەرە بوون، بۆ لای خۆی ڕاکێشاو کردنی بە پاشکۆی خۆی. هیرۆدۆت دەڵێت: کاتێ خەشتریت دەسەلاتی گرتە دەست پەلاماری پارس (فارس)ەکانی داو شەڕی کردن. هیرۆدۆت ئەم شەڕو پەلامارەمان وا بۆ لێک دەداتەوە: " **فراورتیس تەنیا بە مەملەکەتێکی میدی پەتی دڵی دانەکەوت، بۆیە سوپایەکی بەهێزو بەهەڵمەتی ئاراستەکردن و**

**پەلاماری دان، ئەو دەیزانی چۆن شەڕیان دەکات، بۆیە بەئاسانی دەستی بەسەر ولاتەکەیاندا گرت و ملکەچی میدییەکانی کردن**"[٥٤].

دیاکۆنۆڤ لە زاڵبوونی خەشتریت بەسەر فارسەکاندا بە گومانە، کەچی بۆ پشتڕاستکردنەوەی گومانەکەی بەڵگەناهێنێتەوە.[٥٥]

لەکاتێکدا سەرچاوەی هەڵێنجانی زانیارییەکانی هیرۆدۆت، وەک خۆی دەڵێت: فارسە باوەڕپێکراوەکان (الفرس الثقات) بووە.

ئێمە بڕوامان بە ڕاست و دروستی قسەکانی هیرۆدۆت هەیە، چونکە لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە فارس هاوسنووری میدییەکان بووە، لەکاتێکدا خەشتریت بڕیاری پەلاماردانی ئاشووری لە ڕۆژئاواوە دابێت، بۆ پاراستنی پشتی خۆی و مەملەکەتەکەی لە خەنجەری فارسەکان، ئەوا ئاساییە ئەو هەنگاوەی هاویشتبێت و ولاتی فارسی داگیر کردبێت، هەر ئەم بۆچوونەش ڕاستە، بۆیە لەدواییدا ڕێک وای کرد.

لەم بارەوە هیرۆدۆت دەڵێت: " **لەو دەمەدا فراورتیس بوو بە پاشای دوو گەلی خاوەن توانا و بەهێز، پاش ئەم سەرکەوتنە مەزنە، بۆ دەسبەسەراگرتنی ئاسیا لە هەموو هێرش و پەلامارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەبەردەم زەبروەشاندنیدا ولات دوای ولات بەلادا دەهات و دەڕووخا، لەکۆتاییدا پەلاماری ئاشوورییەکانی دا**"[٥٦].

لە سەردەمی حوکمڕانی جێگرەوەی دووەمی سەرگۆنی دووەم، پادشا سەنحاریب (٧٠٤-٦٨٠ پ.ز) بە هۆی سەرقاڵبوونی بە دامرکاندنەوەی ئاژاوە و یاخیگەرایی لە ولاتی بابل و ئیلام و سووریا[٥٧]، پاڵەپەستۆی ئاشوورییەکان لەسەر ولاتی ئاریان (ئێران) کزوکەم و لاواز بوو، ئیتر هەلێکی لەبار بۆ پاشای مادەکان هاتبووە ئاراوە، بۆیە لەو قۆناخەدا خەشتریت دەسەڵاتی تەواوی خۆی بەسەر ولاتی میدیادا دەکێشێت.

---

(٥٤) هیرۆدۆت: تأریخ هیرودوت، ص٨٠

(٥٥) دیاکۆنۆف: میدیا، ص٢٦٢

(٥٦) هیرودوت: تأریخ هیرودوت، ص٨٠ ، مەبەست لە آسیا: ڕۆژئاوای ئاسیایە.

(٥٧) طه باقر وآخرون: تأریخ ایران القدیم، ص٣٩.

لە سەردەمی دەسەڵاتی پادشای ئاشووری ئەسەرحەدون (٦٨٠-٦٦٩ پ.ز)ی جێنشین و کوڕی سەنحاریب، دەسەڵاتی مادەکان بەردەوام بەهێزتر دەبوو، لەپاڵ ئەو بەهێزبوونەدا، جۆرە هاوپەیمانێتییەک لەنێوان مەملەکەتی ئاشوورو چەند میرێکی ئارییدا هاتە ئاراوە.

گرێدانی ئەم هاوپەیمانێتییە، لە ناوەڕۆکی دەقی ئەو پەیمانە سیاسییەدا هاتووە، کە لەنێوان ئەسەرحەدون و سەرەک هەرێمەکانی پاشکۆی ئیمپراتورییەتی ئاشووردا مۆرکراوە، ئەودەمەی کە دەسەڵات ڕادەستی ئاشووربانیباڵی کوڕی Ashurbanipal دەکات.[٥٨]

## شۆڕشە مەزنەکە

لەپاڵ خۆئامادەکردنیدا بۆ بەرپاکردنی شۆڕش بەسەر دەسەڵاتی ئاشووردا، سەرەتا خەشتریت لەگەڵ دوو سەرکردەی هاوسێدا ئەوانیش (مامی تیارشۆ)ی خاوەن وڵاتی مادای و (دوسانتی) خاوەن وڵاتی ساباردا، هاوپەیمانێتی گرێ دا. دیاکۆنۆف دەڵێت: ئەم دوو هاوپەیمانە بە ڕەگەز میدیی بوون. بەم واتایە بێ، ئەم دوو هاوپەیمانە حوکمی دوو ناوچەیان دەکرد، بەڵام لە وڵاتە یەکگرتووەکەی دەیاکۆدا ڕێک نەخراون،[٥٩] هەر سێ سەرکردە پێکەوە لەیەک کاتدا دەستیان دایە چالاکی و کارکردن و لەپێناو بەدەستهێنانی هێزی زیاترو گوشاری هەرێمایەتی زۆرتردا لەگەڵ مەملەکەتی ئیسکیت و مەملەکەتی ماننایدا هاوپەیمانێتییان گرێ دا.

بەم هاوپەیمانێتی و هەنگاوە گرینگە، ئەو بڕوایەیان لاپەیدا بوو، کە ئیتر هێزێکی وایان پێک هێناوە، دەتوانێت ڕووبەڕووی سوپای ئیمپراتۆری ئاشووری ناسراو بەهێزێکی سەرکێش و سەرەڕۆ، ببنەوە[٦٠].

لە مانگی نەورۆز / ئازار/ مارسی ساڵی (٦٧٣پ.ز) و بە سەرکردایەتیی خەشتریت، مادەکان ڕاپەڕین، ئەمەش هێمایە بۆ ئامادەباشی تەواوی

---

(٥٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص.٣٩.

(٥٩) دیاکۆنۆف: میدیا، ص٢٥١-٢٥٧.

(٦٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥١.

خەشتریت بۆ شۆڕشێک، کە لە سەردەمی باوکییەوە کاری بۆ کردووە، بەم هەنگاوەش هەموو شتەکانی سەراوژێر کردەوە، دیاکۆنۆف دەڵێت: "میدییەکان گەمارۆی قوللە و قەڵای ئاشووریان دەدا، ئەمەش سەرنجراکێش بوو، ئەم گەمارۆدانە هێمابوو بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین نەک جەنگ و کوشتار، ئەم شۆڕش و ڕاپەڕینەش ستراتیجییەت و هونەرەکانی جەنگی لەپشتەوە بوو، بۆ نموونە ئەو سوپایە، کە گەمارۆی قەڵای کیشۆی مەڵبەندە گرینگەکەی ئاشووریان دا، ئەو سوپایە نەبوو، کە سەردەمانێکی زوو خۆی لەپێش سوپای ئاشووریاندا نەدەگرت و لەترسا گوندەکانیان چۆڵ دەکرد و لە چیاکاندا خۆیان حەشار دەدا.

لەڕاستیدا ئەو ئەزموونەی کە ئارییەکان لە شەڕە یەک لەدوای یەکەکاندا فێری ببوون، لەوکاتەدا بە ڕۆشنی بەدیار دەکەوت، ئەگەری ئەوەش لەئارادایە، کە خشتریت تاکتیکە نوێیەکانی شەڕی لە هاوپەیمانە بیابانشینەکەیەوە فێربووبێت، تاکتیکی نوێی تیرهاویشتن و ڕاهێنانی سوارەکان بۆ شەڕ و سوارچاکی و ڕمبازێ (غارغارێن) و گەلێ هونەری دیکەی شەڕ.

بەم شێوەیە ئاشوورییەکان قەڵاکانیان چۆڵ کرد و هەڵهاتن و خۆیان شاردەوە، لەکاتێکدا سوپای ئاشووری ئەو دەمە بەبوێری و هێز و توانا و پڕچەک ناسرابوو"[61].

لەنیوەی مانگی نیسان و سەرەتای مانگی ئایاری ساڵی (٦٧٣پ.ز) هاوولاتییە میدییەکانی دانیشتووی میدیای ناوەند ڕاپەڕین و پەلاماری قەڵاکانی ئاشووریان داو گەمارۆیان دان. شۆڕشگێڕەکان کۆڵیان نەدا، تا سەرتاپای وڵاتی پانوبەرینی میدیایان ڕسگار کرد.[62]

دیاکۆنۆف دەڵێت: ساڵی (٦٧٣پ.ز) و لە کاتی بەرپابوونی شەڕ لەنێوان ئاشوورییەکان و ئارییەکاندا و لە شەڕی پاش ئەویش، کە لەنێوان ساڵی (٦٢٥-٦١٥پ.ز) هەڵگیرسا، ئەوە تەنیا مەملەکەتی میدیا نەبوو لە پێناو ڕزگاریدا ڕاپەڕی، بگرە دەوڵەتۆکە و مەملەکەتە گچکەکانی دیکەی ناوچەکە،

---

(٦١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٠، ٢٥١، مەبەست لە (بیابانشین)، ئیسکیتە.

(٦٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٢.

که پاشان به ناوی میدیاوه ناسرا، له پێناو ڕزگاریدا دەستیان دایه شۆڕش و ڕاپەڕین و دایانه پاڵ مەملەکەتی میدیای بناخەدانەری ئەو دەمە[٦٣].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، که دەیاکۆ و خەشتریت پرۆژەی سەرهەڵدان و ڕزگارییان لەنێو نەتەوەکانی تری میدییدا بڵاوکردبووەوەو گشتاندبوویان، بۆیه ئەو پرۆژەی ڕزگارییه ببوو به داوایەکی جەماوەری گشتی.

پشت ئەستوور بەم هەلومەرجه خوودی و بابەتییه، پاشا وێرای بڕیار بدات و هێرش بکاته سەر نەینەوای پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری و دەسەڵاتی ئاشوورییەکان ڕابماڵێت، بەڵام دەسەڵاتداران، خاوەن ئەزموونی دووروودرێژی ئاشوورییەکان، زانییان چۆن ڕووبەڕووی ئەم باره ترسناکه ببنەوە، که تووشی بوون، ئەوان دەیانزانی، که باشترین ڕێگه بۆ لەباربردنی هێرشی میدییەکان تێکدانی هاوپەیمانێتی میدییەکان و مەملەکەتەکانی هاوسێیانه، بۆیه بڕیاریان دا، سوپاو هێزی میدییەکان به دوشمنگەلێکی به تواناو شڕەتەوە سەرقاڵ بکەن، ئەو هێزەش ئیسکیتەکان بوو.

ئیسکیتەکان هاوپەیمانی سیمرییەکان (کیمرییەکان)ی کۆنه دوشمنیان بوو. هەر ئەوان بوون وڵاتی ئاشووریان وێران کرد، هەروەها زۆرینەی شارەکانی ئاسیای بچووک و باکوری سوریا و فینیقییەیان کاول کرد و دەستیان گەیشته دیمەشق و فەلەستین[٦٤]، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئاشوور ئیسکیتەکانیان دەسەمۆکرد و تێکەڵ به ڕیزی خۆیانیان کردن و بۆ بەهێزکردنی هاوپەیمانێتی ئاشوور– ئیسکێت، پاشای ئاشوورییەکان (ئاشووربانیپاڵ)، کچێکی خۆی له مادیا (مادیس- madyes)ی کوڕی بارتاتوا ( پرۆتۆتی- partatua) مارەکرد[٦٥].

---

(٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٨.

(٦٤) طه باقر وآخرون: تأريخ ايران القديم، ص٤٠.

(٦٥) دیاکونوف: میدیا، ص٢٦٠.

## نوشستی (تێکشکان)

ئاشوور بانیپاڵ بڕیاری تێکشکاندنی هاوپەیمانێتی میدی- مانتایی وەرگرت و جاڕی شەڕی مانتایی دا. ئەو دەمە مەملەکەتی مانتایی بە مەملەکەتێکی بەهێز و گرینگ هەژمار دەکرا[٦٦]. ململانێی ئاشووری- مانتایی دەستی پێ کرد. (ئەخسیریی) پادشای مانتایی هەوڵی دا لە شەودا هێرش بکاتە سەر سوپای ئاشوورییەکان و لەناویان ببات، بەڵام هێرشەکەی شکستی خوارد و ئەخسیریی ناچار بە پاشەکشە کرا. دواجار ئاشوورییەکان پایتەختی مەملەکەتی مانتایی ئیزیرتا (سەقزی ئەمڕۆی باشووری دەریاچەی ورمێ)یان داگیرکرد.

لە نووسینەکانی ئاشوور بانیپاڵ، بۆمان دەردەکەوێت، کە هاووڵاتیانی مەملەکەتی مانتایی بۆ پشتگیری مەملەکتی میدیا ڕاپەڕینێکی جەماوەرییان ئەنجام دا، بەڵام لەکۆتاییدا پاشای مانتایی (ئەخسیریی) سەری بۆ پاڵەپەستۆی ئاشوورییەکان شوڕ کردو چۆکی بۆ ئاشوور پانیپاڵ داداو جاڕی پاشکۆیی دایە بای گوێی خەڵکەکەدا، بەڵام شۆڕشگێڕەکان نەک هەر ملیان بۆ نەدا، بگرە پاشا ئەخسیرییان کوشت و لەسەر چیایەکەوە تەرمەکەیان فڕێدایە خوارەوە. هەمان کات ئەو نەجیبزادانەشیان کوشت، کە پشتگیرییان دەکرد، بەرئەنجام (ئەوالی) کوڕی پاشای مانتایی هاوپەیمانی لەگەڵ ئاشوور بانیپاڵدا بەست و بۆ سەلماندنی نییەتپاکی کچەکەی خۆی بە دیاری بۆ نارد. سەرەڕای نواندنی ئەو هەموو نییەتپاکییە، بانیپاڵ باج و خەراجی بەسەر گەلی مانتاییدا سەپاند.

لێرەدا پرسیارێکی گرینگ دێتە ئاراوە، کە ئەمەیە: کاتێک ئاشوورییەکان هێرشیان بردە سەر مەملەکەتی مانتایی، خەشتریت لە کوێ بوو؟ ئەی بۆ بە هانای هاوپەیمانەکەیەوە نەچوو؟ بەداخەوە لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژووییدا وەڵامی تەواوی ئەم دوو پرسیارە دەست ناکەوێت، بەڵام هیچ دور نییە، بە

---

(٦٦) هەمان سەرچاوە، ل٦١ .

فیتی ئاشوورییەکان خەشتریت و سوپاکەی لەسەر سنووری ئاشوور- ماد بە شەڕی ئیسکیتەکانەوە خەریک بووبێت.

گرینگ ئەوەیە خەشتریت هاوپەیمانێکی بەهێزی لە دەست چوو و سەنگەری شۆڕش و هاوپەیمانێتی بۆ کلکایەتی و خزمەتکردنی ئاشوورییەکان گواستەوە.

لەو دەمەدا میدییەکان بە تاقی تەنیا ڕووبەڕووی هێزە زەبەلاحەکەی ئاشوورییەکان بوونەوە.

دیاکۆنۆف گریمانەی ئەوە دەکات، کە هیچ دوور نییە پاشاکانی مانتایی یارمەتییان لە ئیسکیتەکان پێ گەشتبێت، ئەم کردارەش بۆ هەریەک لە مادەکان و ئیسکیتەکانی دانیشتووی باشوور مایەی بێزاریی بووە[٦٧].

بەم شێوەیە دەسەڵاتدارانی ئاشوور دەستیان بەسەر مەملەکەتە هاوپەیمانەکانی خەشتریتدا گرت و پاشاکانیان بە زەلیلی و سەرشۆڕی ناچار کرد. بانیاپاڵ بەوەشەوە نەوەستا و فەرمانی بە ئیسکیتەکان کرد تا لەپشتەوە بە سەرکرادیەتی مادای کوڕی بارتاتوا، پەلاماری مادەکان بدات.

هێزی مادەکان کەوتنە نێوان دوو هێزی شڕەت و بەئەزموونەوە، بۆیە خەشتریت شەڕەکەی دۆڕاند و بەرئەنجام ئیسکیەتەکان بۆ نێزیکەی بیست و هەشت ساڵ (٦٥٣-٦٢٥پ.ز)[٦٨] وڵاتی مادیان داگیر کرد. گومانی تێدا نییە ئەم داگیرکارییە، بە ڕەزامەندی دەسەڵاتدارانی ئاشوور ئەنجام دراوە، دووریش نییە لە پاداشتی ئەو هەموو خزمەتەدا بۆ ڕزگارکردنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور لە داڕووخان، ئاشوورییەکان وڵاتی مادیان وەک خەڵات پێشکێش بە ئیسکیتەکان کردبێت.

ئیتر میدییەکان لە چاوەڕوانی سەرکردەیەکی دیکەدا بوون تا بێت و پرۆژەی ڕسگاری بەکۆتا بگەیەنێت. ئەوە بوو سەرکردەی چاوەڕوانکراو پەیدا بوو، ئەویش کەیخوسرۆ (کیاکسار)ی کوڕی خەشتریت بوو.

---

(٦٧) هەمان سەرچاوە، ل٢٦٤.

(٦٨) طه باقر واخرون: تأريخ ايران القديم، ص٤٠.

(٦)

# کەیخوسرۆ پادشای میدی
# ڕزگارکەری ڕۆژئاوای ئاسیا
#ساڵی( ٥٨٥پ.ز ) مردووە

## زەبروزەنگی ئیمپراتۆری

زهنییەتی ئیمپراتوری و توندوتیژی دوو هاوڕێی گیانی بەگیانین. هەردەم زەبروزەنگ لەبن عابای ئیمپراتۆریدا خۆی مەڵاس داوە. بەبێ توندوتیژی هیچ ئیمپراتورییەتێک لەسەر پێی خۆی ڕانەوەستاوە. توندوتیژی لەتەک فەرهەنگی (سادی)[٦٩]، کە فەرمانڕەوای ئیمپراتۆرییەتەکانی پێ پەروەردە کراوە لەلایەک و لەلایەکی ترەوە ڕادەی ڕەتکردنەوەی زوڵم و زۆری دەسەڵات لەلایەن جەماوەری چەوساوەوە، لە شێوەی ڕاپەڕین و شۆڕش، هەڵکشانێکی ڕێژەیی دەگرێتەخۆ، بۆیە تا زەبرو زەنگ و چەوساندنەوە زۆر بێت، بە هەمان ڕێژە بێزاریی و نارەزایی و شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەریی پتر دەبێت.

گرێدراویی تووندوتیژی بە زهنییەتی ئیمپراتۆرییەتەوە، دۆخێکی فرە ئاسایییە، چونکە هەر گەل و نەتەوەیەک حەزی داگیرکاری و بەرفرەوانکردنی

---

(٦٩) سادی: نەخۆشییەکی دەروونییە، ئەو کەسانە تووش دەبن، کە بە ئازاردانی ئەوی دی ئاسوودە دەبن، ئەمەش پێچەوانەی (ماسۆشییەت)ە. (وەرگێڕ).

له ناخدا هەبێت و له پێناو دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتدا لەسەر بناخەی ئاینی و نەتەوەیی تێ بکۆشێت، بەناچاریی دەستدرێژی دەکاتە سەر نەتەوەکانی دی، جا با ئەو نەتەوانە هاوسێی بن یان دوورە وڵات.

لەهەمان کاتدا پەنابردنی گەلە زوڵملێکراوەکە، بۆ بەرەنگاربوونەوە و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیی ئیمپراتۆرییەت و بەرەنگاربوونەوەی له پێناو پاراستنی نیشتمان و پێناسەی نەتەوایەتی، کارێکی سرووشتییە.

هاوکات سرووشتییە هێزە داگیرکەرە دڕندە و وێرانکەرەکە له سۆزو بەزەیی دابشۆرێت و بە ئاگرو ئاسن و زەبروزەنگ درێژە بە داگیرکارییەکانی خۆی بدات.

بۆ ماوەی پێنج هەزار ساڵ، گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا بوون بە قوربانی توندوتیژی دەستی ئیمپراتۆرییەتە جیاجیاکان، ئەو ئیمپراتۆرییەتانە جارێک بە ناسنامەی ڕۆژهەلاتییەوەو جارێکی تر بە ناسنامەی ئەورووپییەوە پەیدا دەبوون، بۆیە توندوتیژییەکەش کەرەتێک وەک بەرهەمی ڕۆژهەلاتی ڕەسەن و جارێکیش ڕۆژئاوایی هاوردە (نارەسەن) باڵی بەسەر ناوچەکەدا دەکێشا. له هەردوو باردا بەلای ئیمپراتۆرییەتەکانەوە، کەللە سەری مرۆڤ وەک میوەی گەیو دەهاتە بەرچاوان و دەبووایە بچنرایەو لەسەر یەک کەڵەکە بکرایە. ئەی ئەوە نییە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی (یەکێک بوو له کۆڵەگەکانی ئیپمراتۆرییەتی ئەمەوی)، له مزگەوتداو له وتارێکدا بە خەڵکی شاری کوفەی عێراقی وت: "**چەند کەللەسەرێکی گەیو دەبینم کاتی لێکردنەوەیان هاتووە و منیش تەنیا خۆم خاوەنیانم**"؟!

سەیر لەوەدایە، ئیمپراتۆرییەتە ڕۆژهەلاتییەکان له مەیدانی بەرهەمهێنانی توندوتیژی بەرنامە بۆ داڕێژراودا دەسپیشخەر بوون، لەوەش سەیروسەمەرەتر، ئەم توندوتیژییە ڕۆژهەلاتییە بەردەوام بە (مەرجەعە ئاینییەکان) پشت ئەستوور بووەو بە ناوی خودا و له پێناوی خودادا پێڕەو کراوە و بەئەنجام گەیەنراوە.

جێی ئاماژەبۆکردنە، کە هەریەک له ئیمپراتۆرەکانی ئەودەم بە شێوەیەک وێنای (خودا)یان دەکرد، کە له چوارچێوەی توندوتیژییەکی ئاوەهادا لەگەڵ

سرووشته سادییەکەی خۆیاندا ساز و گونجاو بێت. بەڵێ هەردەم ستەمکارەکان لە مێژوودا بە ئارەزووی خۆیان وێنەی (خوداوەندیان) کێشاوە.
خوێنەری مێژووی ڕۆژهەڵات ئەو ڕاستییە دەزانێت، کە ئیمپراتۆرییەتی مەغۆل بەسەرکردایەتی جەنگیزخان و کوڕەکانی لە ئاست گەلانی مەغۆلدا دڕندەترین و توندوتیژترین و وێرانکەرترین ئیمپراتورییەتی سەدەی سیانزەی زاین بوو، نەک تەنیا لەپێناو داگیرکاری وڵاتان و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامانی گەلاندا، بگرە کاری توندوتیژییان وەکو بیروباوەڕو پەیامێکی خودایی لەلا چەسپابوو. ئەم بیروباوەڕەشیان لە پەیامەکەی شامان (ڕاهیب)ی گەورە هەڵهێنجابوو، کە ئاڕاستەی جەنگیزخان و جێنشینەکانی کردبوو، هەربۆیە لە کاتی داگیرکردنی شارەکاندا جەنگاوەرە مەغۆلەکانیان پابەند دەکرد بە ملپەڕاندنی مرۆڤەکان و دەبوو هەریەکەیان کەللەسەرێک، یاخۆ چەند کەللەسەرێکی پەڕێندراو بهێننەوە تا هەرەمێکی لێ دروست بکەن، هەرەمێک ڕوخساری سەرپەڕێندراوەکان بۆ دەرەوە دەیانڕوانی، ئیتر خۆشی و شادی سەرکردەو سەربازەکانی مەغۆل مەپرسە، کاتێ لەو هەرەمە کەللەسەرانەیان دەڕوانی، هەرەمی سەدان کەللەسەری مرۆڤ!!.

### سەربڕین و کەوڵکردن

نیزیکەی هەزار ساڵێک گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا بەدەم توندوتیژیی ئیمپراتورییەتە ڕۆژهەڵاتییەکانەوە ناڵاندیان. سەرکردەکانیان، سەرکردەی ئەم ئیمپراتورییەتانە لە نواندنی توندوتیژی و دڕندەییدا هیچیان لە مەغۆلەکان کەمتر نەبوو. مەبەستم لێرەدا ئیمپراتورییەتی ئاشوورە. ئیتر بە هەمان باو و نەریتە ڕۆژهەڵاتییەکەو پشت ئەستوور بە مەرجەعییەتە ئایینییەکان، دەستیان داوەتە کوشتوبڕ و توندوتیژیی کەم وێنەیان ئەنجام داوە.
فەرمانڕەوای ئیمپراتورییەتی ئاشوور خۆی بە کوڕەزا و خۆشەویستی **خواوەندی ئاشوور** بە خەڵک و جیهان دەناساند، گوایە ئاشوور بەڵگەنامەی پیرۆزو تاهەتایی و کراوەی پێ بەخشیووەو بەپێی ئەو بەڵگەنامەیە، ئیمپراتور بۆی هەبوو بەهەر چوارلادا وڵاتان داگیر بکات و بەفەرمانی خوداوەندی

ئاشوورو لەپێناو خوداوەندی ئاشووردا کوشتوبڕ و تالآن و بڕۆ و کاولکاریی ئەنجام بدات.

ئاشوور ناسەرپاڵی دووەم (٨٨٤-٨٥٩ پ.ز) یەکێک بووە لە بەهێزترین پاشاکانی ئاشوور. ئەم پاشایە دەسەلآتی خۆی بەسەر وڵاتی دوو ڕووبار (وڵاتی ڕافیدێن)و کوردستان و سوریای گەورەدا سەپاندبوو. بڕوانە ئەم پاشایە لە بواری توندوتیژیدا چۆن شانازی بەخۆیەوە دەکات.

**- لەو نازاناوانەی کە بۆ خۆی تەرخان کردبوو: "من ئاشوور ناسەرپاڵ، ئەو میرە گوێڕایەڵەم، کە خواوەندی مەزن دەپەرستم، من ئەژدیهای دڕم، داگیرکەری گشت شاران و چیاکان، شای شاهان و گەمارۆدەری خەڵکی سەرسەختم، تاجی مەزنایەتیم لەسەرە، نەبەز لە شەڕدا و قارەمانی سەربڵند، بێ بەزەیی، دنەدەر و سەرسامی زۆرانبازیم"(٧٠)**

- ئاشوور ناسەرپاڵ شانازیی بەو ژێدەر و مەرجەعییەتە خوداییەوە دەکات، کە لە ئارەزووە ئیمپراتۆرییەکەیدا پشتی پێ بەستووە.

**"کاتێک ئاشوور- پەروەردگاری گەورەم، بەناوی خۆمەوە بانگی کردم و بالآدەستیی ڕەهای پێ بەخشیم بەسەر پاشاکانی هەر چوارلادا و ناوی مەزنی بالآتر کردم، چەکی دڵڕەقی خۆی بەهەردوو بازووی پاشایەتیم بەخشی- فەرمانی توندی دامێ تا فەرمانڕەوابم و وڵاتی چیا و شوێنە بەرز و سەرکەشەکان بخەمە بندەستی خۆم و حوکمیان بکەم"(٧١)**

- ئەو هێرشێکی لە ناکاوی خۆی بۆ چیاکانی کوردستان باس دەکات و دەڵێت: **"بە شمشێر جەستەی (٢٠٠) لە پیاوە جەنگاوەرەکانیانم لەتوپەت کرد و خەڵکێکی زۆر لە دیلەکانیانم وەک مێگەل دایەبەر و بە خوێنیان، وەک خوریی سوور، چیام ڕەنگ کرد"(٧٢)**

ئاشوور ناسرپاڵ، پەلامارێکی لەپڕی دیکەی بۆ سەر کوردستان ئاوا پەسن دەدات: **"بە شمشێر ٢٦٠ سەربازی جەنگاوەریانم لەتلەت کرد، سەریانم**

---

(٧٠) البرت كيرک كريسون: الكتاب الملكيه لاشور ناصرپال الثاني، ص٢٢

(٧١) هەمان سەرچاوە، ل٢٤. مەبەست لە (چیاو شوێنە بەرزو سەرکەشەکان) کوردستانە.

(٧٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

**پەراندو گردێکم لێ دروست کرد... شارەکانیانم لەگەڵ زەویدا تەخت کرد، کاولم کردو سووتاندیانم ئەو شارانەی کە کەوتبوونە سەر بەرزاییە بڵندەکان، دوایی هێزە زۆرە هەڵهاتووەکەیانم دابەزاندو لەبەر پێمدا کرنووشیان برد، سەرانەم بەسەریاندا سەپاندو کاری سەختم پێ ئەنجام دان، حاکمی شاری نیشتۆن (بۆبۆ)ی کوڕی (بابوا)م به دیل گرت و بەزیندوویی کەوڵم کرد، لە شاری ئەربیل پێستەکەیم بەسەر دیواردا هەڵواسی"**[٧٣].

- هێرشێکی تری بۆ ناوچەی ڕووباری خاپوور لە کوردستان باس دەکات و دەڵێت: **"بە پشتوپەنای ئاشوور و (ئەدەد)ی خوداوەند، ئەو دوو خوداوەندە مەزنەی دەسەڵاتی منیان ڕەها کرد، گالیسکە و سەربازەکانم کۆ کردەوە و بەرەو ڕووباری خاپوور ملم نا ( ئازی-ئیلی)م بە نوێنەری خۆم دەستنیشان کردو کردم بە فەرمانڕەوا بەسەریانەوە، لەبەردەم دەرگەیەکدا گردێکم لە کەللەسەر پێکەوەنا. پێستی نەجیبزادە یاخییەکانم کەندو بەسەر گردەکەوە ڕامخست، بڕێکم بەسەر کەللەسەرەکاندا هەڵخست و بڕێکی ترم بە کۆڵەکە داکوتراوەکانی ناو کەللەسەرەکانداو بڕێکی تریشیان بە کۆڵەکەی چواردەوری تەپۆلکە سەربڕاوەکاندا هەڵواسی، بڕێکی دیکەیانم بۆ وڵاتی خۆم هێنا و کەوڵم کردن و پێستەکانیانم بەسەر شورەی شاردا دا"**[٧٤]

گەر لە کۆی شانازییەکانی ئەم پیاوە بڕوانین، دەبینین هەر هەمووی باس لە هێرش و کوشتوبڕی گەلانی ئەو وڵاتانە دەکات، کە پەلاماری داون، تێکی شکاندوون و تاڵانی کردوون. باس لەو دیارییە دەکات، کە بە زەبری هەڕەشەو چاوسوورکردنەوە دەستی کەوتووە، چەند شاری سووتاندووە و وێرانی کردوون، ئەو سەرکردانەی کە پێستی گووڕون، ئەو دیلانەی وەک مێگەل داونەتییە بەرو کوشتوونی و سووتاندوونی، یان بۆ سوخرەو کاری زۆرە ملێ هێشتوویانییەتەوە. ئەمەو بەتەنیا ئاشوور ناسەرپاڵ نەبووە، کە حەزو ئارەزووی توندوتیژی لەناخیدا ڕەگوڕیشەی داکوتاوە و بەکردەوە بەرجەستەی کردووە، بگرە بەر لەم و دوای ئەویش، پاشاکانی ئاشوور

---

(٧٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥-٢٦.

(٧٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

هەمان درندایەتییان نواندووە. شالاوی زەبروزەنگ و (شەلم کوێرم، نابوێرم) سرووشتی هەموو پاشاکانی ئاشوور بووە، کە پەلی بۆ گشت ناوچە و دەڤەرەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا کوتاوە. هەر لە ناوچەرگەی وڵاتی فارسەکانەوە بیگرە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا دەگاتە وڵاتی میسر لە ڕۆژئاوا، لە بن چەکمە و زەبرو زۆریاندا ناڵاندوویانە.

زۆرترین پشکی ئەم توندوتیژییەی پاشاکانی ئاشوور بەر گەلی میدی لە چیاکانی کوردستان و گەلی بابلییەکان لە دەشتاییەکانی وڵاتی دوو ڕووبار کەوتووە. وادیارە شالاوە یەک لەدوای یەکەکانی ئاشوور زیاتر ڕووە و کوردستان ئاراستە کراوە. دەبینین بەردەوام باس لە پەڕینەوە لە ڕێڕەوە سەختەکان و هەڵگژان بە چیا تووش و ڕکەکان، سەرکەوتن بەرەو ئەو شارانەی کە کەوتوونەتە نێزیک لووتکە و دوندی چیا سەرکەشەکان دەکات، ئەمەش ئاساییە، چونکە داگیرکردنی شارە دەشتاییەکان ئاسانتربووە لە داگیرکردن و بەسەرردادانی چیانشینەکان. لەبەر ڕۆشنایی ئەو قسە و باسانەی کردمان و لەسەر زاری پاشاکانی ئاشوور گێڕامانەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە هۆزە کوردەکان، مادەکان یا کردۆخییەکان زۆرترین شۆڕشیان دژ بە ئاشوورییەکان بەرپا کردووە، لە بەرەنگاربوونەوەدا خۆڕاگر و بەتواناتر بوونە، هەربۆیە زۆرترین بەشی تۆڵەکردنەوە و توندوتیژییان بەرکەتووە.

### کەیخوسرۆی نەخشەدارێژەر

لە خوێندنەوەی ژیاننامەی دەیاکۆدا بۆمان دەردەکەوێت، کە میدییەکان جار لەدوای جار دژ بە پاشاکانی ئاشوور شۆڕشیان هەڵگیرساندووە. ئەو دەمە دەیاکۆ یەکەم شۆڕشی مەزنی هەڵگیرساند، بەڵام بینیمان شۆڕشەکەی سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەست نەهێنا. پاش دەیاکۆ خەشتریت (فراورتیس)ی کوڕی دژ بە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان بۆ ماوەی (٢٢) ساڵ درێژەی بە شۆڕش دا، بەدوای ئەودا کەیخوسرۆ Kai-Khosru ی کوڕی دەسەڵاتی گرتەدەست (ڕەنگە لەنێوان ساڵانی ٦٢٥ -٥٨٥ پ.ز فەرمانڕەوایی

کردبێت)، لەبری سەرچاوەی مێژووییدا ناوی کەیخوسرۆ بەشێوەی (کەی ئەخسار – Cyaxares) هاتووە. دیاکۆنۆف دووهەمین برگەی بەشێوەی (Exsear – ئیخسار) و (خسارت– Xsart) گۆ کردووە. ئەو دەڵێت: "واتای ئەم ناوە ئازایەتیی و بوێریی دەگەیەنێت". [٧٥]

بەڵام هیرۆدۆت ناوی کەیخوسرۆی بە شێوەی (سیاشاریس) گۆ کردووە. هارفی بۆرتەریش بە (کیکسارس) گۆی کردووە. ویل دیورانت بە (سیاخسار، سیاکزارس) ناوی بردووەو بە (ئوڤاخشەنترا– ouvakhsnatra)یش ناسراوە. لەهەمان کاتدا لەبری سەرچاوەدا بەشێوەی (ئکسرکیس) ناوی هاتووە. دەبێ ئەوە بڵێین: جیاوازی ناوی ئەم سەرکردەیە بۆ جیاوازی ئەو لایەنانە دەگەڕێتەوە، کە باسیان کردووە، ئیتر ئەو لایەنانە بابلی بن یا ئاشووری، یۆنانی بن یا فارس، ئەرمینی بووبێتن یاخۆ سریان و عارەب، لە کاتی گواستنەوەکەیدا لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ئەم گۆڕانکارییە شتێکی ئاساییە، کە پەسەر ناودا دێت، بۆیە لە سەرچاوە مێژووییە کۆنەکاندا باو و ئاشکرایە[٧٦].

هیچ دوور نییە ناوی (کەیخوسرۆ) لە بناخەدا نازناو بووبێت، چونکە لە ڕۆژئاوای ئاسیاداو لەنێو پاشاکاندا نازناو باو بووە، ئەشێ ئەم ناوە لە بناخەدا، (کەی خاش ڕوو)، واتە (پاشای بەختەوەر) یا (پاشای نەمر) بووبێت، چونکە وشەی (کەی) واتای (پادشا) و (خاش) واتای (شیرین، بەختیار، زیندوو، نەمر) دەگەیەنێت، بۆیە فارسەکان، ناوبانگی ئەم پاشایەیان بۆ خۆیان قۆستۆتەوەو لە سەرچاوە عارەبییەکاندا بەشێوەی (کیسرا) هاتووە، ئاشکراشە پیتی (س، ش) لە دەنگەکاندا جێگۆڕکێ دەکەن و لە کاتی گواستنەوەی وشەکە لە زمانێکەوە بۆ ئەوی تر ئەم جێی ئەویان دەگرێتەوە، نموونەش وشەی (شاپوور)ی فارسییە، کە لە کاتی گواستنەوەدا بۆ سەر زمانی عارەبی بە (سابوور) گۆ دەکرێت.

---

(٧٥) دیاکونوف: میدیا، ص٣٥٧. طه باقر وآخرون: تآریخ ایران القدیم، ص٤٠

(٧٦) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص، هارفی بورتر، موسوعه مختصر التآریخ القدیم، ل٨٦. ول دیورانت: قصه الحضاره، ص٤٠١.

کەیخوسرۆ گەورەترین پاشای میدییەکان بوو. ئەو بەرزترین و دیارترین ئاکاری تایبەتمەندیی پێشەوایی لە خەشتریت (فراورتیس)ی باوکییەوە بۆ بەجێما.

کەیخوسرۆ سەرکردەیەکی قاڵبوو و بەجەرگ و پیاوێکی مەزنی دەوڵەت بوو. خۆی تەرخان کردبوو بۆ بەجێگەیاندنی پرۆژە ئازادیخوازەکەی دەیاکۆی باپیرە گەورەی (پرۆژەی ڕسگاری میدییەکان). ئەو پرۆژەیەی کە خەشتریتی باوکی چەند هەنگاوێکی بۆ هاویشت. بلیمەتیی ئەم سەرکردە میدییە لەوەدا بوو، کە ڕووبەڕووی کۆنترین قەوارە و هێزی سیاسی و سەربازی بوویەوە، لە ڕۆژئاوای ئاسیا، لە ئەنجامدا تێکوپێکی شکاند. ئەو هێزەش ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بوو، کە کەیخوسرۆ لەبازنەی کاریگەریی سیاسی و کاردا، لە ڕۆژئاوای ئاسیادا وەدەری نا.

کەیخوسرۆ بە خاوەن دیدگەیەکی ستراتیجی بەرفرەوان و هەستێکی سیاسی واقیعییانەو سەرکردەیەکی تایبەتمەند ناسرابوو. هەموو هێزو توانای خۆی کۆ کردبووەوە بۆ ڕزگارکردنی میدییەکان و گشت گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا، تا لە بندەستی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان وەدەریان بهێنێ.

بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، سێ دەسکەوتی گرینگی بەدەست هێنا، خۆ گەر ئەو سێ هەنگاوەی نەنایە، سەرکەوتنێکی وای نەدەبوو بە نسیب، کە شایەنی باسکردن بێت.

**دەسکەوتی یەکەم:** بەرفراوانتر لە باوک و باپیرەی، لەژێر یەک بەیداغدا هۆزە میدییەکانی گلێر کردەوە و ئاراستەی یەک ئامانجی کردن، ئامانجی ڕزگاربوون لە پاشکۆیەتی مەملەکەتی ئاشوور، بۆ ئەم مەبەستەش سەرەتا خێڵە کۆچەرییەکانی نیشتەجێ کرد و کاروباری بۆ ڕێکخستن و کۆمەڵێک یاسای داناو لەپێناو بەدەستخستنی هاوسەنگی لەگەڵ سوپای ئاشووردا لەسەر بناخەیەکی مۆدێرن سوپای ڕێکخست. بۆ ئەم ڕێکخستنەش سوودی لە شێوەو چۆنییەتی شەڕی ئیسکیتەکان وەرگرت، نموونەی تیژیی جووڵە و تاکتیک و پێکهێنانی دەستەی سوارچاکی تیژڕۆ و جیاکردنەوەی تیرهاوێژان

له سواره‌کان، دواجار شاری (ئه‌گباتانا)ی وه‌ک پایته‌ختی هه‌میشه‌یی ده‌ستنیشان کرد.

**ده‌سکه‌وتی دووهه‌م** : کۆتاییهێنان به‌ مه‌ترسی ئیسکیته‌کان. ڕاسته‌ له‌ ڕابردوودا توانی نینۆکی ئیسکیته‌ هێرشبه‌ره‌کان ده‌ربکێشێت و جۆره‌ به‌ڵێننامه‌یه‌کیان پێ مۆر بکات، به‌ڵام که‌یخوسرۆ حیزفرسه‌تی ئیسکیته‌کانی له‌ یاد نه‌چووبوو، ئه‌و ده‌یزانی هه‌ر هه‌لێکی له‌بار ده‌قۆزنه‌وه‌و په‌لاماری مه‌مله‌که‌تی میدیا ده‌ده‌ن و بێ دوودڵی خه‌نجه‌ری خۆیان له‌پشته‌وه‌ ده‌وه‌شێنن، هه‌ر چۆن له‌ ڕابردوووداو له‌ سه‌رده‌می خه‌شتریتدا، زیاد له‌ جارێ ده‌ستی خۆیان وه‌شاند.

بۆ ئه‌وه‌ی ئیسکیته‌کان نه‌بنه‌ له‌مپه‌ر له‌به‌رده‌م جێبه‌جێکردنی پلانه‌که‌یدا، که‌ له‌ بۆڕدان و تێشکانی دوشمنه‌ سه‌رسه‌خت و گه‌وره‌که‌ی (ئیمپراتۆرییه‌تی ئاشوور) خۆی ده‌بینییه‌وه‌، که‌یخوسرۆ بڕیاری دا ئیسکیته‌کان له‌غاو بکات و مه‌مله‌که‌ته‌که‌ی خۆی له‌ مه‌ترسی بپارێزێ، ئه‌وه‌ بوو ڕۆژێک هات و گشت سه‌رۆک و سه‌رکرده‌کانی ئیسکیتی داوه‌ت کرد، سفره‌ی به‌ خواردنی زۆر به‌تام و له‌زه‌ت و خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشکه‌ر ڕازانده‌وه‌، ئه‌و ڕۆژه‌ ئیسکیته‌کان هێنده‌یان خواردو خوارده‌وه‌ تا ته‌واو سه‌رخۆش بوون و لاڵوپاڵ لێی که‌وتن، ئیتر زانی کاتی جێبه‌جێکردنی پلانه‌که‌ هاتووه‌، که‌یخوسرۆ فه‌رمانی به‌ جه‌نگاوه‌ره‌کانی خۆی داو له‌وێدا هه‌ر هه‌موویانی کوشت و له‌ناوی بردن. دوای ئه‌وه‌ ئیسکیته‌کان به‌بێ سه‌رکرده‌ی کارامه‌ مانه‌وه‌، بۆیه‌ سه‌ریان لێ شێواو هه‌ستیان به‌ لاوازی کردو به‌رئه‌نجام په‌رت و بڵاوبوونه‌وه‌، ئیتر ڕێگه‌ی له‌غاوکردن و کۆنترۆڵکردنیان لای پاشا خۆش و ئاسان بوو.

**ده‌سکه‌وتی سێیه‌م**: به‌ستنی هاوپه‌یمانێتی له‌نێوان میدیا و ئیلام له‌ باشوور و له‌نێوان میدیا و بابل له‌ ڕۆژئاوا، گرینگترین هاوپه‌یمانێتی ستراتیجی له‌ته‌ک پاشای بابلی (کلدانی) نابوپولاسه‌ر-nabopolasser دا بوو، ته‌نانه‌ت به‌ هاوسه‌رگیری ئومید (ئه‌میتس)ی کچی له‌گه‌ڵ نه‌بوخه‌زنه‌سه‌ر (به‌ختونه‌سر)ی

کوڕی نابو بۆلاسەر[٧٧] ڕازی بوو. هەر نەبوخەزنەسەر بوو (باخچەی هەڵواسراو)ی ناوداری بۆ کچە میدی بونیات نا. بەر لە پاشای ئاشووری، ئاشووربانیپاڵ نابوبۆلاسەر فەرمانڕەوای بابل بوو، بەڵام ئەو هەمیشە ئارەزووی سەربەخۆیی وڵاتەکەی لە مەملەکەتی ئاشووری لە مێشک دەرنەدەچوو، لەم هاوپەیمانێتییەدا، کەیخوسرۆ بەتەنیا هێزێکی تازەی ڕانەکێشایە پاڵ خۆی، بگرە هێزێکی گەورەی لە ئاشوورییەکان کێشایەوە، کە دەشیا ڕۆژێک لە ڕۆژان دژ بە میدییەکان بەکاری بهێنێ.

## کەیخوسرۆی ڕزگارکەر

ئەم سەرکردە میدییە هۆشیارو بەئاگایە، دەیزانی تەنیا هێزی گەورە دەتوانێ هێزێکی گەورەی هاوشێوەی خۆی تێک بشکێنێ و بۆڕی بدات. ئەو درکی بەو ڕاستییەش کردبوو، کە بۆ سەرکردەیەکی ئازادیخواز تەنیا ئارەزوو بەس نییە، بگرە دەبێت و پێویستە سەرکردە توانای بەرجەستەکردنی حەزو ئارەزووەکانی هەبێت و ئامانج و پلان و بەرنامەکانی لەسەر ئەرزی واقیع شیاوی جێبەجێکردن بن. ئەو پەی بەو ڕاستییە بردبوو، کە هەر نەتەوەیەک گیرۆدەی ناکۆکی ناوخۆیی و لەتلەتبوونی ڕۆشنبیری و سیاسی بووبێت و فرە لایەنیی لە بڕیارداندا بوونی هەبێت، ئەوا گومانی تیادا نییە لە سایەی بارێکی ئاوادا، نەدەتوانرێت وڵات ڕزگار بکرێت و نەدەکرێت بەرپەرچی هێرش و پەلاماری دوژمن بدرێتەوە.

بەڵێ، کەیخوسرۆ درکی بەو هەموو ڕاستییانە کردبوو، ڕەوشتی پێشەواییکردن و سیاسەتە ڕاست و دروستەکەی بەڵگەی حاشاهەڵنەگری ئەو ڕاستییەن، ئەو دەیزانی ئامادەکردنی کەشوهەوای سیاسی هەرێمایەتی لەبار پێویستە، بۆ گەشتن بە ئامانجە چاوەڕنکراوەکەی، پاش کۆتاهێنانی ئامادەیی سەربازی و گرێدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ دەرەوەدا، لە ساڵی (٦١٥پ.ز) هێرشی بردە سەر مەملەکەتی ئاشوورو ئەڕابخا (کرخینی-

---

(٧٧) دیاکونوف: میدیا، ص٣٨٣. طه باقر واخرون: تآریخ ایران القدیم، ص٤١.

کەرکووک)ی بۆ پێگەی کارە سەربازییەکانی هەڵبژارد و لەوێوە سوپاکەی ڕووەو شاری (نەینەوا) پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور ئاراستە کرد، بەڵام ئاشوورییەکان بەوپەڕی هێز و سەرسەختییەوە ڕووبەڕوویان بوونەوە.

سەرچاوە هەواڵییەکان هۆی سەرنەکەوتنی کەیخوسرۆ لە داگیرکردنی نەینەوادا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسکیتەکان دەگێڕنەوە، کە ئەودەم پاشکۆی ئاشوورییەکان بوون[٧٨].

بەرئەنجام کەیخوسرۆ ڕووی لە شاری ئاشوور کرد، ئەو شارەی کە بە پایتەختی ئاینی ئاشوورییەکان دادەنرا و پەرستگەی خواوەندی ئاشووری لێ بوو، ئەوە بوو هێرشی کردە سەر شارەکە و داگیری کرد.

لەم بارەوە دیاکۆنۆف یەژێت: **"سوپای مادەکان پیاوانی کاربەدەست و ڕاوێژکارەکانی دەوڵەتی ئاشووریان لە شارەکە کوشت و پەرستگەکانیان تاڵان کردو دەستیان بەسەر سەروەت و سامانێکی زۆردا گرت، ئەو سەروەت و سامانەی بەرئەنجامی جەنگە یەک لەدوای یەکەکانیان دژ بە گەل و نەتەوەکانی ناوچەکە بەرپایان کردبوو، کۆیان کردبووەوە"**[٧٩].

لەو شەڕەدا سوپای کەیخوسرۆ شاری ئاشووری خاپوور کرد، بەڵام نەبوبلاسەری پاشای کلدان و هاوپەیمانی مەملەکەتی ماد، سیاسەتی هەلپەرستانەی پێڕەو دەکرد، وا دەردەکەوێت لە چاوەڕوانی بەرئەنجامی شەڕەکەدا سەری خۆی کزکردبێت، تا بزانێت شەڕەکە لە بەرژەوەندی کام لادا دەشکێتەوە، پاشان لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامەکەیدا بڕیارێک بدات، کە لە بەرژەوەندی خۆیدا بێت، ئەو بەم هەڵوێستەی گەرەکی بووە بۆ بەرژەوەندی خۆی، کەیخوسرۆ وەک ئامرازێک بەکاربهێنێت، دیاکۆنۆف دەنووسێت: **"پادشای ئەکەد (بابل)و ئەو سوپایەی کە ئامادەی کردبوو تا بەدەمنگ و هانای میدییەکانەوە بچێت، نەچوو و بەشداریی شەڕەکەی نەکرد... بە گشتیی پلانی دواکەوتنی نابوپلاسەر بە ئارەزووی خۆی بوو، دووریش نییە لە ئەنجامی**

---

(٧٨) طه باقر واخرون: تاريخ ايران القديم، ص٤١ .

(٧٩) دياكونوف: ميديا، ص٢٨٧.

**ڕێکەوتنێکی نهێنی نێوان گەورە پیاوان و کاهینە ئاشوورییەکانی بابل بوو بێت، ئەم ئەگەرەش فرە بەهێزە**.[80]

لە گێڕانەوەکەی دیاکۆنۆف بۆمان دەردەکەوێت، کە نابوپۆلاسەر لە بواری ڕۆشنبیریدا هاوسۆزی دەوڵەتی ئاشوور بووە، ئەوەسا پاشای بابلی (کلدانی) لە نووسینەکانیدا دەڵێت: "**چونکە نەچووە هانای پەرستگەی ئاشوورەوە، فرە بێ تاقەت بوو بۆیان، بەڕادەیەک لەسەر دەم خۆی دا بەزەویدا**"[81]، بەڵام ئەو لە ڕووی سیاسییەوە دوژمنایەتی ئاشووری دەکرد و بۆ ڕزگاربوون لە بن دەستیان تێ دەکۆشا، بۆیە بەناچاری ڕووی کردە ئاشووری کاولکراو و لەگەڵ کەیخوسرۆدا هاوپەیمانێتی هاریکاری و هاوڕێیەتی گرێ دا، وەک باسمان کرد، لەپێناو بەهێزترکردنی ئەو هاوپەیمانێتییەدا خوازبێنی کچەکەی کەیخوسرۆی بۆ کوڕەکەی کردو هاوسەرگیری لەنێوان کوڕە پاشای بابلیی و کچەپاشای میدیدا پێک هات.

ساڵی (٦١٢ پ.ز) هەردوو هاوپەیمانی میدی و بابلی جارێکی دی هێرشیان کردە سەر نەینەوا، کە گەلانی هاوسێ ناوی (شاری خوێن)یان لێ نابوو[82]، بەڵام داگیرکردنی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور کارێکی ئاسان نەبوو، بگرە جەنگاوەرە ئاشوورییەکان بەسەختی ڕووبەڕووبوونەوەو **سین شاریش کون** (ساراک) پاشای ئاشوورییان و کوڕی ئاشوور بانیپاڵ سەرسەختانە بەرگری لە شارەکە کرد، وا دیارە تیپی هێرشبەر بە ئاڕاستەی شوورە پان و پتەوەکانی شاردا ئاوی ڕووباری دیجلەی بەردابێتەوەو بەو هۆیەوە بەشێکی گەورەی دیوارەکەی دەڕووخێت و ڕای دەماڵێت، دوای شەڕێکی سەخت و ئابڵووقەدانی شار، پاشای ئاشوور هەستی کرد فەوتان و لەناوچوونی نێزیک بووەتەوە، بۆیە ژنەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و گریان تێ بەر دەدات و پاشان

---

(٨٠) طه باقر وآخرون: تاريخ ايران القديم، ص٤١. دياكونوف: ميديا، ص٢٨٧.

(٨١) دياكونوف: ميديا، ص٢٨٨.

(٨٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٠.

خۆیشی دەهاوێتە ناو ئاگرەکەوە و هەموویان دەسووتێن و کوڵ و کۆیان دادەمرکێتەوە[٨٣].

هیرۆدۆت لە نووسینەوەی مێژووەکەیدا پەنجە بۆ سەرکەوتنەوکانی میدییەکان ڕادەکێشێت و دەڵێت: **"میدییەکان یاخیبوون و چەکیان هەلگرت و شەڕیان کردو کۆت و بەندی کۆیلایەتییان پساند و ڕزگارییان بەدەست هێنا، ئەم سەرکەوتنەیان وانەیەک بوو نەتەوەکانی تری ناوچەکە بۆ بەدەستخستنی ڕزگاری سوودیان لێ بینی". بەم شیوەیە شۆڕش تەشەنەی کردو گەل و نەتەوەکانی ناوچەکە لەپاڵ خێروبێری سەربەخۆییدا کاروباری ڕۆژانەی ئاسایی خۆیان بەڕێوە دەبرد"**[٨٤].

لەمەڕ هێرشی دووقۆڵیی میدییەکان و بابلییەکان و کەوتنی شاری نەینەوا، پێغەمبەری عیبرییەکان، ناحووم (لە نەینەوا دیل بوو) باس لە شادومانیی گەلانی بندەستی ئاشوورییەکان دەکات و دەڵێت: **"پاسەوانەکانت باوێشکیان دەدا ئەی پاشای ئاشوور، پیاوە مەزنەکانت هەلاژان، گەلەکەت پەرتەوازەی چیاکان بوو، کەسێک نییە کۆیان بکاتەوە. شکستەکەت جوبران ناکرێ (ناگیرێتەوە)، برینەکەت ساڕێژ ناکرێت، گشت ئەو کەسانەی هەواڵت دەبیستن دژت چەپلە لێ دەدەن. ئاخر پریشکی شەڕە بەردەوامەکانی تۆ بەر کێ نەکەوت؟!"**[٨٥].

ڕاستە هاوپەیمانییە میدی ـ بابلییەکە لە دەسەڵاتدارانی ئاشوور ڕزبوون و بەشێک لە شاری نەینەوایان کاول کرد، بەڵام پێچەوانەی ئاشوورییەکان، ئەوان لە ئاست جەماوەری ئاشووردا توندوتیژییان نەنواند و نەیان کردنە ئامانج و سووکایەتییان پێ نەکردن، دیاکۆنۆف دەنووسێت و دەڵێت: **"نەتەوە دیل و ژێردەستەکانی ئاشوور، لە چاوەڕوانی ڕۆژێکی وادا پشوویان سوار**

---

(٨٣) هارفی بورتر: موسعە مختصر التاریخ القدیم، ص٦٨

(٨٤) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٧٧

(٨٥) العهد القدیم، الاصحاح٣، الایة ١٨،١٩ و هەروەها بڕوانە: آبرهام مالمات، حاییم تدمر- العبرانیون وبنو اسرائیل، ص٢٩٤.

بوو، ئەوان پێیان چاک بوو لەو ڕۆژەدا، لە جێی مست، پێلەقە ئاراستەی ستەمکاران بکرێت، لەبری ئەو گشت کارەساتەی لەسەر دەستی ئاشوورییان تووشی بوون، هەمان کارەسات بەسەر ستەمکاراندا بهێنرێت، ئەوان تەڕو وشکیان پێکەوە سووتاند، ئاگریان لە گوند و قەڵاکانیان بەردا، منداڵی ساوایان سوتاند، ئەی کۆشک و پەرستگەکانیان نەڕووخاند؟ ئەی وێنەو پەیکەری خواوەندەکانیان وردوخاش نەکرد؟ ئەی بە جلوبەرگی دڕاوەوە ژنەکانیان بە دیل نەبرد؟ ئایا گشت ئەو ڕەفتارانەی بۆ ئاشوورییەکان حەڵاڵ و ڕەوا بوو، بۆچی بۆ خەڵکە داخ لە دڵەکە حەرام و ناڕەوا بێ؟

سەرەڕای ئەوانە هەر هەموو ئارییەکان و هاوپەیمانەکانی دەستیان فرە سوکترو کەمتریان دژ بە ئاشوورییەکان ئەنجام دا، ئەو ئاشوورییانەی دژ بە گەلان و نەتەوەکانی دەڤەری ڕۆژئاوای نێزیک گەورەترین تاوانیان ئەنجام دا".[٨٦]

دیاکۆنۆف دەڵێت: میدییەکان دەستیان بۆ هاووڵاتییە ئاشوورییەکان درێژ نەکرد، نە خۆیان و نە کولتوورەکەشیان نەکردە ئامانج. " لەڕاستیدا گەلی ئاشوور بنبڕ نەکران، ئەوان لە نەینەوای وێرانە و شارە نێزیکەکانی تر دەژیان، تا ساڵانی دواییش هەر خواوەندی ئاشوورییان دەپەرست".[٨٧]

ڕاستە میدییەکان خەڵکێکی یەکجار زۆریان لە ئاشوورییەکان لە شەڕدا بە دیل گرت، "بەڵام نە لە ئاست دیلەکان و نە لە ئاست هاووڵاتیانی ئاشوور توندوتیژییان نەنواندو ستەمیان لێ نەکردن".[٨٨] دیاکۆنۆف ڕەفتاری میدییەکان ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت: "ئامانجی میدییەکان لەم سەرکەوتنەیاندا تەنیاو تەنیا ڕزگاری بوو و بەس، ئەمەش ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، ڕووخان و کۆتاییهاتنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور فاکتەری دەستەبەرکردنی بەختەوەری بوو بۆ هەموو وڵاتانی ئاسیای ڕۆژئاوا".[٨٩]

---

(٨٦) دیاکونوف: میدیا، ص٢٩٠-٢٩١ و مەبەست لە ڕۆژهەڵاتی نزیک، ڕۆژئاوای ئاسیایە.

(٨٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩١.

(٨٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩١.

(٨٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٣.

پاش دەستبەسەرداگرتنی نەینەوای پایتەخت جەنگی میدی- ئاشووری کۆتایی نەهات، لەو سەروەختەدا بەشێک لە سوپای ئاشوور توانی لە نەینەوا پاشەکشە بکات و بە سەرکردایەتی ئاشوور بالیت (ئاشوور ئوبالیت) مامی پادشا (ساراک)ی ئاشوورو برا بچووکی ئاشوور بانیپال ڕوو بکاتە شاری حەڕان[٩٠] و لەوێ لە پشت شوورەکانی ئەو شارە خۆی قایم بکات. حەڕانی ئەودەم گەورەترین شار بوو لە باکوری نێوان دوو ڕووبار و نیمچە سەربەخۆ و هاوپەیمانی ئاشوورییەکان بوو. ئەم ئاشووربالیتە، سەردەمی دەسەڵاتی ئاشوور بانیپاڵی برای، کاهینی خوداوەندی (سین)ی حەڕانییەکان بوو.

ئەم خوداوەندەش بۆ سوریاو وڵاتی نێوان دوو ڕووبار فرەپایەدار بوو هەر بەم هۆیەشەوە بالیت پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ دانیشتوانی حەڕاندا پەیدا کردبوو[٩١].

پایزی ساڵی (٦١٢ پ.ز) ئاشوور بالیت لە شاری حەڕان، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و پاشماوەکانی ئاشوور لە سەرکردە و پاڵە پاشکۆکانی لە دەور گردبوونەوە. پلانی درێژخایەنیان بۆ درێژەدان بە جەنگ و بەرگریی لەپێناو پاراستنی ئەو پاشماوە کەمە لە زەوی و خاکی مەمەلکەتی ئاشوور دارشت، لەپێناو مانەوەو پاراستنی پاشماوەی مەملەکەت، هیوای گەورەیان لەسەر هاوپەیمانێتی فیرعەونی میسر (نەخو- نخاو ی دووەم) هەڵچنی بوو، لەهەمان کاتدا چاویان بڕی بووە پاڵپشتی مەملەکەتی ئورارتو، کە لە ئاکامی جەنگیدا لەگەڵ ئیسکیتەکان بێ هێزو لاواز ببوو، ئەو مەملەکەتەی لە ترسی میدییەکاندا بەهەمان شێوەی سەردەمی جاران هاوڕێیەتی لەتەک ئاشوورییەکاندا پاراستبوو[٩٢].

لەولایشەوە هەردوو هاوپەیمانی میدی - بابلی دژ بەو هاوپەیمانێتییە دوشمنکارەیان لە پارێزدا بوون تا ڕێگە لە هەڵسانەوەی دەوڵەتی ئاشوور بگرن و کارێکی وابکەن جارێکی دی نەکەوێتەوە سەر پێی خۆی، بۆیە لە

---

(٩٠) (هاران)یشی پێ دەگوترێت و دەدرێتە پاڵ ناوی هۆزی هووری (خووری)ییەکان.

(٩١) دیاکونوف: میدیا، ص٢٩٤

(٩٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ساڵی (٦١٠ پ.ز) هەردوو سوپای میدی و بابلی ڕوویان لە شاری حەڕان کرد، ناچار ئاشوور بالیت و هاوەڵە میسرییەکانی شارەکەیان چۆڵ کردو پەنایان بۆ شاری کرکمیش (قرقمیش)ی ئەو بەری ڕووباری فورات برد. هاوپەیمانە میدییە بابلییەکە بە ئاسانی دەستی بەسەر شاری حەڕاندا گرت و ئیتر ئەو شارە بوو بە بەشێک لە مەملەکەتی کلدان، پاشان سوپای مادەکان پاشەکشەی کردو گەڕایەوە بۆ باوەشی نیشتیمانی دایک[٩٣]، بەڵام لەو لاوە پەلامارو بەگژداچوون و شەڕ لەنێوان هەردوو لادا، تا بەهاری (٦٠٩ پ.ز) درێژەی کێشا.

لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا سوپای فیرعەون گەیشتەجێ و لەتەک هێزی ئاشوور پەلاماری حەڕانیان دا. وا دەردەکەوێت هێزێکی کەمی بابلی بەرگری لە شار دەکرد. لە مانگی ئەیلوول هێزەکانی نابوپۆلاسەر بۆ شکاندنی ئابلۆقەی حەڕان گەشتەجێ، لەو دەمەدا ئاشوور بالیت هەوڵی پێوەندییکردنی بە ئۆرارتووە دەدا، بەڵام میدییەکان گورزێکی کوشندەیان ئاراستەی ئۆرارتو کرد و دەستیان گەشتە (تۆشپا)ی پایتەختی نێزیک دەریاچەی (وان) و مەملەکەتی ئۆرارتۆیان کۆنترۆڵ کرد. ساڵی (٦٠٥ پ.ز) هێزە هاوپەیمانەکەی میدی- بابلی شاری کرکمیش و هێزە ئاشوورییە میسرییە مۆڵخواردووەکەیان ئابلۆقەداو کۆنترۆڵیان کرد، چونکە شاری کرکمیش کەوتبووە نێزیک ڕووباری فوراتەوە، بۆ ئاسانکاریی گواستنەوە گرینگی خۆی هەبوو، لەهەمان کاتدا ڕێگەی کاروانەکانی نێوان سوریاو وڵاتی نێوان دووڕووبار لەو شارەدا یەکیان دەگرتەوە، کۆنترۆڵکردنی ئەو شارە بە سوپای بابلی سپێردراو کەوتە بەر بەشی بابل و نەبوخەزنەسر زۆر بە ئاسانیی بەبێ ئەزیەتێکی ئەوتۆ چووە ناو شارەکەوە[٩٤].

بەو شێوە خۆری یەکێک لە گەورەترین ئیمپراتۆرییەتی جیهانی کۆن تاهەتا ئاوابوو و ڕۆژئاوای ئاسیا بەسەر چوار دەوڵەتدا، کە ئەمانەی خوارەوە بوون دابەش بوو:

---

(٩٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٤-٢٩٥.

(٩٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٦.

مەملەکەتی میدیا، مەملەکەتی بابلی نوێ، مەملەکەتی لیدیا لە ئاسیای بچووک و مەملەکەتی میسر. سەبارەت بە کەوتنی مەملەکەتی ئاشوور عەبدولحەمید زاید، دەڵێت: "**چوار هێز، میدیا، کلدیا، لیدیا، میسر، ڕۆژئاوای نێزیکیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد، بەڵام دەکرێ تەنیا میدیا بە ئیمپراتۆرییەت بژمێردرێت**"[٩٥].

## کەیخوسرۆی بلیمەت

بلیمەتی کەیخوسرۆ لە ڕووخاندنی ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن و بەهێزدا کورت ناکرێتەوە، لە گۆڕەپانەکانی جەنگیشدا قەتیس نابێت، بگرە لە مەیدانی بەڕێوەبردن و سیاسەتدا بە ڕوونی خۆی دەنوێنێت. ئەو ئیمپراتۆرییەتێکی مەزنی دامەزراند. ئیمپراتۆرییەتێک لە ڕۆژئاواوە بە ئەفغانستاندا شۆڕ دەبووەوە بۆ سنووری لیدیا (ناوەڕاستی تورکیای ئەمڕۆ)، تا دەگەشتە کەناری باکوری ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست لە ڕۆژئاوا، لە باکورەوە لە دەریای قەزوینەوە بۆ باشوور تا تەنگەی هورمز لە کەنداوی فارس (عارەب). ئەو یەکەم سەرکردە بوو؛ گشت گەلە ئارییەکانی لە ڕۆژئاوای ئاسیا یەکخست و لە سایەی یەک دەوڵەتدا کۆی کردنەوە.

ڕاستە بە ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور، ئیسکیتە هێرشبەرەکان دۆستێکی گەورەیان لە کیس چوو، سەرەڕای پەڕوباڵکردنیان بە دەستی پاشای میدیی و پەلکێشکردنیان بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام ئیسکیتەکان هەمیشە هەلیان دەقۆستەوەو شەڕی میدییەکانیان دەکرد، بۆیە کەیخوسرۆ هێرشی بردە سەریان و تێکی شکاندن و ناچاری کردن بەرەو ڕۆژئاوا هەڵێن و پەناببەنە بەر مەملەکەتی لیدیای هاوسێی مەملەکەتی میدیا. هێڵی سنووریی نێوان ئەم دوو مەملەکەتە ڕووباری هالیس (قیزیل ئیرماق)بوو.

---

(٩٥) عبدالحمید زاید: الشرق الخالد، ل٥٨٥.

کەیخوسرۆ، داوای لە ئیلیاتتس ـ ی پاشای لیدیا کرد، تا ئیسکیتە هەڵاتووەکانی ڕادەست بکاتەوە، بەڵام ئیلیاتتیس دەستی بەڕوویەوە ناو داواکەی ڕەت کردەوە.

بۆیە ساڵی (٥٩٠ پ.ز) میدیا شەڕی لیدیای ڕاگەیاندو کەیخوسرۆ سەرکردایەتی سوپاکەی کردو بەرەو ناوەندی ئەنادۆڵ چوو.

لیدییەکان هانایان بۆ هاوپەیمانە فریجیەکان و چەند هێزێکی دی ئاسیای بچووک برد. لەم لایشەوە کەیخوسرۆ داوای هاوکاری لە نابو پۆلاسری بابلی هاوپەیمانی کردو جەنگ بۆ ماوەی شەش ساڵ درێژەی کێشا، بەڵام هیچ لایەکیان شەڕەکەیان نەبردەوە. بەڕێکەوت ڕۆژێک خۆر گیراو تاریکی باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا، هەر دوولایەنی شەڕکەر گەشتتە ئەو بڕوایەی کە ئەم خۆرگیرانە تووڕەبوون و غەزەبی خوداوەندە، چونکە شەش ساڵی خوێنڕشتن بێزاری کردووە، بۆیە ئاشتییان ڕاگەیاندو هاوپەیمانێتییان مۆرکردو بۆ بتەوکردنی ئەو هاوپەیمانێتییەش **(ئاستیاگ)**ی کوڕی کەیخوسرۆ و **(ئەرییینس)**ی کچی ئیلیاتس، هاوسەرگیریان پێکهێنا.

هەردوولا بۆ درێژەپێدان و بەهێزکردنی ئەو پێوەندییە، کە هاتبووە ئاراوە، ئارەزووی زۆریان نواند، بۆ ئەو مەبەستەش هەردوولا بە خوێنی خۆیان پەیمان و بەڵێنیان بۆ یەک تازە کردەوەو هەریەک لە کەیخوسرۆ و ئیلیاتتس مەچەکی خۆیان بریندار کرد و ئەم زامی ئەو و ئەویش زامی ئەمی بە زوبان لستەوە[٩٦].

ڕاستترین مێژووی ئەم ڕووداوە ساڵی (٥٨٥ پ.ز) بووەو لەو ساڵەدا، کە کەیخوسرۆ کۆچی دوایی کردو ئەستیاگی کوڕی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت.

---

(٩٦) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٦٣-٦٤. دیاکونوف: میدیا، ص٣٠٢. هارفی بورتر: موسوعە مختصر التاریخ القدیم، ص٨٧.

# (٧)

## پادشا( ئەستیاگ)ی میدی و ڕووخانی مەملەکەتی ماد

## (دوای ساڵی ٥٥٠ پ.ز مردووە)

### خوێندنەوەی مێژوو

بۆ خوێندنەوەی مێژوو ڕێبازی فرە هەن، کە خوێنەر پێڕەویان بکات. خوێنەر هەیە لە گۆشەی مەعریفی و پشکنینی قەوماوەکان دەست بۆ کتێبە مێژووییەکان ڕادەکێشێت و ئارەزووی گەڕانە بەدووی ڕاستییەکاندا، ئەم جۆرە خوێنەرە دەخوازێت پەی بەو ڕووداو و گرفت و ململانێیانە بەرێت، کە لەسەر زەوی گوزەراوە.

برێکێش لە گۆشەنیگای زانستی فەلسەفییەوە مێژوو دەخوێننەوە؛ دەخوازێت ئەو فاکتەرە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆیانە ئاشکرا بکات، کە دەستیان هەبووە لە خوڵقاندنی مێژووداو حەزیەتی پەنجە بخاتە سەر پاڵنەرە شاراوەکانی پشت ڕووداوەکانی و دەکۆشێت هۆو ئەنجامەکان بەیەکەوە گرێ بدات و ڕێڕەوە گەورەکان و ئاڕاستەکانی ڕەوتی نەتەوەکان و بیر و بۆچوونەکانی دەستنیشان بکات.

برێکی دیکەیش لە گۆشەی ئاشنابوون بە ئاکار و ڕەوشتی پێشینان و تەمای پەندوەرگرتن، مێژوو دەخوێننەوە. ئەو گەرەکێتی چاکە و خراپە و

سوود و زیانەکانی ڕەفتاری دێرینەکان بزانێت و لە چاکەی چاکەکاران بڕوانێت و لە خراپەی خراپەکاران وردبێتەوە تا لەئەنجامدا وەک وانە لە کار و کرداری مێژینەیانەوە شتێک فێربێت، کەسانێکی دیکەیش هەن مێژوو دەخوێننەوە و بە دوای ناسنامە شێوێنراوەکان، ڕەچەڵەکە بزربووەکان، نیشتیمان و خاکە زەوتکراوەکان، فەرهەنگە دزراوەکان و مافە پێشێلکراوەکاندا دەگەڕێن تا چەوتییەکان ڕاست بکەنەوە و ڕەوابیان پێ ببەخشننەوە و ڕووی ئەو تاوانانە هەڵ بماڵن، کە دژ بە باوباپیران ئەنجام دراوە و پیرۆزییەکان، کە لە ڕێگەی درۆکردن و بوختان هەڵبەستنەوە بێ نوێژ و ناشیرین کراوە، ئەو بیسمیلیان بکاتەوە و بە پاک و خاوێنی بیانخاتەوە بەرچاو.

خەڵکی واش هەیە لە گۆشەنیگای نەرگسییەتی ڕەگەزپەرستییەوە مێژوو دەخوێنێتەوە، ئەم جۆرە کەسە بەدووی ئەو ڕووداوەدا دەگەڕێت، کە پێوەستە بە هۆزکەی یاخۆ میللەتەکەی یان ئاین و ڕێبازەکەی خۆیەوە، ئەگەر ڕێڕەوی ڕووداو و ئەنجامەکەی بە دڵ بوو، ئەوا دەیڕازێنێتەوەو گەورە و جوانی دەکاتەوەو خۆی پێوە هەڵدەکێشێ، لەهەمان کاتدا بەدووی مێژووی کەسانی تردا دەگەڕێت تا کارە چاکەکانیان بشارێتەوەو جوانییەکانیان بزر یاخۆ بچووک و گرگن بکاتەوە. با بپرسین و بزانین ئەم تەرزە کەسە بۆ وا دەکات؟

ئەو چاوی بەرایی نادات بوونی ئەوانی دیکە ببینێت، مادام نایپەرستن و کلکایەتی بۆ ناکەن و ئەو بەگەورە نازانن و گوێڕایەڵی نابن.

کەسانێکی تریش هەن بە زهنییەتی ئیمپراتۆرانە مێژوو دەخوێنێتەوە، ئەم جۆرە کەسە شەیدای دۆزینەوەی سەروەرییە مەزنەکان و هەڵپەی کاوێژکردنی ڕووداوە خوێناوییەکانە، ئەو ڕووداوانەی کە سەری تێدا پەڕێنراوەو وڵاتانی تێدا کاول کراوە، ئەم کەسە پێی خۆشە ئەو سەردەمە پیرۆز بکات، کە باوباپیرانی شمشێریان هەڵ دەکێشاو نەتەوەکانیان لەناو دەبرد و وڵاتانیان داگیر دەکرد و ستەمیان بەسەر خەڵکدا دابەش دەکرد و

سامانی ئەوانی دیکەیان بە تاڵان دەبرد و دەرد و بەڵایان بەسەریاندا دەباراندن و ژەهریان پێ دەنۆشین.

## سەردەمانێکی بەسەرچوو

بڕوامان وایە باشترین خوێندنەوە بۆ مێژوو ئەو خوێندنەوەیە، کە حەزی تێگەشتن و دۆزینەوەی شاراوەکانی لە پشتەوەیە، خوێندنەوەیەک ڕووداوەکانمان وەکو خۆی پێ بناسێنێ و یارمەتیمان بدات لە جیاکردنەوەی چاکە لە خراپەو ڕووداوە سوودبەخشەکانمان لە زیانبەخشەکان بۆ هەڵاوێر بکات، بەرئەنجامیش ناسنامە و شکۆمەندی و تام و بۆی ڕۆشنبیری و حورمەتی جوگرافیای نەتەوە جیاجیاکانی تیایدا پارێزراو بێت.

دەکرێ خوێندنەوەی مێژوو دوور لە زهنییەتی ڕەگەزپەرستی و حەز و ئارەزووی داگیرکاری ئەنجام بدرێت و ببێتە هۆی پتەوکردنی پێوەندیی ڕاست و دروستی نێوان گەلان و پردی پێوەندیی نێوان نەتەوەکان و کلتوورەکانیان و یارمەتیدەر بێت لە پەروەردەکردنی نەوەی نوێ لەسەر بناخەی خۆشەویستی و ڕێزگرتن و دیدگەی مرۆڤدۆستانە. خوێندنەوەیەک لەسەر پاراستنی بوون و ناسنامەی نەتەوەکان دوور لە ناشیرینکردن و ڕەتکردنەوەی ئەوی دی پێدابگرێت.

بەڵێ، لەم سەردەمەدا شمشێر ڕاوەشاندن و چەپۆکان و حیلەی ئەسپ و کرێگرتەیی و جاشایەتی و داگیرکاری و چەوساندنەوەی گەل و نەتەوەکان و دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبی بەسەرچوو، هۆش و ئاگایی مرۆڤی چەرخی بیست و یەک، ئیتر ئەم خەونە نەرگسی و پەتاهەڵگرەی پێ قبووڵ نییەو بۆی هەرس ناکرێت.

ئەرێ، لەم چەرخەدا سەروەریی و شکۆ تەنیا بۆ زانست و ماریفەت و شارستانییەتە، ئەو کارەی کە دەشێت شانازیی پێوە بکرێت، کارێکە گواستنەوەی گەلانی دواکەوتوو چەقیوی نێو تاریکیی بۆ نێو سەردەمی

پێشکەوتن و ژیاندۆستیی و ئاسایش دەگوازێتەوە، تەنیا شانازیی و شکۆمەندیی بۆ مرۆڤ گواستنەوەی مرۆڤە ستەمدیدەکانە لە دۆخی هەژاری و برسییەتی و ئازارچەشتنەوە بۆ سەردەمی چاندنی تۆوی هیوا و ئاسوودەیی لە دڵ و دەروونیاندا، ئەم ڕۆژگارە ڕۆژگاری ڕەسمکردنی زەردەخەنەیە بەسەر ڕووخساری چەوساوەکانەوە.

لە خوێندنەوەدا بۆ مێژووی ڕۆژئاوای ئاسیا ڕاستییەکی فرە تاڵم بۆ ئاشکرا بوو، لێرەدا هەوڵ دەدەم چڕی بکەمەوە.

ئێمەی گەلانی ئەم ناوچەیە، بە فارس و عارەب و کورد و کلدان و سریان و ئاشووری و سوببی (مەندائییەکان)و ئەرمەن و ترک و... هتد، هەر هەموو لە داڕووخانێکەوە بۆ داڕووخانێکی تر ملمان ناوە، لە سڕبوون و خەوێکی قووڵی چەرخی ناوەڕاست بە ئاستەم بەئاگا هاتین و لە چەرخی نوێدا بە توندی دەستمان دایە یەکتر ڕەشکردنەوە و شێواندنی مێژووی یەکدی. ئەو شانازیی بە ئیمپراتۆرییەتی باوباپیرانییەوە دەکات و بەرانبەرەکەی بچووک و بستەباڵا نیشان دەدا، یەکێکی تر نەتەوەکەی خۆی بە گەورەو سەرداری هەموو دنیا دەزانێ و هەموو گەلانی ناوچەکە لە چوارچێوەی پرسی خێڵەکەی یاخۆ نەتەوەکەی یان ئاینەکەی یاخۆ ئاینزایەکەی خۆیدا گرد و بچووک دەکاتەوە، جا (ئەویدی) ئەم گردکردنەوەی بەدڵ بێت یان نە، دەبێت گوێڕایەڵ لە خزمەت نەتەوەی باڵادەستدا هەردەم دەست لەسەر مشتی خەنجەر بۆ خزمەتکردن ئامادە بێت، ئەگینا بێ پێچوپەنا بە دوژمن و ناپاک، دەستە و تاخمی یاخی و بەکرێگیراو تۆمەتبار دەکرێت، ئیتر جگە لە پەراوێزخستن و پشتگوێخستن و سزادان هیچ مافێکی دیکەیان نییە، خۆ ئەگەر نووزەیەکی نارەزایەتییان بەرز بێتەوە، ئەوا شمشێر بەسەر سەریانەوە سێبەر دەکات و هەر شمشێریش دێتەگۆ.

ئەوسا لە خۆم دەپرسی: ئەرێ ئەوە چی بوو وا ئەم بەڵایەی بەسەردا هێناین؟

پاش پشکنین و ڕامانێکی زۆر، بۆم ڕوون بووەوە، کە پرسەکە پێوەندیی بە چۆنییەتی خوێندنەوەمانەوە بۆ مێژوو هەیە، کەواتە ئێمەی ڕۆشنبیر

بەتایبەت، دەبێ لە کام گۆشەنیگاوە مێژووی ڕۆژئاوای ئاسیا بخوێنینەوە؟ ئایا لە گۆشەی ڕەگەزپەرستی و ئیمپراتۆرییانە بیخوێنینەوە یاخۆ لە گۆشەیەکی زانستی ڕەوشتمەندییەوە ئەو کارە بکەین؟ ئایا پێکهاتە مێژووییەکە بابەتییانە شی بکەینەوە یا لە پشت پەردەی نەتەوەو ئاین و مەزهەبەوە ئەو کردەیە ئەنجام بدەین و ئەو بابەتانەش، کە بەدڵمان نیین پشتگوێیان بخەین و بیانشارینەوە. ئایا دەستپاکییەوە ڕووداوەکان بگوازینەوە، یاخۆ بەخواست و ئارەزووی خۆمان بیانشێوێنین؟

بڕوام وایە بەر لە سەرکۆنەکردنی سیاسەتمەدارانی نەتەوەکان، پێویستە ڕۆشنبیرەکان سەرزەنشت بکەین.

من وای دەبینم، ئەو سیاسەتمەدارانەی ئەجینداى ئیمپراتۆرییەت لە ئەقڵییەتیاندا چەسپاوە، قوربانی دەستی ئەو ڕۆشنبیرانەن، کە نەوەی نوێیان بە ڕۆشنبیریی وەلاوەنانی ئەویتر پەروەردە کردووە، هەروای بۆ دەچم، کە هەنگاو هاویشتنی ڕاست و شیاو بۆ بەرەوپێشچوونی گەلان، سەرەتا لە نووکی پێنووسی ڕۆشنبیرانەوە دەست پێ دەکات.

یەکەم هەنگاو و نوتق بۆ ڕزگاریی گەلان، لە کوشتوبڕ و ناکۆکی و دوشمنکاری و گومان خستنەسەر و تۆمەتبارکردنی ناکۆتا، لە زار و زوبان و نووکی قەڵەمی ڕووناکبیرەکانەوە دەست پێ دەکات.

نازانم چی ئەم هەموو ختوورانەی بە زیهنمدا هێنا، لەکاتێکدا من خەریکی باسکردنی - ئەستیاگ- ی میدییم؟

ئەشێ نیازی خستنەڕووی مێژووی ئیمپراتۆرییەتێکی کۆنی ڕۆژئاوای ئاسیای سەدەی شەشی پێش زاین بێت، ڕایکێشابێتمە ئەو مەیدانەوە!

یا ئەو ترس و بێزارییەیە، کە لە قووڵایی نائاگاییمدا خۆی شاردووەتەوەو ئێستە دەژێتەوە، تا نەکەومە داو و دوای زهنییەتی ئیمپراتۆرییەتەوە، ئەو زهنییەتەی کە ئەشێ بڕێ لە ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوای ئاسیا گیرۆدەی بووبێتن و لە ئایندەدا تووشی ببن، دووریش نییە ئەو بێزاری و ڕقە خۆڕسکەی ناخم بێت لە ئاست هەر مەیلێکی ئیمپراتۆرییەت، بەو واتایەی کە بڕوام وایە بێ توندوتیژی و زۆرداری و پاوانخوازی و خۆسەپاندن ئیمپراتۆرییەت ناژێت؟

هەر چۆنێک بێت لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەشی کورد لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتدا لە هەزار ساڵ بەر لەدایکبوونی مەسیحەوە بیگرە تا بە ئەمڕۆمان دەگات، واتە بەدرێژایی سێ هەزار ساڵ هەر هەمووی بەسەر یەکەوە، نێزیکەی سەدەو نیوێکی خایاندووە، بەپێی قسەی هیرۆدۆت[97]، مەملەکەتی میدیا نێزیکەی (١٢٨) ساڵی تەمەن کردووە، بەڵام لەم تەمەنەیدا ئیسکیتە هێرشبەرەکان مەملەکەتی میدیا و وڵاتە هاوسێکانی بۆ ماوەی (٢٨) ساڵ داگیر کردووە، واتە میدییەکان لە ماوەی ئەو سەد ساڵەی نێوان (٦١٢-٥٥٠ پ.ز)؛ شەست ساڵ حوکمی ئیمپراتۆرییەتیان کردووە، لەنێوان ساڵەکانی (١١٧٥-١٢٥٠پ.ز) واتە بۆ ماوەی حەفتا و پێنج ساڵ، لە سەردەمی ئەیوبییەکانیشدا، کورد حوکمی ئیمپراتۆرییەتی کردووە.

ئێستە با بگەڕێینەوە لای ئەستیاگی دوا پاشای ئیمپراتۆرییەتی ماد و با بزانین ئەو پیاوە کێ بوو؟ ئەی مەملەکەتی میدیا چۆن ڕووخا؟

## پاشا ئەستیاگ

لە لاپەڕەکانی پێشوودا گوتمان؛ لە ڕۆژئاوای ئاسیا مادەکان پاشکۆیەتی ئیمپراتۆرییەتی بەهێز و شڕەتی ئاشوورییان بەسەردا سەپابوو. زانیشمان، کە دەیاکۆ (دیوکۆ)ی سەرکردەی میدییەکان، یەکەم کەسایەتی بوو هۆزە پەرتوبڵاوەکانی میدیای گلێر کردەوەو تاکەکانی لە زهنییەتی (خێڵەکییەوە) گواستەوە بۆ زهنییەتی (نەتەوە) و شاری ئەگباتانای پایتەختی بونیادنا، کۆشکێکی پاشایەتی دروست کرد، بە فەرمانی پاشایەتی و دەرکردنی یاسا کاروباری کۆمەڵگەی ڕێکخست. پاش دامەزراندنی دامودەزگەی دەوڵەت دژ بە دەسەڵاتی ئاشوورییەکان شۆڕشی هەڵگیرساند، بەڵام لە یەکەم بەگژداچوونەوەی ئاشوورییان شەڕەکەی دۆڕاندو لەتەک خێزان و برێکی زۆر لە دەرباری کۆشک بۆ شاری (حەما)ی سوریا دوورخرایەوە، ئینجا پاش ماوەیەک هێنرایەوە بۆ ئاشوور و وەک بارمتە لە ئاشوور دەست بەسەر کرا.

---

(٩٧) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٩٣.

باس و خواسی خەشتریت (فراورتیس)ی ژیر و داناماں زانی، کە پاش دەیاکۆی باوک دەسەڵاتی گرتە دەست و لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا کەوتە خۆ و جارێکی تر هۆزە میدییەکانی گلێر کردەوە و تەواوی مەملەکەتەکەی وەک جاری جاران لە ڕووی هێزو سەربەخۆییەوە بونیات نایەوەو برێک لە خێڵە ئارياییەکانی تری وەک سیمیرییەکان Cimmerians و ئیسکیت Scythians و مانناییەکانmannaean، ئوراتۆ ourartens و فارسەکانی خستە ژێر ڕکێفی خۆی و باج و خەراجیشی لە دەوڵەتی ئاشوور گرتەوە تا دواجار هەڕەشەی لێ کردو بەگژیدا چوو، لەو بەگژداچوونەوەشدا زۆری نەمابوو بەسەر ئاشوورییەکاندا زاڵ بێت، بەڵام ئیسکیتە هێرشبەرەکان دووریی خەشتریتیان لە ناوەند قۆستەوە و لەپشتەوە پەلاماری مەملەکەتەکەیان داو داگیریان کرد، بۆیە بەناچاریی پاشەکشەی بە سوپاکەی کردو گەڕایەوە بۆ مەملەکەت.

دوای مەرگی خەشتریت کەیخوسرۆی کوڕی دەسەڵاتی گرتە دەست و لەسەر دەستی ئەم کەڵەمێردە سکیتەکانی تێک شکاند و میدیا ڕسگاری بوو. دیارو ئاشکرایە، کە هەر بە هەوڵ و کۆششی کەیخوسرۆ بوو ئیمپراتورییەتی ئاشوور ڕووخا، هەروەها زانیشمان، کە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەودا میدیا لە دەوڵەتێکی ئاساییەوە بوو بە ئیمپڕتورییەتێکی مەزنی ڕۆژئاوای ئاسیا.

پاش کۆچی دوایی کەیخوسرۆ لەساڵی (٥٨٥ پ.ز) ئەستیاگی کوڕی، کە بە ئەستیاگز (ئەستیاجیس- astuages) ناسراوە جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و لەنێوان ساڵی (٥٨٤-٥٥٠ پ.ز) حوکمڕانی کردووە.

مێژوونووسی ئەرمەنی موساخورینی ئەستیاگی بە (ئەژدەهاک) ناو هێناوە، بە زمان و لەسەر زاری ئارياییی کۆن بە (ئەریشتڤاگا- arishtivaiga) ناوی هاتووە، کە واتای (تیرهاوێژ) دەگەیەنێت، ئەمەش ناوێکی کوردییەو واتای (ئەو کەسەی تیر دەهاوێژێ – recht avaije) دێت.

هەر لەم بارەوە (میهرداد ئیزدیی) دەڵێت: "ئەستیاگز، **ئازهی دەهاک** (ئەژی دەهاک- Azhi Dahak)ەو لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا بە ناوی (زوحاک)ی ستەمکار ناسراوە. دوور نییە عارەبە موسڵمانەکان، ئەم زانیارییانەیان لە سەرچاوە فارسییەکانەوە هەڵێنجابێت، لەڕاستیدا ئەو زانیارییانەی کە لە

سەرچاوە فارسییەکانەوە وەرگیراون و پێوەستن بە پاشاکانی ماد، بەگشتیی نابابەتیین و دوورن لە دەستپاکیی مێژوویی.[٩٨]

لەڕاستیدا زۆربەی ناوی پاشاکانی ڕۆژئاوای ئاسیا لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بە پلەی یەک دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنی ناو و نازناو. ئاخر ناو یەکێکەو نازناو هەزار، ئەمە نەریتێکی ئاساییە، چونکە پاشاو گەورە پیاوانی ڕۆژهەڵات بە گشتی زۆریان حەز لێ بووە! خراپ نییە لێرەدا بڕێ نازناوی خەلیفە و وەزیر و گەورە زاناکانی سەردەمی ئیسلام بخەینە بەرچاو.

کەم کەس دەزانێت خەلیفەی عەباسییەکان، موعتەسەم بیللا ناوی (ئیسحاق) بووە و ناوی ئەلناسر سەلاحەدین (یوسف) بووە.

نێزیکترین نموونە لەم بارەوە ئەو هەموو نازناوەیە، کە دواپاشای ئێرانی چەرخی نوێ، حەمە ڕەزای پەهلەوی بۆ خۆی دایتاشی بوو: (شاهنشاه = مەلیکی مەلیکەکان)و (ئوریامیهر) واتە خۆری ئارییەکان.

## هەڵە کوشندەکان

ئەستیاگ مەملەکەتێکی بەهێز و پانوپۆڕی بە میرات بۆ بەجێما، مەملەکەتێکی دامەزراو و پتەوی لێوڕێژ لە خێر و بەرەکەتی زۆر و زەوەند، کە لەتەک دەوڵەتی بابلی دابەش کردبوو. مەملەکەتێک لە ڕۆژهەڵاتەوە و لە کەنداوی فارس (عارەب)ـەوە شۆڕ دەبووەوە بەرەو ڕۆژئاوا تا دەگەیشتە دەریای سپی ناوەڕاست و وڵاتی فارس و کوردستان و ئازربایجان و ئەرمەنستان و باکوری سوریای لەخۆ گرتبوو، بە بەراورد بە دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکان دەبووایە ئەم پادشایە دەوڵەتەکەی لە جاران فرە بەهێزتر بکردایە سامانەکەی بە کاری پڕوپووچ بەفیڕۆ نەدایە و بیپاراستایە تا لەو ڕێگەیەوە مەملەکەتەکەی چاکتر پێشخستایەو گەشەی پێ بدایە، بەڵام شتەکان پێچەوانە کەوتنەوە و کار لەکار ترازا، کەواسا با هەڵەکانی ئەستیاگ

(٩٨) دیاکونوف: میدیا، ص٣٢٢ و هەروەها Mehrdad Iazady:Thekards, P43

بنووسینەوە و ئەو دیاردە زیانبەخش و خراپانە دەستنیشان بکەین، کە دوومەڵئاسا وەک شێرپەنجە لە جەستەی کۆمەڵگەی میدیدا بەدەرکەوتن و بوون بە هۆی رووخانی مەملەکەتی ماد:

**یەکەم**: ژیاننامەی ئەستیاگ پێمان دەڵێت ئەو پادشایەکی بەتوانا و دووربین نەبووە و لە دادپەروەری و خۆنەویستیدا نەیتوانیوە ببێتە پێشەنگی گەلەکەی، پێچەوانەی ناوەکەی (تیرهاوێژ) ئەو پاشایەکی بێزار لە سەرکردایەتیی سوپا و جەنگ و هەردەم مەیلی بەلای ڕابواردن و خۆشگوزەرانیدا چووە و لەناو چوار دیواری کۆشکی پاشایەتیدا شەوی داوەتە دەم ڕۆژەوە و بەسەر گەنجینەی لێوانلێو لە دراو و زێڕ، هۆشی لەدەست داوە و چاوی ئەقڵی کوێر بووە تاڕادەیەک دیۆرانت ناوی لێناوە "ستەمکارە ژنانییەکەی ئەگباتانا"[٩٩].

**دووەم**: ئەستیاگ بناخەیەکی دەستووری هەڵتەکاند، بناخەیەک، کە بۆ کۆمەڵگەی میدی یەکجار گرینگ بوو، ئەویش دەرچوون لە کۆدەنگی و پێڕەوی تاکڕەویی لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتداو سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەسەر گشت جومگەکانی دەوڵەتدا، لەکاتێکدا باوەگەورەی خانەوادەی میدیای فەرمانڕەوا، پاشا دەیاکۆ، شارەزاییەکی فرە باشی لە سایکۆلۆجییەتی چیا هەبوو، ئەو سایکۆلۆجییەتەی کە ڕەگوڕیشەی لە ناخی کەسێتی گەلی میدیدا داکوتابوو، بۆیە لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا تاکڕەویی و پاوانخوازی بەلاوەنا و دەوڵەتێکی لامەرکەزی و فرەیی دامەزراند بە شێوەیەکی وا، کە هەموو سەرکردەی لقە میدییەکان و سەرکردەی گەلانی سەر بە مەملەکەتی میدیا لە ڕەسم و جێبەجێکردنی سیاسەتی باڵا بەشداری کارایان دەکرد، هەر ئەم سیاسەتە ژیرانەی دەیاکۆ بوو دەوڵەتی بەزیندوویی و بەهێزو یەکگرتوو هێشتەوە.

**سێیەم**: ئەو پایە گرینگە ستراتیجییەی کە باوباپیرانی بایەخی زۆریان پێ دەدا، پایەی ئەو هاوپەیمانێتییە، کە هاوسەنگی نێوان هێزە هەرێمایەتییە سەرەکییەکانی ڕاگرتبوو، ئەستیاگ هات و ڕوخاندی.

---

(٩٩) ول ديورانت: قصه الحضاره، ص٢/٤٠٢.

ئەودەم، مەملەکەتی بابلییەکان (کلدان) بەهێزترین هاوپەیمانی مەملەکەتی ماد بوو. ئەگەر هاوپەیمانێتی نێوان پاشای میدی کەیخوسرۆ و پاشای کلدانی نابوپۆلاسر نەبووایە، لەوانەیە ڕوخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بە دەستی کەیخوسرۆ قورس بکەوتایەتەوە. ئیتر ئەودەم گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا تا ماوەیەکی نادیار لەژێر زەبرزەنگ و سەرکوتکردنی ئاشوورییە دڕندەکاندا بیان نالاندایە، گەورەترین هەڵەی ئەستیاگ بەرپاکردنی ململانێ دژ بە مەملەکەتی کلدان بوو. پاشای میدی بەوەشەوە نەوەستا هەڵی کوتایە سەری و لە هاوپەیمانێکی خزم و خۆشەویستەوە بۆ دوشمنێکی تۆڵەسێن و سەنگەرلێگرتووی گۆڕی، تا لە ڕۆژانی دواییدا وای لێ هات چاوەڕوانی هەلێکی لەباربوو تا زەبری کوشندەی لێ بوەشێنێ و تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە. ئەمە و بە هەڵسوکەوتە گێلانەکەی دەسەڵاتدارانی ئەرمەنستانی دۆست و دەراوسێی مەملەکەتی مادی ئاڵۆز کرد.

**چوارەم:** پەندێکی کۆن هەیە دەڵێت: "**خەڵکی لەسەر ئاینی پاشاکانیان**"[١٠٠]، گەورە پیاوانی میدیا هەمان پەندیان پێڕەوکرد، ئەوان پشتیان لە کۆشان کردو لە خۆش ڕابواردن و بەزمگێڕان و شەونشین و خۆشگوزەرانی و لوتبەرزیدا ڕێک لاسایی پاشا ئەستیاگیان دەکردەوە. ئەم هەموو بەرەڵایی و تەخشان و پەخشانکردنە لە سەروەت و سامان و گەنجینەی پڕ و دەوڵەمەندی کۆمەڵگەی میدی خەرج دەکرا.

ویل دیۆرانت باس لە لایەنێکی ئەم خۆشگوزەرانییە دەکات و یەژێت: "**داڕووخانی میدییەکان لە ڕێنیسانسەکەیان تیژو گورجتر بوو، ئستیاجیس، نیشتەجێی سیاخساری باوکی ئەو شتەی سەلماند، کە مێژوو بەر لەو سەلماندوویەتی، کە پاشایەتی سەرکێشییەکە ئەنجامەکەی باش ناکەوێتەوەو ژێری زیادو شێتی لە میراتگری موڵک و ماڵەوە فرە نێزیک دەبنەوە، بەوپەڕی دڵنیایی و ئاسوودەییەوە دەستی گرت بەسەر میراتەکەداو چێژی لێ دەبینی، ئیتر نەتەوەش لاسایی پاشای خۆیان کردەوە.**

---

(١٠٠) پەندێکی کوردی دەڵێت: "گەورە ئاو دەڕشێنێت و گچکە پێی تێ وەردەدات" (وەرگێڕ)

ڕەوشتی ڕەق و توندیان دۆڕاند، شێوەی ژیانە زبر و سەرسەختەکەشیان، چونکە سامانەکەیان زۆر بەپەلە بەپیرەوە هات و خاوەنەکەیشی نەیزانی چاکی بەکار بهێنێت، چینە باڵاکان بوون بە کۆیلەی ژیانی شێوە تازە و خۆشگوزەرانییەکە، پیاوەکان شەرواڵی چنراو و ڕازاوەیان لەبەر دەکردو ژنەکانیش بەبۆیە و ئاڵتوون خۆیان جوان دەکرد و دەڕازاندەوە، تەنانەت ئەسپ و ماینەکانیان بە زێڕ دەڕازاندەوە، لەکاتێکدا شوانە سادەو دڵسافەکان، فرە دڵخۆش دەبوون کاتێ سواری گالیسکەی نایاب و نوێ و گەورە و بەنرخ دەبن و لەم داوەتەوە بۆ ئەو داوەت دەچوون»[١٠١].

**پێنجەم:** بەفیڕۆدان و خۆش ڕابواردن هۆیەکی گرینگی دەرکەوتنی ناکۆکی ناوخۆ بوو لە لووتکەی (هەرەم)ی دەسەڵاتدا، لە کەشوهەوایەکی ئاوادا تۆوی خۆپەرستی دەتروکێت و خۆپەرستی نەشونما دەکات و هەڵپەی پارە پەیداکردن زیاد دەکات و پلەوپایە بۆ مەرامی کەسێتی بەکار دەهێنرێت و شوێنی شیاو بە کەسی ناشیاو دەسپێردرێت.

**شەشەم:** لە کەشوهەوای دەسەڵاتخوازی پاوانکارانەدا، خزم خزمێنەو ناسیاریی پەرەدەسێنێت و دادپەروەریی پاشەکشە دەکات و جیاوازیی چینایەتی لەناو کۆمەڵگەدا قووڵ دەبێتەوە و ستەم زیاد دەکات، لەبری یەکڕیزی و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕووداوە نەخوازراوەکانی ناوەخۆ و دەرەوە، گەل بەسەر دوو گرووپدا دابەش دەبێت، گرووپێکی خۆسەپێن، کە دەسەڵات و سامان بۆ خۆی قۆرخ دەکات و بۆ پاراستنی دەسکەوتە تایبەتەکانی توندوتیژی بەکار دەهێنێت. گرووپی دووەمیش بۆ ڕزگاربوون لە جەورو ستەم بە هەموو شێوەیەک کار دەکات.

**حەوتەم:** هەر کەسێک توانی دژ بە نێزیکەکانی خۆی ستەم بنوێنی، ئەوا گومانی تیادا نییە ئەو کەسە بەرانبەر کەسە دوورەکان لە ستەمکردندا سەرەڕۆترو بوێرتر دەبێت. من وای بۆ دەچم، کە ڕۆژێک ئەستیاگ بووبێت بە ستەمکار، خەمی گەورەی ئەم پاشایە چڕکردنەوەی دەسەڵات بووە لەناو هەردوو دەستیدا، تا لە دواییدا خەڵکەکە سەری بۆ شۆڕ بکەن و ملکەچی

---

(١٠١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠١/٢-٤٠٢. سیاخسار، هەمان کیخسرۆیە.

هەموو فەرمانەکانی ببن. ئیتر ئاساییە ستەم سەر بکات و لێی بڕژێت، بەرئەنجام دەستی گەلێکی پێ بگات، کە تا دوێنێ ملکەچی مەملەکەتی میدیا بوو، دیارە ئەودەم فارس بەهێزترین گەل بووە لە ناوچەکەدا.

## لێکدانەوەی ئەفسانەیی

هیرۆدۆت بەشیوەیەک باس لە ڕوخانی مەملەکەتی ماد دەکات، کە بەئاشکرا لێکدانەوەیەکی ئەفسانەیی باڵی بەسەر ڕووداوەکاندا کێشاوە، ئەمەش کورتەی گێڕانەوەکەیەتی: ئەستیاگ دوای کەیخوسرۆی باوکی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. شەوێک لە شەوەکان خەونێکی سەیری بینی، کە تایبەت بوو بە ماندانای[١٠٢] کچی. موغەکان(مجوس) خەونەکەیان بۆ لێکدایەوە، گوایە کچەکەی شوو دەکات، منداڵێکی دەبێت و تەختی پاشایەتی لێ زەوت دەکات، جا چونکە ئەستیاگ سووسەی خراپی لە گەورە پیاوانی ڕکابەری دەکرد، ئەو پیاوانەی لە ڕەسەنایەتی و ماقووڵیدا هیچیان لەو کەمتر نەبوو، بۆیە بڕیاری دا کچەکەی نەداتە هیچ یەک لە پیاوە نەجیبزادە میدییەکان، چوو کچەکەی دا بە قەمبیز (کەمبیز ـ کمبوجیا)ی دەسەڵاتداری فارس.

وا دەردەکەوێت ئەم دەسەڵاتدارە فارسە پیاوێکی لێوەشاوە و لێ هاتوو بوو بێت، بۆیە ئەستیاگ هاوسەرگیرییەکەی بەلاوە پەسەند بووە. دەشێت ئەم خزمایەتیکردنەی ئەستیاگ بۆ ڕاکێشانی کەمبیز بووبێت بۆ بەرەکەی خۆی تا هاوسەنگییەک دژ بە گەورەپیاوانی میدی بەدەست بهێنێت. ئەو گەورە پیاوانەی بۆ گەشتن بە ترۆپکی دەسەڵات، بەسەختی ململانێیان دەکرد.

ماندانا لە مێردە فارسەکەی کوڕێکی بوو ناوی کۆرشی دووەمی (kursh)[103]ی لێ نرا.

---

(١٠٢) ماندانا: (بەخششی ماند) دەگەیەنێت، بەو پێیە، کە (ماند ـ مەند) ناوێکی پیرۆزە و دەشێت ناوی خوداوەندێک بووبێت، ئەمەش لە کولتووری کوردیی کۆندا تائێستا بوونی هەیەو لە کولتووری ئاینی ئێزدیدا ماوەتەوە.

(١٠٣) کۆرش، قورش، سیروس cyrius و بە کەیخوسرۆی گەورەش ناسراوە.

لەم سەروبەندەدا ئەستیاگ خەونێکی دیکەی بینی و موغەکان هەمان خەوپرژێنی پێشوویان بۆ کرد و دووپاتیان کردەوە، کە نەوە فارسەکەی تێکی دەشکێنێت و دەست بەسەر دەسەڵاتدا دەگرێت، بۆیە ئەستیاگ بڕیاری لەناوبردنی کورشی ساوای دا، بەدوای کچەکەیدا نارد و لە شاری (ئەنسشان)ی پایتەختی هەرێمی فارسەوە لەتەک منداڵەکەیدا هێنایانەوە ئەگباتانا، پاشان سەرکردەی میدی و هاوڕێی نیزیکی، (هارپاجوس) **هارپاگ ی** Harpage[104] بانگ کرد و نهێنییەکەی لەلا درکاند.

ئینجا کوشتنی منداڵەکەی پێ سپارد و لە ئەگەری جێبەجێ نەکردنی ئەم فەرمانەیدا هەڕەشەی سزای قورسی لێ کرد، بەڵام چونکە منداڵەکە لەڕێگەی دایکییەوە سەربە بنەچەی پاشا بوو، هارپاگ نەیوێرا بە دەستی خۆی بیکوژێت، بۆیە داوای لە مترادات (بەخششی مترای خوداوەند) -شوانەکەی خۆی- کرد، منداڵەکە بباتە چیاو لە شوێنێکی ترسناکدا دای بنێت تا شێرەکان لەتلەتی دەکەن، دوایی قڵم و قازەکەی (پاشماوەکەی) بۆ بهێنێتەوە، بەڵام شۆخی و جوانی منداڵەکە ژنی شوانەکەی سەرسام کرد، ڕێک لەو کاتەدا شوانە منداڵێکی نەخۆشی دەمرێ، ژنە داوا لە مێردەکەی دەکات لەبری شازادە منداڵە مردووەکەی خۆی بباتە چیاو تەرمەکەی دەرخواردی ئاژەڵی دڕندە بدات و دوایی پاشماوەکەی وەک پاشماوەی کورش ڕادەستی هارپاگ بکاتەوە، بەم شێوەیە کورش جێی منداڵە مردووەکەیان دەگرێتەوە. هارپاگ، هەڵخەڵەتێنراو بڕوای بە مەرگی کورش هێناو هەواڵەکەی گەیاندە ئەستیاگ. ئەوجا ئەستیاگ هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵمژی و ئەو خەم و خەفەتەی کە ماندووی کردبوو لە کۆڵ بووەوە.

لە گوندەکەیداو لە قۆناخی لاوێتیدا، کورش کە لەگەڵ هاوڕێ گەنجەکانیدا گەمەی دەکرد وەک شازادەیەک هەڵسوکەوتی دەکرد و ڕۆڵی پاشای دەبینی، هەر کوڕی پیاوماقووڵێک سەرپێچی بکردایەو فەرمانەکانی جێبەجێ نەکردایە سزای دەدا. پیاوماقووڵانی دێ لەم ڕەفتارەی کوڕی شوانە بێزار بوون و

---

(١٠٤) لەوانەیە ناوی ڕاستی ئارپاک Ar pak واتە (ئاگری پاک) یان (ئاگرە پیرۆزەکە) بووبێت، بەڵام پیتی (س)ی کۆتایی ناوەکە مێژوونامە یۆنانییەکان پێوەیان لکاندبێ.

شکاتیان بردە لای ئەستیاگ. ئەستیاگ فەرمانی دا میترادات ـ ی شوان و کوڕەکەی بۆ بهێننە کۆشک. شوانە لەگەڵ کوڕەکەدا لە کۆشک ئامادە بوو. پاشا ڕوانییە منداڵەکەو وێنەی کۆڕشی لە ڕووخساریدا بینی. شوانەی هەڵپێچاو هەڕەشەی ئەشکەنجەدانی لێ کرد، شوانە ددانی بە ڕاستییەکەدا نا. پاشا منداڵەکەی لە کۆشکدا گلدایەوەو جارێکی دی ڕاوێژی بە گەورە موغەکان کرد، موغەکان بینییان مەترسییەکە بە سەلامەتی تێپەڕیوە. چون کوڕەکە لە گەمەکانیدارۆڵی پاشای بینیوە. هەر ئەمەش بووە، کە خەونەکە هێمای بۆ کردووە، بۆیە هیچ بیانوویەک نییە بۆ کوشتنی.

ئەستیاگ بڕوای بە لێکدانەوەی موغەکان کرد و کۆرشی گلدایەوە، بەڵام بڕیاری دا تۆڵە لە هارپاگ بکاتەوە، چونکە فەرمانی بەجێ نەگەیاندووە، تۆڵەکەشی بەم شێوەیە بوو: داوای لە هارپاگ کرد کوڕە هەرزەکارەکەی خۆی بهێنێتە کۆشک تا ببێتە هاوڕێی کۆڕش، کە هارپاگ کوڕەکەی هێنایە کۆشک پاشا فەرمانی دا بە نهێنی کوڕەکە بکوژن. پاشان میوانداریبەکی گەورەی سازکردو داوەتی هارپاگی کرد. لەو داوەتەدا هارپاگ تا پێی کرا لە گۆشتی برژاوو کوڵاوی نۆش کرد، کە تێری خوارد پادشا پێی گوت: "ئەوەی خواردت گۆشتی کوڕەکەت بوو"، ئەم ڕەفتارەشی، سزای سەرپێچیی و جێبەجێ نەکردنی فەرمانی پاشا بوو، هارپاگ سەری ڕەزامەندی بۆ پاشا لەقاند، هاوزەمان لە پاشا دوور نەکەوتەوە و بەردەوام چاوی بەدووی نهێنییەکاندا دەگێڕا، ئیتر لەو ڕۆژەوە بڕیاری دا کار بۆ خستنی ئەستیاگ بکات و لە تۆڵەی ئەم ستەمەدا لەناوی ببات.

## بێ ئاگایی و پیلان

لەکاتێکدا پاشای میدی لەلایەکەوە بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانییەوە سەرقاڵ بوو، لەلایەکی دیکەیشەوە ستەم و سیاسەتە هەڵەشەکانی پێڕەو دەکرد، لەولایشەوە لە سایەی دەسەڵاتی کەمبیزدا وڵاتی فارس پێشکەوتن و گەشەی گەورەی بەخۆوە دەبینی. دوای کەمبیزی باوک، کۆرش دەسەڵاتی کەوتە دەست، ئەشێت ئەم پیاوە بەنهێنی پلانی بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەی دارشتبێت. دووریش نییە هارپاگ ئەم مەیلەی لە کۆرشدا خوێندبێتەوە، بۆیە بڕیاری دا هاوپەیمانی لەگەڵدا ببەستێت، تا تۆڵە لە ئەستیاگ بکاتەوە. فەرموون با بزانین هیرۆدۆت لەم بارەوە چ دەڵێت: "**قۆرشی لاو پێگەیشت، لەنێو قارەمانەکانی فارسدا ناوبانگی دەرکرد و خەڵکی خۆشیان دەویست، هارپاجوسی تینووی تۆڵە، پێوەندیی پێوە کرد و لەڕێگەی نامەو دیاری ناردنەوە لێی نێزیک بووەوە، ئەو دەیزانی بەبێ یارمەتی لایەنێکی دی ناتوانێ سزای پاشا بدات، کاتێ بینی قۆرش لەخەم ڕسکاوە، بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی تێکۆشاو گوتی: ئەمیش وەک ئەو تووشی کۆمەڵێ بەڵاو مەینەتی بووە، بۆ بە ئەنجامگەیاندنی پلانی ڕووخاندنی ئەستیاگ پێوەندیی بە گەورە پیاوانی میدییەوە کردو پشتگیریانی مسۆگەر کرد. ئیتر ڕێگە خۆشە بۆ لەکارخستنی ئەستیاگی زۆردارو لەڕێ لادەرو لە جیاتی ئەو قۆرش لەسەر تەختی پاشایەتی مەملەکەتی میدیا دابنیشێت.**

**ئەو پلانەکەی ئامادەیەو حەزیەتی قۆرشی لێ ئاگەدار بکاتەوە، بەڵام بە هۆی دووریی ڕێگە بۆ گەیشتن بە وڵاتی فارس و پاسەوانی زۆرو توندکردنی بازگەی سەر ڕێگەوبانەکانی دەرموەی شار، کە ئەستیاگ قوتی کردوونەتەوە، ئەم لەمپەرانە هەموو، پەیوەندیکردنی بە قۆرشەوە قورس و مەترسیدار کردووە، لە**

کاتی تاوتوێکردنی ئەم بارودۆخەدا بیرو هۆشی کەوتەکارو فێڵێک زایە مێشکییەوە، بۆیە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە لە ڕێگەی ئەو فێڵەوە دەکرێت قۆرش لە پلانەکەی ئاگەدار بکاتەوە. فێڵەکەی بەم شێوەیە بوو: کەروێشکێکی کێویی هێنا و سکی هەڵدڕی، بێ ئەوەی تووکەکەی لێ بکاتەوە، ئەو قاقەزەی کە پلانەکەی تیادا نووسیبوو ئاخنییە ناو سکییەوەو جوان دووریییەوە. خزمەتکارێکی باوەڕپێکراوی بانگ کرد و کەروێشکەکە و تۆڕێکی ڕاوی دایە دەستی، تۆڕ و کەروێشک و ڕاوچی، ئیتر کێ گومانی لێ دەکات و ڕای دەگرێ؟ کەس.

ڕاوچی بە ئاڕاستەی وڵاتی فارسدا کەوتە ڕێ، واش ڕێنمایی کراوە، کە دەبێت کەروێشکەکە بگەیەنێتە دەستی قۆرش خۆی و بە دەستی خۆی و تەنیا بە ئامادەبوونی خزمەتکارەکە، زگی کەروێشک بکاتەوە.

کارەکە بە دڵی هارپاجوس چووە پێشەوە. قۆرش زگی کەروێشکی کردەوەو نامەکەی دەرهێناو ئەمەی خوارەوەی خوێندەوە:

هۆی کوڕی قەمبیز، خواوەند چاوەدێریی کردیت و خۆشی ویستی، ئەو نەبووایە تۆ نەدەگەیشتیتە ئەم ناز و نیعمەتەی ئێستەت، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە قەرزەکەی ئەستیاگ بژێریت، ئەگینا ئەو دەیکوشتیت، ئەوەی ئەو حەزی لێ بوو بۆی بچوایەتە سەر ئێستە تۆ مردبووی، کەواسا تۆ لەم سەرکەوتنەدا قەرزاری خواوەندو منیت، بێگومان تۆ دەزانیت ئەستیاگ چ پلانێکی دژ بە تۆ داڕشتبوو، ئەی پاداشتی من چ دەبوو کاتێ لەبری کوشتنت ڕادەستی شوانەکەم کردیت، ئەوەی من پێتدەڵێم تۆ بەجێی بگەیەنەو مەملەکەتی ئەستیاجیس هەمووی بۆ تۆ دەبێت. فارسەکان ئامادەی شۆڕش بکە و بکەوەڕێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی میدییەکان، زیانت پێ ناگات ئەگەر من یان هەر کام لە فەرماندەکان سەرکردایەتی ئەو سوپایە بکات، کە پاشا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەت دەینێرێت، چونکە نەجیبزادە میدییەکان یەکەم کەس دەبن پشت لەو بکەن، بە هەر جۆرێ بێ پێوەندییت پێوە دەکەن و هاوبەشت دەبن لە کۆششدا بۆ ڕووخاندنی و لە کۆتاییدا سەرکەوتن بۆ تۆیە. ئێمە

**هەمووما ئامادەی کارکردنین، بەپێی ئامۆژگارییەکانم هەڵسوکەوت بکە و لە کاردابە و دەسپێشخەربە"[١٠٥].**

هیرۆدۆت درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: "**ئەو نامەیە کاری خۆی کردو بیروبۆچوونی زۆر بە مێشکی قورشدا هات، بۆ دۆزینەوەی سەرکەوتووترین و ئاسانترین ڕێگە دەگەڕا، تا فارسەکانی پێ ڕازی باکات و دژ بە دەسەلاتی میدییەکان ڕاپەڕن. دەیان بیرۆکەی بە مێشکدا هات و سەرکەوتووترین بیرۆکە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەی ئەمەیە، کە دەیگێڕمەوە: لەسەر لوولە قاقەزێک شێوە فەرمانێکی گوایە فەرمانی ئەستیاگە و وەکو سەرکردەی سوپای فارس دەستنیشانی کردووە، نووسییەوەو ئامادەی کرد. پاشان لە ڕۆژێکی دیاریکراودا گشت سەرکردە فارسەکانی بانگێشت کرد و فەرمانە دەس هەڵبەستەکەی خۆی بۆ خوێندنەوە و سەرباریش وتی: ئێستە ئەوەتا ئەمە فەرمانەکەیە، بۆیە دەبێ هەریەک لە ئێوە سبەی بە داسێکەوە ئامادەبێت**"[١٠٦].

هیرۆدۆت ڕوونتر دەدوێت و یەژێت: "**نەتەوەی فارس کۆمەڵە خێڵێکن، ئەوانەی لە دەوری قورش کۆبوونەوە و بە هەڵگیرساندنی شۆڕش ڕازی بوون، هۆزی باسارجادای و مارفیان و ماسبیان بوون، لە نێو ئەم هۆزانەدا هۆزی باسارجادابیەکان بە نەجیبزادە ناسراون، نەک هەر ئەوەندە، بگرە یەژن پاشا ئەخمینییەکان هەموو سەر بەوانن و تیرەیەکن لە باسارجادابیەکان. هۆزە فارسەکانی تری وەک (بافتیالایان، دیروسیایان و جیرمانیان)ەکان، ئەم هۆزانە هەر هەموویان لەسەر خاکی خۆیان دەژین، بەلام هۆزەکانی دیکە؛ (دان، ماردیا، درۆبیکان، ساجراتیان)، ئەمانە خێڵی ڕەشماڵنشینی کۆچەرین**"[١٠٧].

---

(١٠٥) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ل٩١-٩١.

(١٠٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.

(١٠٧) دیاکونوف، ساگارتیان – Sagartian لەنێو ئەو خێڵانەدا دەژمێرێت، کە بەسەر خاک و زەوی مادەکانەوە دەژیان، دەشڵێت، کە سەرچاوە کۆنەکان دانشتوانی زیگیرتو و ساگارت سەر بە یەک ڕەگەزن و ناوی زیگیرتو لە زەمانی کۆندا بە بەشی باکوری ڕۆژهەلاتی ڕێرەوی ڕووباری قزل ئوزون (ڕووباری سپی) لە باکوری میدیا دەگوترا (دیاکونوف: میدیا، ل٩٣، ٢١٤)، بەلام ئەرشاک

هۆزەكان فەرمانیان بەجێ گەیاند و لە شوێنی دەستنیشانكراو پیاوە داسبەدەستەكان گلێربوونەوە و گوێیان بۆ ئەم فەرمانەی قورش شل كرد: ئەم زەوییە دڕكاوییە، كە پانتاییەكەی سێ هەزار و شەش سەد یاخۆ چوار هەزار یاردەیە دەبێ بدوورنەوە (درەو بكەن) و دڕک و دالەكەی كۆ بكەنەوە، كە پیاوەكان لە دروێنەی دڕک و دالەكە بوونەوە، قورش فەرمانی دانێ و داوای لێ كردن، سبەی لەهەمان شوێندا ئامادە بن، بەلام ئەم جارە خۆیان ششتبێت. بۆ سبەی قورش هەرچی مەڕو بزن و گاگەلی باوكی شک دەبرد سەری برین و سوپای فارسی هەموو داوەتی سەر خوانی ڕازاوە بەخواردنی بەتام و لەزەت و خواردنەوە كرد".

ڕۆژی دوایی میوانەكانی هەر هەموو كۆكردەوە و لەسەر پووش و پەلاشی ئەو دەشتە بۆ سەر خوانی ڕازاوەی فەرمووی لێ كردن، ئەو ڕۆژە، كە لە خواردن و خواردنەوەی پاشایانە لێ بوونەوە، قورش لای كردەوە پێی وتن: لەم دوو كارەی دوێنێ و ئەمڕۆ كامیانتان لەلا خۆش و بەدڵ بوو؟ كاری پرووكێنەری دوێنێ یان كەیف و سەفا و چێژی ئەمڕۆ؟ هەموو بە یەک دەنگ وەلامیان دایەوەو گوتیان عەزاب و مەشەقەتی دوێنێ و چێژ و تامی

---

**سافراستیان** لەسەر زاری مێژوونووسە گریكییەكانەوە دەڵێت: لەوانەیە خێلی (شكاك)ی كورد نەوەی ساكارتیان بن. دیسان لەسەر زاری هەمان ئەو مێژوونووسانەوە، دەڵێت: تاكەكانی خێلی ساكارتیان بە زمانی فارسی قسەیان دەكرد، بەلام جلوبەرگیان لەنێوان جلوبەرگی فارس و بەختی Pactyican دا بوو. (ارشاک سافراستیان: الكرد وكردستان، ص٤٠). **(باسیلی نیكیتین) لەمەڕ ساگارت، نووسیویەتی:** ساڵی ( ١٨٢٨) هیرز فیلدی هاوڕێم، لە ئۆكسفۆرد پێی گوتم: ئەكرێت ئەمانە بە پێشینانی كورد بژمێردرێن. ئەو بڕوای وابوو، كە ناوی شاری (سەعرد)ی سەر ڕووباری دیجلە، لە ناوی ئەوانەوە وەرگیرابێت. (ئەسكارتا) یان (ساكارتەكان)، سەرەتا لە شاری (سیستان) {= سەجستان لە باكوری ڕۆژهەلاتی ئێران، بەپێی سەرچاوە عارەبییەكان} لە سەردەمی ئاشوورییەكانداو لە ولاتی میدیادا بە ناوی (زیكیر) یا (زاكرتیی) هاتووە. (ستریک، المجلد الرابع عشر، ص١٤٦). لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دارویش پایتەختەكەیان دەكەوتە دەشتایی ئەربیلاوە، ئەودەم دارویش تشیتر ئەنتاكهامی پاشایانی لە قەنارە دا، وێنە هەڵكۆڵراوەكانی سەر بەردی بیستوون، وێنای نمونەیەكی كوردییە (كنک، لە نەقشی بیستوون، بە زمانی ئینگلیزی)، باسیلی نیكیتین: الكرد (دراسە سوسیولوجیة و تاریخیة)، پەراوێز، ١٣، ل٥٤ – ٥٥.

وا دیارە لێكچوونێكی دەنگی و واتایی ئاشكرا لەنێوان (ساگارت) و (زاغارت) و وشەی كوردی سەردەمە (زوغورت/ زوگورت)دا، بوونی هەیەو لە زمانی ڕەشۆكیی سوریادا بەربلاوەو واتای بوێر، نەبەرد، بەغیرەت، كە هیچ زەوی و زاری نییەو بەدەست و بازووی خۆی بژێویی پەیدا دەكات.

**خواردن و خواردنەوەی بەلەزەتی ئەمڕۆ (کوجا مەرحەبا)؟ هەر بەراورد ناکرێ!**

**قۆرش چاوەڕوانی وەڵامێکی ئاواهی بوو، ئیتر هەڵی قۆزتەوە و لە وتارێکدا مەبەستی خۆی بۆ ڕوونکردنەوە و وتی: کوڕگەلی فارس، گوێم بۆ شل بکەن و ڕێنماییەکەم ببیستن و ئازادیی خۆتان دەستەبەر بکەن. من ئەو پیاوەم، چارەنووس هەڵیبژاردووم تا ڕزگارتان بکەم، دڵنیام ئێوە لە جەنگدا هاوتای میدییەکانن، هەرچۆن لە بوارەکانی تریشدا هیچتان لەوان کەمتر نییە، ڕاستییەکەی دەڵێم دوودڵ مەبن و ڕاپەڕن و گەردنتان لە کۆت و بەندی ئەستیاجیس ئازادکەن، هەر ئێستە"[108].**

هیرۆدۆت درێژەی پێ دەدات و دەڵێت: **"قسەکانی قۆرش لە گوێی ئامادەبوواندا دەنگی دایەوە، چونکە فارس ڕقیان لە ژێردەستەیی میدییەکان دەبووەوە، ئەوەتا ئێستە سەرکردەیەکیان لێ پەیدابووە بەرەو ڕزگاریی ئاڕاستەیان دەکات، ئیتر جگە لە وتنی، (بەڵێ قوربان فەرمانتە) هیچی دیکەیان بۆ نەماوەتەوە"[109].**

ساڵی (٥٥٣پ.ز) کۆرش بانگی شۆڕشی دا بە گوێی فارس (پارس)ـەکاندا.

کۆڕش بارودۆخە هەرێمایەتییەکەی ئەو دەمی قۆستەوە، هاوپەیمانێتییەکی پتەوی لەگەڵ پادشای کلدانی (نابونید)، دژی میدییەکان بەست، بەر لەم گۆڕانکارییانە، ئەوە ئەستیاگ بوو پەلاماری بابلی دابوو لە هاوپەیمانەوە کردبووی بە دوژمن، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئەوەیە، کە لەو کاتەی ئەستیاگ و میدییەکان ڕوویان لە (پسار) کرد و لە جەنگێکی فرە سەختدا و لە ساڵی (٥٥٣ پ.ز) هەردوو سوپای میدی و فارس چنگاوشی یەکدی بوون، نابونیدی پاشای بابل بە هێزێکەوە ڕووی لە شاری حەڕان کرد، ئەو شارەی کە ئەستیاگ لە بن دەستی کلدانییەکان دەری کرد و لکاندی بە مەملەکەتەکەی خۆیەوە، نابونیدی بابلی دەستی بەسەردا گرت[110].

---

(١٠٨) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٩٢.

(١٠٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو: میدیا، ص٩٣.

(١١٠) دیاکونوف: میدیا، ص٢٩٤.

لەهەمانکاتدا کورشی دووهەم، هاوڕێی دیگرانی یەکەم و کوڕی یەروانت، حاکمی ئەرمەنستانی بن دەسەڵاتی میدی بوو، ئەوکاتەی کورش شۆڕشی دژ بە میدییەکان هەڵگیرساند، هاوپەیمانییەکی پتەوی لەگەڵ یەروانتدا بەستبوو، بەم شێوەیە لە ئاستی هەرێمایەتیدا دەستی نابووە بینی ئەستیاگ و بەوەشەوە ڕانەوەستا تا هاوپەیمانێتییەکی ژێراوژێری لەگەڵ ناودارترین سەرکردەی میدییەکان لە ئەکباتانا گرێ دا، بەتایبەتی لەگەڵ هارپاگی فەرماندەی گشتی سوپای میدیا، دیاکۆنۆف یەژێت: "**هارپاگی نەجیبزادە و سەرکردەی گشتی سوپای مید و بڕێکی دیکە لە سەرکردەکانی سوپا، پاڵیان بە کورشەوەدا و چوونە ڕیزی سوپاکەیەوە**"[111].

هارپاک، بە نهێنی سەرکردە میدییەکانی دژ بە ئەستیاگ هاندا و کەسایەتی شێواند. بەپێی گێڕانەوەکەی هیرۆدۆت، هارپاگ برێ لە موغەکانی بۆ ناو گرووپە پیلانگێڕەکەی دژ بە ئەستیاگ ڕاکێشا و ژێراوژێر پێوەندیی کرد بە کوڕشەوەو پێی ڕاگەیاند، کە دۆخەکە لەبارە بۆ خۆڕزگارکردن لە ئەستیاگ.

## ڕووخانی مەملەکەتی ماد

ئەستیاگ هەواڵی شۆڕشەکەی کوڕشی پێگەیشت. نامەیەکی هەڕەشەئامێزی بۆ نووسی و تێیدا چاوی لێ سوور کردەوە، لەهەمان کاتدا بۆ تێکشکاندنی شۆڕشەکە ئامادەباشی کرد، لەم بارەیەوە هیرۆدۆت دەڵێت: "**بەپەلە هەواڵ دوای هەواڵ گەیشتە ئەستیاجیس. بەدوای کوڕشدا ناردی و بە نێردراوەکەیدا هەڕەشەی لێ کردو بەڵێنی دا، کە لەکاتی پێویستدا دەگاتە سەری، جگە لە کۆکردنەوەی میدییەکان هیچی تری لەپێشدا نەمابوو، خەڵکی گلێر کردەوە و لەشکری ئامادەکرد، بەڵام ژیریی خیانەتی لێ کرد، ئەو لەبیری چوو بوو چ ستەمێکی لەبیرنەکراو و کوشندەی دەرهەق بە هارپاجوس کردبوو، بۆیە هارپاجوسی بە سەرکردەی گشتی هێزەکان دەستنیشان کرد. هەر ئەم ڕەفتارە نالەبارەی بوو وای کرد، کەمترین ژمارەی سەربازەکانی سوپا بەشداریی**

---

(١١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٣٩٢.

**پلانەکە نەبن و سەرسەختانە بجەنگن، کەچی لە گەرمەی جەنگدا زۆرینەی زۆری جەنگاوەرە میدییەکانیان بە دەم لاشەڕەوە لە گۆڕەپانەکە کشانەوە و ئیتر یاخۆ هەڵاتن یان پاڵیان دا بە سوپای فارسەوە".**[112]

سەرەڕای شکستە سەربازییەکەی، ئەستیاگ نەک هەر نە پەشۆکا، بگرە بڕیاری بەرگریکردنی داو ڕێی بە کۆرش نەدا بە ئاسانی سەرکەوێ، هیرۆدۆت دەڵێت: **"هەواڵی تێکشکانە شەرمهێنەرەکەی سوپای میدی ورەی ئەستیاجیسی نەڕووخاند، سوێندی خوارد نەهێڵێت قۆرش بە هاسانی سەرکەوێت لەشەڕەکەدا، دەستی دایە ڕەشبگیری و چەکی بەسەر گەورەو گچکەدا دابەش کرد، هاوزەمان بە نێزە (نووکەڕم) ئەو مووغانەی کوشت، کە دواخەونیان بۆ لێکدایەوە، ئەو لێکدانەوە، کە ئازادکردنی قۆرشی بەدوودا هات، لە شەڕگەکەدا سەربازەکانی هەموو کوژران ، لە کۆتایشدا ئەستیاجیس گەمارۆدراو خۆی بەدەستەوە دا"**[113].

دوای ئەو زۆرانبازییە سەخت و قورسەی دژ بە کۆرش، کە سەرسەختانە بەرگری لە تەختی پاشایەتی و گەلەکەی کرد، لە هەڵوێستەکانیدا ڕوون دەبێتەوە، کە ئەستیاگ درکی بە ڕاستییەکی تاڵ کردووە، لەو هەڵوێستانەیدا زرنگی ئەو بۆ خوێندنەوەی ئایندە هەست پێ دەکرێ، بەڵام دوای چی؟ دوای ئەوەی کارلەکار ترازابوو، هیرۆدۆت یەژێت: **"ئەستیاجیس دیل کرا، هارپاجوس هاتە لای و بە نیازی ڕیسواکردنی دەنگی لێ هەڵبڕی، زیافەتەکەی ئەو شەوەی بیر هێنایەوە، کە گۆشتی کوڕە هەرزەکارەکەی خۆی دەرخوارد داو لێی پرسی، ئەوی پاشای چەند سات بەرلە ئێستە ، دیلیی و کەساسی ئەم ساتەوەختە ی خۆی چۆن لێک دەداتەوە؟**

**ئەستیاجیس چاوی تێ بڕی و بە پرسیارێک وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە، کە ئایا هارپاجوس لەم کردارەی قۆرشدا هاوبەشە؟ وەڵام بە ئەرێ بوو، بەدڵنیاییەوە ئەوبوو نامەی بۆ قۆرش ناردو هانی دا تا شۆڕشی بەسەردا بکات. لەوێدا ئەستیاجیس گوتی: کەواسا لەناو مرۆڤەکاندا تۆ نارەسەنترین کەسی،**

---

(١١٢) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٩٣.

(١١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**بکرە گەمژەترین پیاویت، خۆ ئەگەر راستبێت ئەم کارە تۆ رێکت خستووە، بۆ تۆ رەواتر بوو ببیت بە پاشا، کەچی دەسەڵاتەکەت بە کەسێکی تر بەخشی، ئەم کارەشت بە ئاشکرا نانەجیبیتی تۆی سەلماند، چونکە بە هۆی ئەو ئێوارە داوەتەوە، کۆتوبەندی کۆیلایەتیت کردە گەردنی میدییەکان، ئەگەر هەر مەبەستت بوو تەختی پاشایەتی رادەستی کەسێکی تر بکەیت، واشیاوتر بوو ئەم دیارییەت پێشکێش بە میدییەک کردبا، نەک بە فارسێک، بەڵام لەم بارەی ئێستەدا ئیتر میدییە سەربەست و ئازادەکان ژێردەستەن و بوون بە کۆیلەی فارسەکان، ئەو فارسانەی تا دوێنی کۆیلە و خزمەتکاری ئارییەکان بوون"**[114].

بە کورتییەکەی فاکتەری زۆر بەسەر یەکدا کەڵەکە بوون، تا لەکۆتاییداو لە ساڵی(٥٥٠ پ.ز) مەملەکەتی میدیا تووشی ئەو کارەساتە بوو. لەو فاکتەرانە: گەمژەیی ئەستیاگ لە چارەسەرکردنی پرسەکانداو ستەمکاری و هەڵەشەیی لە سیاسەتی هەرێمایەتییدا، ناکۆکی و دووبەرەکی لە لووتکەی دەسەڵاتدا کاری خۆی دەکرد، لەپاڵ ئەم فاکتەرانەدا ئارەزووی گەلە جیاجیاکانی تر بۆ رزگاربوون لە بندەستی و دەرکەوتنی سەرکردەیەکی فارسی وریا و ژیر و نەترس، مەملەکەتی مادی بەو چارەنووسە گەیاند.

(کەتیاسس) بڕوای وایە، کە **"هۆی سەرەکیی سەرکەوتنی کوڕش، ناپاکیی گەورەپیاوان (خانەدانەکان)ی ناو سوپای ماد بوو، کە هارپاگ فەرماندەی گشتیی هەر هەموویان بوو"**[115].

دیاکۆنۆف دەڵێت: "کۆرش فەرمانی کوشتنی ئەستاگی نەدا، ئەو بەدوورخستنەوە بۆ هیرکانیا (باشووری دەریای قەزوین ـ باکوری ئەمڕۆی ئێران) کۆڵی دا"[116].

---

(١١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١١٥) دیاکونوف: میدیا، ص٣٩٣.

(١١٦) دیاکونوف، دەڵێت: هیرکانیا ناوچەی ئێستای ئرسترابادی کراسۆدسکییە. دیاکونوف: میدیا، پەراوێزەکانی پێشەکی (١١٥)

لەوێ لەلایەن فەرمانڕەوای هیرکانییەکانەوە، بەڕێزەوە پێشوازی لێ کرا، دوایی بانگ کرا بۆ بینینی کچەکەی. سەرکردەیەکی بەناو (بتسیاک) بردییە بیابان و لەوێ لە برسان و لە تینویەتیدا مرد[١١٧].

پەسەندتر وایە بێژین: بڕیاری لەناوبردنی ئەستیاگ خودی کوڕش داویەتی و بتسیاک تەنیا جێبەجێکاری بووە. ئاساییە کوڕش ترسێک لە مێشکیدا چەکەرەی کردبێت، ترس لە ئەگەری هەوڵدانی ئەستیاگ و لایەنگرانی بۆ بەدەستهێنانەوەی تەختی پاشایەتی، ئەو زانیویەتی باشترین هۆ بۆ ڕێگەگرتن لەم شێوە هەوڵانە، لەناوبردنی ئەستیاگ خۆیەتی.

فارسەکان مەملەکەتی ئەستیاگیان داگیر کرد، بەڵام بەمەشەوە نەوەستان و دڵیان ئاوی نەخواردەوە، لە سەردەمی ئەخمینییەکان و بەدوای ئەویشدا بە مەبەست، هەوڵی شێواندنی ناوبانگی ئەستیاگیان داو ناویان لێنا - بەیوەراسب - و بە ئەژدەهاکیان بە خەڵکی ناساند و چیرۆکێکی سەیریشیان بۆ هەڵبەست[١١٨]، گوایە دوو مار بەسەر هەردووشانییەوە ڕوواوە و ئەم دوو مارە دانەدەمرکانەوە تا هەموو ڕۆژێک مۆخی سەری دوو لاویان دەرخوارد نەدایە، ئەم کردارەشی خەڵکی تووڕەو بێزار کردووە، تا (ئەرياييل)ی ژنە وەزیر، یا (ئەزماییل)ی ژنە ئاشپەز، بیری لە ڕێگەیەک کردەوە بۆ ڕزگارکردنی یەکێک لەو دوو گەنجەو ئیتر ڕۆژی یەکێکیانی دەکوشت و مۆخەکەی لەگەڵ کەللەی مەڕێکدا تێکەڵ دەکردو دەرخواردی دوو مارەکەی سەر شانی پاشای دەداو ئەو گەنجەکەی تری بەرەڵلا دەکرد، بە مەرجێک گەنجە ڕسگاربووەکە دوور بکەوێتەوەو لەبەر چاوی خەڵکی خۆی بزر بکات. ئیتر گەنجە ڕزگارکراوەکان ڕوویان لە چیای سەخت و بەردەلان و قووڵایی بیابانەکان دەکرد و لەو گەنجە ڕزگاربووانە نەتەوەی کورد کەوتەوە!! پاشان

---

(١١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩٦-٢٩٧

(١١٨) تا سالانی حەفتای سەدەی ڕابردوو، چیرۆکی (کاوەی ئاسنگەر و زوحاکی خوێنمژ) لە باشووری کوردستان باو و بلاوبوو. تەنانەت سروودێکی نیشتمانیش دەبیسترا، کە تێدا دەگوترا: (ئەی نەتەوەی کاوەی بلێر) و لە شاری سلێمانییش پەیکەرێک بۆ کاوەی ئاسنگەر بە چەکوشەکەی سەرشان و کە لەسەری زوحاک بەدەستییەوە، دروست کرابوو، بەلام لەو سالانەی دواییدا پەیکەرەکە لابرا!! (وەرگێر)

به سەرکردایەتی کاوەی ئاسنگەر، جەماوەر دژ بە ئەژدەهاک ڕاپەڕین و لەناویان برد[119].

شێواندنی ڕاستییەکان لەم ئاستەدا ڕاناوەستن، بگرە ئەستیاگ کرا بە (ئەزدەهاک ـ ئەژدهاک = ئەژدیها) و لە سەرچاوە عارەبییە ئیسلامییەکانیشدا ناوی بە زوحاک (الضحاک) هاتووە.

دەبێ ڕۆڵی مێژوناسە فارسەکان و وەرگێڕە سریانییەکانمان لەبەرچاو بێ کاتێ لە هەڵبەستنی چیرۆکە خەیاڵییەکانیان لەمەڕ ڕەچەڵەکی کورد پشتیان بە پەردە دەنگییەکان بەستووە و وەک ڕاستییەکی مێژوویی دەرخواردی خوێنەریان داوە.

لە سەدەی (٤ک / ١٠ز)، شاعیری ناوداری فارس **ئەبولقاسمی فیردۆسی** ـ پەیدا بوو، لە (شانامە)کەیدا[120] کارەکەی خراپتر بەلاڕێدا برد. ئەو دەڵێت: زوحاک کوڕی مەلیکێکی عارەب بووە و بۆ ڕزگارکردنیان لە دەست ستەمی جەمشیدی پاشا، فارسەکان هانایان بۆ بردووە و ئەویش بە دەم داواکەیانەوە چووەو زوحاک جەمشیدی کوشتووە و خۆی لەسەر تەخت دانیشتووەو بووەتە پادشا.

لە شوێنێکی دیکەی شانامەکەیدا فیردەوسی یەژێت: **"بەلام زوحاک نازناوی بووە، ئە ـ بەیوەراسب ـ ی کوڕی مرداسی پاشای عارەب بووە و گەلەکەی خۆش ویستووەو لە دەسەلاتداریدا بە پیاو چاک ناسراوە"**. فیردەوسی پاشان دێت و چیرۆکی هاوڕێیەتی شەیتان و زوحاک و دوو مارەکەی سەرشانی و چیرۆکەکە تا کۆتایی دەگێڕێتەوە[121].

لە نووسینەوەی ئەم چیرۆکە خەیاڵییەو ئەم تێکەڵکردنەیدا، جگە لە شێواندنی ناو و ناوبانگی پادشای میدی هیچ مەبەستێکی دیکەی نەبووە.

---

(١١٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: المسعودي: مروج الذهب، ١٢٢/٢-١٢٣. المقدسي: البدء و التاريخ ١٤٣/٣الزبيدي: تاج العروس، مادة (الكرد).

(١٢٠) الفردوسي: الشاهنامە، ص١٠

(١٢١) هەمان سەرچاوی پێشوو، ص١٠-١٢

## (٨)

## سەرکردەی سەربازیی میدیی(مازاریس)

## (نێزیک ساڵی ٥٤٦پ.ز مردووە)

### پێشەوا

دەستەبژێر مێژووی گەلان دروست دەکات. دەستەبژێر ڕێڕەوی گەلان بە باش یا خراپ ئاڕاستە دەکات و هەر ئەویشە نەتەوەکەی بەرەو لووتکەی ڕووسووری و شەرافەتمەندی دەبات، یا بەرەو پاشکۆیی و کۆیلایەتی لێی دەخوڕێ. بەڵێ، سەرکردەیەکی مەزنم بدەرێ، تا نەتەوەیەکی مەزنت پێ ببەخشم. ئەم دەربڕین و بۆچوونە پێچەوانەکەشی ڕاستە.

ئەگەر بخوازین و واقعییانە مێژوو بخوێنینەوە، خوێندنەوەیەک دوور لە خەیاڵپلاوی و هەڵخەڵەتاندن و تێکەڵاوکردن، ئەو کاتە پەی بە ڕاستییەکان دەبەین، بەڵام ئەوەی پێی دەگوترێ جەماوەری پێشەنگ، جگە لە شێواندنی ڕاستییەکان شتێکی تر نییە. ئەوە وێناکردنی مێژوویەکە، کە لە بری هەردوو قاچی لەسەر سەر ڕاوەستاوە. (وابزانم کارل مارکس جارێ شتێکی وای نووسیبوو).

ئەوەی دەیڵێم ئەشێ ببێتە مایەی ناوزەدکردنم بە کۆنەپەرست، یان بە بەخوداکردنی پێشەواو پەراوێزخستنی تواناکانی جەماوەر لێک بدرێتەوە. ئەوەش دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە من ئەو هەقیقەتە دەزانم، کە لە هەموو بارێکدا (ڕابەر ـ سەرکردە) کوڕی جەماوەرە و لە جەماوەر پەیدابووە و لەویشەوە فێر دەبێت و جەماوەریش پێیدەگەیەنێت ئەوسا دەبێتە پێشەواو سەرکردە، بەڵام ئەو شتەی ڕابەر لە تاکەکانی دی جیا دەکاتەوە تایبەتمەندییە باڵاکانی سەرکردەیە، ئەو تایبەتمەندییانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:

**یەکەم:** دەتوانێ بە قووڵی ئیلهام لە ڕۆحی نەتەوە وەربگرێت و ڕاستگۆیانە نوێنەرایەتی بکات.

**دووەم:** خاوەن دیدگەیەکی وابێت هەموو کات بتوانێ بژاردە ڕاست و دروستەکان دەستنیشان بکات.

**سێیەم:** خاوەن ویستێکی بەهێز و خودان بڕیاری یەکلاکەرەوە و لە کاتی پێویستدا خاوەن هەڵویست و بە جەرگ و بوێر بێت، ئەمانە و خاوەن کەسایەتییەکی کاریگەر و لەخۆبوردوو بێت، بەرئەنجام ئەم تایبەتمەندییانە دەیکاتە پێشەنگی نەتەوە.

**چوار:** زگی بجەرێنێ و سادە بژێت، نازناو لە خۆی نەنێت و خۆی هەڵنەکێشێت. لاف و گەزاف لێ نەدات و لە ژیاندا بۆ خۆشگوزەرانی هەڵپە نەکات، شەیدای ڕابواردن نەبێ و لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا چوست و چالاک و لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەمپەر و گرفتەکاندا خاوەن بڕیار و سەرسەخت بێت.

**پێنج:** باوەڕی بە تواناو هێزی جەماوەر پتەوبێت و بە چاوی سووک و کۆیلایەتی لێیان نەڕوانێت و سەرکوتیان نەکات، لە هەمان کاتدا هەستی بەهێزبوون و شانازیی بەخۆوەکردن لە ناخ و ڕۆحیاندا بچێنێت، شکۆی جەماوەر بە بەشێک لە شکۆی خۆی بزانێت و لە پۆشاک و خواردن و خواردنەوەو شێوەی ژیانکردندا خۆی لە جەماوەر جیا نەکاتەوە.

**شەش:** جەماوەرەکەی پشتگوێ نەخات، حەزی خۆدزینەوەو خۆبەکەم زانین لە ڕۆحیاندا بکوژێت و باوەڕبەخۆبوونیان لا بەهێز بکات و جەماوەر لە چنگ مۆتەکەی نائومێدی دەربهێنێ و هیوای ژیانێکی شایستە لە ناخیدا

بچێنێ، ئامانجی باڵایان بۆ دیاری بکات و ڕێگەی ڕزگاری لەبەرپێیاندا خۆش بکات و پێیان نیشان بدات.

**حەوت:** لە ڕووی ڕۆحی و فیکری و ڕەوشتەوە جەماوەر هانی پێشکەوتن دەدات و لە کێبرکێی بێکەڵک لەپێناو دەسکەوتی تاکەکەسیدا ڕۆحییەتی جەماوەر ڕزگار دەکات و هێڵانەی کوندەپەپووی کۆیلایەتی لە زهنییەتی جەماوەردا دەڕوخێنێت و هێزو توانای یەک دەخات، بۆ گەیشتن بە ئامانجی وێنە بۆکێشراو، توانای جەماوەر بە شێوەیەکی دیراسەکراو دەخاتەکار.

ئەوانە دیارترین تایبەتمەندییەکانی سەرکردە (ڕابەر)ن.

هەر بەم تایبەتمەندییانەوە پێشەوا مەزنەکان مێژووی نەتەوەکانیان دروست کردووە.

## ئاهورامەزدا و ئەهریمەن

دەشێ دەستەبژێریی لە کەسێکدا وێنا بکرێ، نموونەی سەرگۆنی ئەکەدی، ئەورنامۆی سۆمەری، حەموڕابی بابلی، ڕەعمەسیس - ی دووەمی میسریی، بانیپاڵی ئاشووری، کەیخوسرۆی میدی، کۆرشی ئەخمینی، ئەسکەندەری مەکدۆنی، هانیپاڵی گریکیی و زۆری دی. لەلایەکی دیکەوە دەکرێت لەدەستەیەکدا لە گرووپێکدا، کەسایەتییەکی لەم نموونانە خۆی بنوێنێ. ئەم دەستەیە یەک دیدگە کۆیان دەکاتەوە و باوەڕگەلێکی هاوبەش ئاراستەیان دەکات و لە پێناو یەک ئامانجدا تێ دەکۆشن و لەنێو خۆیاندا کەسێکیان وەک سەرکردە تیادا هەڵ دەکەوێت و دیدگەی ئەوانی دی بەرجەستە دەکات. ئەم کەسایەتییە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێت لەپێناو بەدەستهێنانی خواست و هیواکاندا، تواناکانی خۆی بخاتە کار، ئیتر کەسی دەستەبژێر، دەستە بێت یاخود تاکەکەس، ئەو جەماوەری نەتەوە ڕادەکێشێت و لە دەور خۆی گلێریان دەکاتەوە و ڕێڕەوی پاشەڕۆژیان بۆ دیاری دەکات و بەرەو ئایندە پێشڕەوییان دەکات.

به دەربڕینێکی دی، ئەو دەستەبژێرە، بە چاک یا خراپ، ڕوون یا تاریک، چارەنووسی نەتەوە دروست دەکات. لێرەدا من لە ڕوانگەی مێژووی ڕاستینە (کەتوار)یەوە، نەک لە ڕوانگەی ئاینییەوە باس لە چارەنووس دەکەم.

بەدرێژایی مێژووی باوباپیرانی کورد، لە ڕووی دەستەبژێری دڵسۆزو پاک و بێگەرد، بلیمەت و بەجەرگ، نەک هەر دەستکورت نەبووە، بگرە گەر ئەو دەستەبژێرە نەبووایە، نەتەوەی کورد بە سەلامەتی لەو گشت بەڵا گەورەو یەک لەدوایەکانە، کە بەسەریدا هاتوون، بەڵای داگیرکاریی و تواندنەوەو قڕکردنی بە کۆمەڵ (ئەنفال)، دەربازی نەدەبوو.

بە داخەوە، کە دەڵێم: لەهەمان کاتداو بەدرێژایی مێژوو لەو دەردو بەڵا گەورانەی کە لەسەر دەستی نوخبەی خۆپەرست و گێل و ترسنۆک بەسەریاندا هێنا ڕزگاری نەبوو.

لە مێژووی کورددا، ئەم دوو دیاردە دوو هێڵی هاوتەریب و تاهەتایین، بەڵام پێچەوانە و دژ بەیەکن:

**یەکەمیان:** بەرەو لووتکەی جوامێری و شکۆمەندی هەڵ دەکشێ و باڵا دەکات.

**دووهەمیان:** بەرەو قووڵایی ئابڕووچوون و ڕیسوایی سەر بەرەو خوار گلۆر دەبێتەوە.

تۆ بڵێی زەردەشتی پەیامبەر، پەیامبەری نەتەوەی میدیی لەم ڕووەوە هەستی بە شتێک نەکرد بێت، کاتێ کە بیروباوەڕەکەی لەسەر زۆرانبازییە ناکۆتاکەی نێوان دووانەی ئاهورامەزدا (خواوەندی ڕووناکی) و ئەهریمەن (خواوەندی تاریکی) ڕۆنا؟ کێ دەزانێ؟! دەشێ وابێ!

هێشتا قسەمان لەسەر دەستەبژێرە داغ لەدڵ و خۆپەرست و ناپاککارە میدییەکانە. ئەو کەسانەی کە چارەنووسی نەوەکانیان ڕادەستی کەسانی بێ بەزەیی کرد.

زانیمان ئەو کەسەی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی مادەکاندا کڕنووشی بۆ ئەهریمەن (خودای تاریکی) بردو دژ بە ئەستیاگی دوا پاشای میدییەکان دەستی لەگەڵ کۆرشی سەرکردەی فارسدا تێکەڵ کرد، ( **هارپاگ**)ی میدی

بوو. ناپاکییەکەی ڕووخاندنی مەملەکەتی ماد و دیلکردن و تیاچوونی پادشا ئەستیاگی بەدوای خۆیدا هێنا.

لەڕاستیدا لە ئەنجامدانی ئەو ناپاکییەدا هارپاگ تەنیا نەبوو، بگرە کەسانێکی تر لە سەرکردە باڵاکانی میدیی لەم ناپاکی و پیلانگێڕییەدا بەشداربوون، ئەوەتا لەم نامە نهێنییەدا، کە بۆ کورش ناردوویەتی، هارپاگ هێما بۆ ئەو ڕاستییە تفت و تاڵە دەکات و بە کورش دەڵێت: **"فارسەکان ئامادە بکە بۆ شۆڕش و بکەوەڕێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی میدییەکان، زیانت پێ ناگات ئەگەر من، یان هەر کام لە سەرکردەکان، سەرکردایەتیی ئەو سوپایە بکات، کە پاشا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەت دەینێرێت، هەرچۆنێ بێ سەرکەوتن بۆ تۆیە، چونکە نەجیبزادە میدییەکان یەکەم کەسن پشت لەو دەکەن و پێوەندیی بە تۆوە دەکەن"**[(١٢٢)].

ڕێی تێ دەچێت، **(مازاریس)یش** یەکێک بووبێت لەو سەرکردانەی کە ناپاکییان لە ئەستیاگ کردووە، یاخۆ پشتیان تێ کردووە، کەواسا با بزانین ئەم پیاوە کێیە؟ هەوڵ و کۆششەکانی لە خزمەتکردنی مەملەکەتی ئەخمینی خۆشەویست و پاشای گەورەیدا چ بووە؟

## چەنگ و پێنووسەکان

لە ڕاستیدا لە قۆناخی ئەو پیلانگێڕییەدا، کە هارپاگ دژ بە ئەستیاگ بەرپای کرد، ناوونابانگی مازاریس ناکەوێتە بەرگوێمان. دیارە مێژووی میدییەکان شاردراوەتەوەو ون کراوە. گومانیشی تیا نییە، کە ئەخمینی و ئەشکانی و ساسانییەکان لەپشت ئەم بزرکردنەوەن، چونکە لە بزربوونی مێژووی میدییەکاندا، ئەوان زۆرترین قازانجیان بەرکەوتووە. ڕاستروایە بڵێین: مازاریس، لە تەمەندا لە هارپاگ گەورەتر بووە، دوور نییە لە سوپای ئەخمینییەکاندا پلە و پایەی لە هارپاگ بەرزتر بووبێت، بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە مردنییەتی، کە بە چەند ساڵێکی زۆر دەکەوێتە پیش مەرگی

---

(١٢٢) هیرودوت: تاریخ هیردوت، ص٩٠-٩١.

هارپاگەوەو پاش مەرگی ئەو، هارپاگ لە ئاسیای بچووک سەرکردایەتیی سوپای فارس دەکات.

بەڵێ، پێش هێرشەکەی کۆرش بۆ سەر مەملەکەتی لیدیا لە سەرووی رۆژئاوای ئاسیای بچووک و بەرلەوەی لە ساڵی (٥٤٧ پ.ز) (ساردیس) پایتەختی لیدیا داگیر بکات و کورۆیسوس (قارون)ی پادشای لیدیی بە دیل بگرێ، ناوی مازاریس لە ناواندا بوونی نەبووە. لەم بارەوە سەرچاوەی سەرەکیمان، بگرە تەنیا سەرچاوە، مێژووی هیرۆدۆتە، ئەو بە دوورودرێژی باس لە رۆڵ و سەرکردایەتی هارپاگ لە رووخاندنی دەسەڵاتی میدی دەکات، بەڵام مازاریس لەوێ بەدیار ناکەوێت، تا رووداوەکانی پاش رووخان و دامەزراندنی مەملەکەتی ئەخمینی. بەتایبەت پاش شۆڕشی مەزنی لیدییەکان دژ بە رژێمە داگیرکارەکەی فارس لە وڵاتی لیدیا.

(باکتیاس) ناوی ئەو سەرکردە بوو، کە لە وڵاتی لیدیا دژ بە داگیرکەری فارس شۆڕشی بەرپاکرد. هەر کە کۆرش بە سوپاکەیەوە لیدیای داگیر کرد، بە کرویسوسی نیمچە دیلەوە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. پاکتیاس کەوتە خۆی و دەستی کرد بە هاندانی لیدییەکان، ئەو هەرچی پارەو پوول و ئاڵتوونی شک دەبرد، هەمووی خستە خزمەتی شۆڕشەوە، خەرجی جەنگاوەرەکانی دابین دەکردو سەرەتا لێواری ئاسیای بچووک، کە دەیڕوانییە سەر دەریای ئیجە داگیری کردو خەڵکەکەی ڕازی کرد تا پشتگیری لێ بکەن، پاشان رووی لە (ساردیس)ی پایتەخت کردو لە بن دەستی فارسەکانی دەرهێناو ئابڵوقەی توندی خستە سەر فەرمانڕەوایی فارس - تیالوس - کە بەهێزیکەوە خۆی قایم کردبوو، کە کۆرش بەرەو میدیا و فارس دەگەڕایەوە هەواڵی شۆڕشی پێگەشت، بەم هەواڵە تووڕە بوو رووە و مەلیکی لیدیی نیمچە دیل - کرویسوس- وەرچەرخا و پێیوت: **"وا دیارە ئەم لیدییانە سەرئێشەم بۆ دروست دەکەن و بەڵا بەسەر خۆشیاندا دەهێنن، بڕوام وایە باشترین رەفتار، کە من بینوێنم ئەوەیە، بیانگرم و لە بازاڕی کۆیلەکاندا بیانفرۆشم"**[١٢٣].

---

(١٢٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

له هەر شوێن و جێگەیەکی ترسناک و تاریکدا بێت بەگشت نالەبارییەکییەوە سەرکردەی ڕەسەن هەمیشە دڵسۆز و خەمخۆری گەلەکەی دەبێت. کرویسوس نموونەی ئەو سەرکردانە بوو، چ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کەمبیز یا کۆڕشی کوڕی، ناوبانگی دەرکردبوو، کە ئەو پادشایەکی داناو ژیر و وردبینە و کەتواربینانە ئێستە و ئایندەی بە ئاگاییەوە خوێندۆتەوە. ئەو دەیزانی گەلانی ئاسیای بچووک هێندە پەرتوبڵاون و لە ئینتماو بەرژەوەندیدا هێندە لێک دوورو جیاوازن، ناتوانن ڕووبەڕووی ئیمپراتۆرییەتێکی وا بەهێز و زەبەلاح ببنەوە، بۆیە لە کاولکردنی ساردیسی پایتەخت و سمبولی لیدیا ترس دای گرت، ترسا لیدییەکان بکرێن بە کۆیلە و لە بازاڕی جامبازاندا بفرۆشرێن و لە جیهاندا پەرتوبڵاو ببنەوە و پاش چەند نەوەیەک بە یەکجاری گەلی لیدیی تووبڕ ببێت. ئەمەش ترسناک و بە سامترین کارەساتی مێژووە، کە نەتەوەکان تووشی بوون.

لەلایەکی دیکەوە کرۆیسوس بەوردی لە زەینی ئیمپراتۆرییانەی کۆرش حاڵی ببوو. دەیزانی ئەو زهنییەتە چی پێ خۆشەو بە چی قەڵس و تووڕە دەبێت، چی بەلاوە پەسەندەو چ ناپەسەندە، بۆیە داوای لێ کرد، هەموو گەلی لیدیا سزا نەدات، بگرە دانایی ئەو وا دەخوازێت تەنیا باکتیاس سزا بدات، چونکە ئەو پلانی بۆ شۆڕش دارشتووەو دژ بە ڕژێمی فارس سەرکردایەتی شۆڕشەکەی کردووە، بۆیە چارەسەرێکی دی پێشنیار کردو زانی ئەم پێشنیارەی بەلاوە پەسەندە: **"ڕای من وایە چەک هەڵگرتنیان لێ قەدەخە بکەیت و لەمەودوا پیاوەکانیان عابا و سەرپۆش بپۆشن و نەعلی پاژنە بەرز لەپێ بکەن و فەرمانیان پێ بکە فێری ژەندنی چەنگ ببن، ئەگەر ئەم بەرنامەیەتان پێڕەو کرد، ئەی سەروەرم- ئەوا زۆر زوو پیاوەکانیان دەبن بە ژن، کە وایان لێ بەسەرهات، ئیتر جێی مەترسی نابن"**[١٢٤]

کۆڕش پیاوێکی بلیمەت و زرنگ بوو، بە قسەی ویل دیۆرانت **(لەو فەرمانڕەوایانە بوو، کە تەنیا بۆ فەرمانڕەوایی خولقابوو)**.[١٢٥]

---

(١٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣-١٠٤.

(١٢٥) ول ديورانت: قصة الحضارە، ص٤٠٣/٢.

ئەو ڕاوبۆچوونەکەی کرۆیسوسی بە شیاوتر و بێ زیانتر بینی.

بە کۆیلەکردنی گشت تاکەکانی یەک گەل، پەرچەکرداری بەدوادا دێت و بۆ بەرگریکردن لەخۆ پەنا بۆ شۆڕش دەبەن و بڕیاری توندو بێبەزەییانەی لەو جۆرە هانی دانیشتوانی شارەکانی ئەغریقی و دراوسێکانی لیدیی و ئەرخەبیلی ئیجەو وڵاتی یۆنان دەدات، ڕیزەکانیان یەک بخەن و لە ڕووی دەسەڵاتە ناوچەییە داگیرەکەی فارسدا ڕابوەستن.

لەڕستیدا کۆرشی خاوەن زەینی ئیمپراتۆری پیاوێکی ژیر بوو، وەکو ئەو کەسایەتییە مێژووییانەی کە خاوەنی هەمان زهنییەت بوون، درکی بەوە کردبوو، کە نەتەوەیەک، ڕۆڵەکانی لەبری شمشێرو قەڵەم شەیدای هەڵگرتن و ژەندنی چەنگ (قیثارە) بن و گشت ڕۆژەکانی تەمەنیان بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و کات بە فیڕۆدان بەسەربەرن، ئەو نەتەوە ڕێگەی ئازادی و سەرفرازی ون کردووەو حوکمی پاشکۆیی و لاوازیی و کۆیلایەتی بەسەر خۆیدا سەپاندووە، هەر ئەم بارە نالەبارەی گەلی لیدیا، خواست و ئارەزووی کۆرش بوو، بۆیە بڕیاری جێبەجێکردنی دا.

کۆرش بە ڕێنوێنییەکەی کورویسوس دڵخۆشی دەربڕی، ئەو دڵنیابوو، کە ئەم ئامۆژگارییە هی پیاوێکی سیاسی دانایە، بۆیە بڕیاری دا کاری پێ بکرێ، بەڵام ئەبێت کەسێکی شیاو و کەسێکی دڵسۆز لە داروودەستەکەی خۆی ئەم نەخشەیە بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، بۆ ئەو مەبەستە، لەنێو هەموو سەرکردەکاندا مازاریسی میدی هەڵبژارد تا ئەم کارە گرینگ و هەستیارە بگرێتە ئەستۆ، هیرۆدۆت دەڵێت: **"ناردی بەدوای مازارسیداو داوای لێ کرد ئەو فەرمانەی کە لەسەر ڕێنمایی کوریسوس داڕێژراوە و خاڵەکانی تێدا دەستنیشان کردووە، بۆ لیدییەکانی بخوێنێتەوەو پاشان ئەو کەسانە بفرۆشێت، کە دەستیان لە هێرشکردنە سەر ساردیس هەبووە، هاوزەمان لە هەموو بارێکدا ژیانی پاکتیاس بپارێزێت و ڕاپێچی لای ئەوی بکات"**[١٢٦].

دوای ئەوەی کورش بەرەو وڵاتی فارس درێژەی بە گەڕانەوەی خۆدا، لە گێڕانەوەو بیستنی ئەم دەنگ و باسەدا دوو شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

---

(١٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.

• لە کاتی ئەم ڕووداوەدا ئەشێ مازاریس لە وڵاتی ماد و فارسدا بە ڕاپەڕاندنی ئەرک و فەرمانێکی پاشایەتیی خەریک بووبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە، کۆرش بەدوویدا ناردبێت.

• یا لە کاتی پاشەکشەی سوپادا لە لیدیاوە بۆ وڵاتی فارس، مازاریس لەتەک کۆرشدا بووبێت، ئەمەش ڕێی تێ دەچێت.

بەهەرحاڵ، مازاریس لەتەک کۆرشدا بووبێت یا نا، دەستنیشاکردنی ئەو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە قورس و هەستیارە نیشانەی باوەڕی کۆرشە بە دڵسۆزیی و لێهاتوویی ئەم سەرکردە میدییە.

ئەودەم لیدییەکان گەلێکی جەنگاوەر بوون و وڵاتەکەیان دەکەوتە پەڕی ڕۆژئاوای ئاسیاوە، واتە ئەوسەری ڕۆژئاوای ئیمپراتۆرییەتی ئەودەمی فارس و ئەو بەندەرە بازرگانییانەی کە ئیمپراتۆرییەتیان بە بەڵقان و وڵاتی یۆنان و دەراوسێکانی، لەڕێگەی دەریای ئیجە بەیەکەوە دەبەستەوە. ئەو وڵاتانەی بەبێ داگیرکردنی لیدیا ئەستەم بوو فارسەکان دەستیان پێ بگات، سەرەڕای ئەمانەش، لیدیا نێزیک بوو لە دوشمنە سەرەکییە ئەورووپییەکەی ئەوسای فارس، کە ئەویش وڵاتی یۆنان بوو.

بابزانین، مازاریس فەرمانی پاشایەتی، چۆن جێبەجێی کرد؟

بەوپەڕی تواناوە مازاریس ڕووبەڕووی ئەرکەکەی بووەوە، بۆ لابردنی ئابلۆقە سەپێنراوەکەی سەر فەرمانڕەوای فارس و سەربازەکانی لە قەڵاو ڕزگارکردنی ساردیسی پایتەخت لە چنگی لیدەکان. مازاریس سوپاکەی ئاڕاستەی ئەوێندەر کرد. هیرۆدۆت وای باس کردووە: "**بکتیاس، کە زانی سوپایەک ڕاوەدووی دەنێت و لە سەنگەرەکانی نێزیک بووەتەوە، ترس دای گرت و بەرەو سایمە (cyme)[127] هەڵهات. لەو کاتەدا مازاریس بە بەتالیۆنێک لە سەربازەکانی قۆرش ملی بەرەو ساردیس نابوو**"[128].

ئەمە یەکەم قۆناخی پلانەکەی مازاریس بوو.

ئەی دووەم قۆناخ چۆن بوو؟

پاش کۆنترۆڵکردنی ساردیس، دەبووایە مازاریس ئەو نەخشە ئیمپراتورییەتە جێبەجێ بکات، کە دڵی کورشی خۆش دەکرد، ئەویش کوشتنی ویستی ئازادیی بوو لە ڕۆحی لیدییەکانداو لەبیربردنەوەی سوارچاکی و ڕێگەی ڕابواردن و گۆرانیوتن و ژەندنی ئامێری مۆسیقایان نیشان بدات، هیرۆدۆت وتی: "**کە دیتی باکتیاس و هاوەڵەکانی ناوچەکەیان چۆڵ کرد، یەکەم هەنگاو سەپاندنی فەرمانەکەی کورش بوو بەسەریاندا، ئەو هەنگاوەش سەرتاسەری وەرچەرخانێک بوو لە ژیانی لیدییەکاندا**"[129].

سێیەم هەنگاوی مازاریس، لەناوبردنی سەرکردەی شۆڕش بوو. دەزانین، کە باکتیاس سەرکردەو ئەقڵی کارای شۆڕشەکە بوو و بەپێی فەرمانی کورش دەبێت دەستگیر بکرێت و ڕەوانەی لای وی بکرێت. لەو کاتەدا باکتیاس پەنای بردبووە

---

(١٢٧) شارێکی سەر کەنارەکانی دەریای ئیجەیە.

(١٢٨) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص١٠٥.

(١٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دوورگەی (سایمە)، هیرۆدۆت دەڵێت: "**پاشان نامەیەکی بۆ سایمە نارد و داوای لە خەڵکەکەی کرد تا باکتیاسی ڕادەست بکەن**"[١٣٠].

بێگومان مازاریس وەک لە نەریتی دیبلۆماسی سەردەمدا پێی دەگوترێ، نامەکەی مازاریس نامەیەکی توندوتیژی بووە. دوور نییە لە نامەکەیدا هەڕەشەی داگیرکردنی شارەکەی لە سایمیەکان کردبێت، ئەگەر بەزووترین کات باکتیاس دەستگیر نەکەن و ڕادەستی نەکەنەوە.

ئەو دەم دەبووایە سەرکردەکانی سایمە بڕیارێکی زۆر گونجاویان بدابایە و چارەسەرێکیان بۆ گرفتەکە بدۆزیبایەتەوە. ئەوان دوو بژاردەیان لەبەردەستدا بوو، شیرینترینیان تاڵ بوو، یان پشتگیری شۆڕش و ڕەتکردنەوەی داواکەی مازاریس یاخۆ چاوەڕوانی زەبروەشاندن و تۆڵەی دەستی فارسەکان بن، یان نەریتی باوی گەل پشتگوێ بخەن و باکتیاس ڕادەستی مازاریس بکەن.

## با خوداوەند ناوبژیوان بێت

لیدییەکان دابەش بوون بەسەر دوو گرووپی هاوسەنگدا. گرووپێک ڕادەستکردنی باکتیاسیان بە ڕێگەچارە دەزانی، ئەو گرووپ ڕادەست نەکردن و بەرئەنجامەکەشی بەهەر بارێکدا بکەوێت دەبێت قبووڵ بکرێت، بەڵگەی هاوسەنگی هەردوو گرووپ، پەنابردنیان بوو بۆ کاهینەکانی خواوەند (پیاوە ئاینییەکان) تا ناکۆکییەکانیان بۆ بەلایەکدا بخات. ئەم جۆرە پەنابردنەش کۆنە باوبوو، تا بەئەمڕۆشمان دەگات لەنێو برێ لە نەتەوەکاندا برەوی هەر ماوە. هیرۆدۆت دەڵێت: "**خەڵکی بڕیاریان دا ڕاوێژ بە کاهینەکانی پەرستگەی برانشیدای بکەن. تا بزانن خواوەند چ ڕێگەچارەیەکیان پێ نیشان دەدات، ڕووبەڕوو ببنەوە یان خۆبەدەستەوە بدەن. پەرستگای برانشیدای دەکەوتە**

---

(١٣٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**دەڤەری ملتیە[131]ی نێزیک بە لەنگەرگەی بانورموس. ئەوێ پەرستگەیەکی دێرین بوو، فرەجار ئایۆنییەکان و ئەیولیۆنییەکان هانایان بۆ دەبرد"[132].**

کابرای جادووگەر و هەسێرەناس لە بەرژەوەندی گرووپی ڕادەست خواستی پاکتیاس پرسەکەی بەلاداخست، بەڵام گرووپی دووەمی سایمە، ڕادەستکردنەوەی پاکتیاسیان بە کارێکی شەرمهێنەر لەقەڵەم داو ناکۆکییەکە قوڵتربوویەوە. لە ئەنجامی مشتومڕێکی زۆر، هەردوو گرووپ چارەسەرێکی مامناوەندییان دۆزییەوە، ئەویش دوورخستنەوەی باکتیاس بوو بۆ مەیتلانە mytilene ی لێواری دەریای ئیجە لە باکوری شاری سایمە[133].

مازاریس لێ نەدەگەڕا پاکتیاس هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵ بکێشێت. بەردەوام بەدوایدا بوو و ڕاوی دەنا. لەپاڵ هەڕەشە و گوڕەشەدا مازاریس بەڵێنی چەوری پێ دەدان و پارەیەکی زۆری خشتی خستە بەردەستی ئەو کەسەی کە پاکتیاسی بۆ دەگرێت و ڕادەستی دەکات. وا دەردەکەوێت سەرکردە میتلانییەکان بەو دەستکەوتە چەورەی مازاریس ڕازی بووبێتن، چونکە بەلای ئەوانەوە بەدەستهێنانی پارەیەکی زۆرو مشە، فرە خاسترە لە کاولکردنی شارەکەیان، لەهەمان کاتدا پەیان بەو ڕاستییە بردبوو، کە لە توانایاندا نییە ڕووبەڕووی سوپای فارس ببنەوە. پاکتیاس درکی بە مەترسی کردو بەرەو شاری خیوس هەڵات و پەنای ئەبەر پەرستگەی ئەسینا برد، هیرۆدۆت پەژێ: **"لە شاری خیوس و لەناو پەرستگەی خواوەندی پارێزراوی ئەسینا، باکتیاسیان پەلکێش کرد و ڕادەستی فارسەکانیان کرد، نرخی ئەو ڕادەستکردنەش، هەرێمی ئەتارنیۆس بوو پێیان بەخشرا، ئەو هەرێمەی کە پارچە زەوییەکی وشک و برینگی (لیس پۆس) بوو، ئا بەو شێوەیە پاکتیاس دەستگیرکراو ڕەوانەی لای کوڕشیان کرد".**

---

(١٣١) عارەبەکان وایان وەرگێڕاوە، ڕەنگە شاری میلتوس - Miletus ی سەر بە کەنارەکانی دەریای ئیجە بێ، نەک شاری (مەلاتیە)ی بەناوبانگی ئەنادۆڵ.

(١٣٢) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص١٠٥.

(١٣٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پاش دەستگیرکردنی پاکتیاس، مازاریس بڕیاری دا تۆڵە لە گریک و لیدییەکان بکاتەوە. لەوانەش، کە هاوبەشی بوون لە شۆڕشدا، بۆیە ئابلۆقەی تابلۆس و قەڵای ساردیسی دا، ئەو بە شێوەیەکی فرە دڕندانە مامەڵەی کردن. ئەو مامەڵە وەحشیگەرانەی کە هەمیشە یەکێک بوو لە سیماکانی سیاسەتی فارسە داگیرکەرەکان.

هیرۆدۆت دەڵێت: **"دانیشتوانی بییرنەی لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا هەراج کرد، پاشان پەلامارێکی بەربڵاوی ناوچەی ماجنیسیا (مەغنیسیا) دەشتایی مەیاندیری داو هەموو شتێکی دزی و تاڵانی کرد، لەو دەمەدا مازاریس نەخۆش دەکەوێت و نێزیک ساڵی (٥٤٦ پ.ز) دەمرێت و پاش ئەو هارپاگ جێی دەگرێتەوە"**.

## (٩)

# سمیردیس (گۆماتا)ی میدی

## (ساڵی ٥٢٢ پ.ز کوژرا)

### خوێندنەوەی مێژوو

لە خوێندنەوەی مێژووی کۆندا، دەبێت چوار شت لەبەر چاو بگیرێت:

١- دەبێ بزانرێت چ نیازێک لە پشت یاداشتکردن و ئاراستەکردنی زانیارییەکەوە ئامادەیە. لە گشت بارێکدا نیازێک لەپشت نووسینەوەی مێژووەوە بوونی هەیە. لە هەموو سەردەمەکاندا مێژوونووس ئینتمای بۆ ڕۆشنبیرییەک، دیدگەیەک هەبووەو بە تۆڕێک لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی، یان ئاینی یاخۆ نەتەوەیی یاخود خێڵەکییەوە وابەستە بووە. بێگومان سرووشتی ئەو ئینتمایە لەسەر شێوەی باسکردنی زانیارییەکان و شاردنەوەیان و چۆنییەتی شیکردنەوەی ڕووداوەکان کاریگەری خۆی هەیە، لەڕاستیدا لە مێژووی کۆن و نوێدا گەواهی فرە زۆر هەن دەیسەلمێنن، کە لەنێوان نیازی شاراوەو گێڕانەوەی مێژوودا پێوەندیی پتەو هەیە.

٢- بژارکردنی ڕووداوە مێژووییەکان لە خورافەو ڕووداوی هەڵبەستراو و قسەی پڕوپوچ و ڕزگارکردنی لە تەمتوومانی میتافیزیکی، پاشان لە ڕووی ژینگەی ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە بخرێتە سەر

ڕێگەی ڕاستەقینەی خۆی، گەروا نەکرێت و نەخرێتە سەر ڕاستە ڕێگە، ئەوا لە دەرەوەی مێژوو ڕێگە وێڵ دەکەین و سەرگەردان دەبین و بەهەڵەدا دەچین. لەهەمان کاتدا دەکەوینە ژێر کاریگەریی وەهم و وا دەزانین، کە لەناو مێژوودا دەبزوێین، لەم بارەیەوە زانست سەلماندویەتی، کە هەر کارێک بەهەڵە دەست پێ بکرێت ئەنجامەکەی هەڵەی لێ دەکەوێتەوە.

٣- سەرەڕای نیازە شاراوەکان و گێڕانەوەی چەواشەکارانە و ئەفسانەیی، ئاشکرایە مێژوونووسە کۆنەکان بۆ بەدواداچوون و ساخکردنەوەی باسەکانیان ئامێری پێشکەوتووی هاوشێوەی ئامێرەکانی ئەم چەرخەیان لەبەردەستدا نەبووە، بۆیە باس و ڕووداوەکانیان وەکو خۆی نووسیوەتەوە، بەرئەنجام ڕووداوەکان پچڕ پچڕ بەدەردەکەون و بەئاسانی بەیەکەوە گرێ نادرێن، هەربۆیە خوێنەر بەرەو تاریکی و ناحاڵیبوون پەلکێش دەکات و نایگەیەنێتە کۆتاییەکی دڵنیاکەرەوەو پوخت و ڕاست و لۆژیکی.

٤- دیارە هەموو ئەو مێژووە کۆنانەی نووسراونەتەوە، بەردەستی ئێمە نەکەوتوون. مێژوونووسانی کۆن زانیاری و قەوماوەکانیان لەسەر (قاقەزی زەل و تەرکەو قامیش و گڵی سوورەوە کراوە و پێستی ئاژەڵ و پەیکەری بەردین... هتد) تۆمار کردووە. ئەم کەرەستە سەرەتاییانەش بەرگەی مانەوەیان بۆ ماوەیەکی زۆر نەگرتووە. سەرباری هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد لە ئاکامی شەڕ و شۆڕ و داگیرکارییەکان، شارەکان کەوتوونەتە بەر سووتان و کاولکاریی و لەئەنجامدا تۆمارگەی لایەنی دۆڕاو فەوتاوەو تیاچووە، نموونەی زەقی ئەم فەوتانەش لە سەردەمی ئەسکەندەری مەکەدۆنیدا ڕووی دا.

ئەودەمەی کە ئەسکەندەری مەکەدۆنی ساڵی (٣٣١ پ.ز) دارای سێیەمی پاشای ئەخمینی تێکشکاندو گشت پەرستگە (ئاتەشگە)کانی زەردەشتیانی خاپوور کردو موغە (هەربید)ەکانی هەموو کوشت و ئاڤێستا، کتێبی پیرۆزی زەردەشت پێغەمبەر، کە لەسەر دوانزە هەزار پێستی مانگا تۆمار کرابوو[١٣٤]،

(١٣٤) (هەربید)ەکان، موغەی ئاتەشگاکان بوون. شێوە ئارییەکەی (ئاربید)ـە، واتە داگیرسێنەری ئاگر یان ئاگرخۆشکەر.

هەر هەمووی سووتاند. شایانی باسە ئەسکەندەری مەکەدۆنی، قوتابی ئەرستۆی گەورە فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی بووە. بەڵێ، چاوەڕوان دەکرا، کە بەوپەڕی ڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەلتووری گەلانی ژێردەستەدا بکردایە.

چا ئەگەر قوتابییەکی ئەرستۆیی وەک ئەسکەندەر ئەم کارەی لێوەشابێتەوە، ئیتر چاوەڕوانی چ خێرێک لە پاشا جاهیل و نیمچە خوێنەوارەکان دەکرێت؟!

## ئەم هەموو شتە، چ دەگەیەنێ؟!

کە باس لە سەمیردیسی میدی و زۆرانبازییە تاڵ و تفتەکەی نێوان فارسە ئەخمینییەکان و میدییەکان دەکەین، دەبێت ئەم چوار شتە لەبەرچاو بگرین.

بۆ هەڵێنجانی زانیاری، سەرەکیترین سەرچاوە لەم بارەیەوە، نووسینەکانی مێژوونووسی یۆنانی هیرۆدۆتە، ئەو دەڵێت: هەر هەموو زانیارییەکانم لە زاری (فارسە باوەڕپێکراوەکانەوە) بیستووە. ئەوەی جێی سەرسوڕمان و پرسیارە ئەمەیە: لەو سەردەمەدا چ شتێک ڕێی لە هیرۆدۆت گرتووە تا پەنا بۆ کەسایەتییە میدییەکان نەبات و لە زاری ئەوانەوە گوێبیستی ڕووداو و قەوماوەکان نەبێت و تۆماریان نەکات؟! ڕاستە مەملکەتی میدیا لەسەر دەستی کۆرش ڕووخاو کۆتایی پێ هێنرا، بەڵام خۆ کۆتایی بە میدییەکان نەهات؟ نەک هەر ئەوە، بگرە لەنێو سوپای فارسدا کەسان و کەسایەتی زۆری میدییەکان پلەی باڵایان پێ سپێردرابوو و دەکرا هیرۆدۆت وەک (میدییە باوەڕپێکراوەکان) گوێی بۆ شل کردبان و زانیاری ڕاست و دروستی چنگ بکەوتایە!!

ئەمەو دامودەزگا خۆجێیەکانی دەوڵەتی ئەخمینی ژمارەیەکی زۆری میدییەکانی لەخۆگرتبوو!!

هەرگیز ڕاست نییە گەر بێژین هیرۆدۆت لایەنگری فارسە ئەخمینییەکان بووە، چونکە ئەو پیاوە، کاریبی نەژاد بووەو لەهەمان کاتدا وڵاتەکەی لەپاڵ

وڵاتانی گریک لە ئاسیای بچووکدا (ڕۆژئاوای ئەمڕۆی تورکیا) لەلایەن ئەخمینییەکانەوە داگیرکرابوو، ئینجا خۆ هیرۆدۆت منداڵی و هەرزەکاریی لە سەردەمی ململانێکانی نێوان فارس و یۆنان نەگوزەراندووە و تێیدا نەژیاوە، بەتایبەتی سەردەمی دەسەڵاتی ئەحشەویرەشی پاشای ئەخمینی!!

من وای بۆ دەچم، کە (فارسە باوەڕپێکراوەکان) - وەک خۆی دەڵێت- ئەوانەی کە زانیارییان بە هیرۆدۆت داوە، بەشێک بوونە لە دیاردەیەکی مێژوویی درێژخایەن، ئەوەش خواست و پێداگیری لایەنە هەرێمایەتییەکان بوو، بۆ شاردنەوەی مێژووی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی باوباپیرانی کورد. ماوەیەکی مێژوویی دووردرێژ، کە دیرۆکی نەتەوەیەکی دێرینی ڕۆژئاوای ئاسیای تیا بزرکراوە. نەتەوەیەک، کە بەزۆری زۆرداری فڕێ دراوەتە دەرەوەی مێژووەوە. ئالێرەدایە مەترسییە گەورەکە، مەترسییەک بە تەنیا لەسەر نەتەوەی کورد نا، بگرە لەسەر هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی و لەسەر گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا بەتایبەتی، چونکە ئەو کەسەی بەم شێوەیەو بە ڕۆحییەتی ڕەشکردنەوەو هەڵکێشانی بنج و بناوانی نەتەوەیەک کار بکات ئامادەی ئەوەشی تیادایە ئەگەر هەلی بۆ هەڵبکەوێت، بەهەمان زهنییەتەوە مامەڵە لەگەڵ سەرجەم گەلانی دنیادا بکات.

قسەکردن لەسەر دیاردەی شاردنەوەی مێژووی کورد و بوونی کورد تازە نییە، ئەوان کوردیان بە وەچەی جڕوجانەوەرو بوونەوەری خورافی و ئەفسانە لە قەڵەم دابوو، ئەمەش باسی ئێمە نییە، بگرە باسی ئێمە لەمەڕ ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە، ڕووداوێک تا نیوەی یەکەمی چەرخی بیست لە کتێبخانەکانی ڕۆژئاوای ئاسیادا بەزەقی بوونی هەیە، ئەویش سەدان کتێبە، کە باس لە مێژووی فارس، عارەب، تورک و ئەرمەن دەکات، ئەم نەتەوانەی کە دەراوسێی لە مێژینەی نەتەوەی کورد بوون، بەڵام سەبارەت بە مێژووی کورد جگە لەبڕێ ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس و گەڕیدە بیانییەکان، کە لێرەو لەوێ شتیان نووسیوەو لەپاڵ ئەم نووسەرە بێگانانەدا مەگەر نووسەرە کوردەکان لەژێر ناوی خوازراو و بە نهێنی شتێکیان نووسیبێت، ئەگینا کتێبگەلێکی مێژوویی وا بە نرخ لەسەر کوردو مێژووەکەی بەرچاو ناکەوێت!

ئەمانە هەموو چ دەگەیەنن؟ تۆ لە ڕەشە خەڵکەکان گەڕێ، ئەی بۆ زۆرینەی زۆری ڕۆشنبیرە عارەبەکان شتێکی ئەوتۆ لەبارەی کوردەوە نازانن؟! لێیان گەڕێ، بەلام بپرسە، بزانە جگە لەبڕێ قسەی بێسەروبەری ڕاگەیاندن، کە پیشەی سەرەکییان ناوزڕاندنی نەتەوەی کورد بووە، چ کارێکی تریان ئەنجام داوە؟ ئاخر ئەوان لە هیچ بارێکدا پشتیان بە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانەی زانستی و لۆجیکی نەبەستووە.

لەڕۆژئاوای ئاسیادا دەزگەی ڕاگەیاندن بە درێژایی نیو سەدە خەریکی ئاژاوەگێڕی و هاندانی ئەم نەتەوە دژ بە ئەویدی و هەردەم خەریکی چاندنی تووی ناکۆکی و دووبەرەکی بوونە!!

چەند نموونەیەک لەسەر چاندنی تووی ڕق و بێزلێبوونەوە لەنێوان گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا:

بڕێ لە عارەبە ناسیۆنالیست و موسڵمانەکان، ناوی (مەجوس)یان لە فارس نا. وشەی (مەجوس) بەلای عارەبەوە، کافرو بێ دین دەگەیەنێ. بڕێ لە تورکەکان بە عارەب یەژن (بیس میللەت)، واتە (نەتەوەی پیس)، بۆ؟ چونکە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەستەبژێرە عارەبەکان بە سەرکردایەتی شەریف حوسێن (والی مەککە) دژی ئیمپراتۆری عوسمانلی هاوپەیمانێتییان لەگەڵ ئینگلیزو فارس بەست و خۆیان ڕزگار کرد، هەروا تورکەکان ناوی (تورکە چیاییەکان)یان لە کورد نا، واتە (تورکە دواکەوتووەکان)، تۆ بڕوانە تورکەکان (کورد)یان کردووەتە تورک و بەوەشەوە نەوەستاون بە دواکەوتووش ناویان زڕاندوون! ئیتر ئاواهی...لە زانکۆ هەر کاتێک بە قوتابییەکانم دەڵێم: (من کوردم) سەرسام و شۆک دەبن، وەک ئەوەی بوونەوەرێکی سەرسوورڕهێنەر و نامۆیان دیتبێت، کە لە هەسارەیەکی دوورەوە هاتبێت تێم دەڕوانن و جارێکی تریش تێم دەڕواننەوە، چونکە بەلای ئەوانەوە سەیرە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا نەتەوەیەک هەبێ بە ناوی (کورد)ەوە بناسرێت، تەنیا کاتێک ناوی سەلاحەدینی ئەیوبی و میری شاعیرانی عارەب ئەحمەد شەوقی و چەند کەسایەتییەکی ناودار دەهێنم و پێیان دەڵێم: ئەوانە کوردبوونە، ئەو کات سەری ئەرێم بۆ دەلەقێنن!!

بە درێژایی سەدەی بیست، تا بە ئەمڕۆمان دەگات، دەبینین نیوەی گرفتە گەورەکانی جیهان، شەڕو ململانێکانی وەک جەنگە نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبییەکان، لە ڕۆژهەڵاتی ناوین و ڕۆژئاوای ئاسیا بەتایبەت ڕوویان داوە، لەکاتێکدا پانتایی ئەم ناوچەیە دە یەکی پانتایی جیهانەو لەوانەیە کەمتریش بێت! ئایا جگە لە زهنییەتی سەرگومکردن، بنبڕکردن و ڕەشکردنەوەو حیساب بۆ نەکردنی ئەوی دی، هیچ هۆیەکی دیکە لە پشت ئەم ئاکامە ترسناکەوە بوونی هەیە؟

پرسیارە گرینگەکە ئەمەیە: ئەوە کێ بوو لەپشت شاردنەوەی مێژووی کوردەوە ڕاوەستا بوو؟ وەڵام: فارسەکان بوون. ئەی بۆ ئەم ڕۆڵەیان بینی؟ چونکە وەسیەتەکەی (کەمبیز)یان جێبەجێ کرد. ئەی کەمبیز کێ بوو؟

## وەسییەتەکەی کەمبیز

سایکۆلۆجییەتی چیا دیکتاتۆرییەت و ستەم و تاکڕەوی پێ قبووڵ ناکرێ، لەبەر ڕۆشنای ئەم بۆچوونەش دەکرێ چاو لە شارە دەوڵەتدارەکانی سۆمەر بکەین، کە لەو سەردەمەدا بە هیچ جۆرێک دەوڵەتێکی ناوەند بەرچاو ناکەوێت! بەوپێیە سۆمەرییەکان گەلێکی چیانشینی ڕەسەن و لە (کوردستان)ەوە لە زنجیرە چیای زاگرۆسەوە شۆڕبوونەتەوە بۆ باشوری دوودەریا و لەوێ نیشتەجێ بوون، هەمان حاڵەتیش لای گەلی یۆنانی کۆن بەرچاو دەکەوێت، ئەو گەلەی کە هەمیشە لە سیاسەتمەدارە زاڵم و خۆسەپێنەکان بێزار بوونەو بەردەوام لە شۆڕشدا بوون و کۆماری شارەکانیان دامەزراندووە.

میدییەکان بە پلە یەک چیانشین بوونە و سایکۆلۆجییەتی چیا بەسەریاندا زاڵ بووە، هەر بۆیە لە سەرەتای دامەزراندنی مەملەکەتی مادە و ستەمکاری تیا هەڵنەکەوتووە، تەنانەت سەردەمی ئیمپراتورییەتی میدیا، پاش ڕووخانی ئیمپراتورییەتی ئاشوورو لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) ئەو دۆخەیی لێ بەدی ناکرێت، بگرە ئیمپراتورییەتی ماد لە بیست و حەوت فیدراڵییەتی خێڵەکان پێک هاتووە. ئەم حاڵەتەش (ویل دیورانت) پشتڕاستی دەکاتەوە، کاتێک دەڵێت: مەملەکەتی

میدیا لە بیست و حەوت قەوارەی سیاسی خاوەن حوکمی لامەرکەزی پێک هاتبوو. ئەم باری لامەرکەزییەتە لە دەسەڵاتداو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دەیاکۆو خەشتریت و کەیخوسرۆدا بوونی هەبووە، بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەستیاگدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەوڵەت لە حوکمی لامەرکەزییەوە گۆڕا بۆ مەملەکەتی ستەمکار و تۆتالیتار.

ستەمکاریی ئەستیاگ لە بەڕێوەبردنی مەملەکەت و خۆخەریکردنی بە ڕابواردنەوە، لەپاڵ ناکۆکی و دابەشبوونی سەرکردە میدییەکان و کێبڕکێ لە پێناو بەدەستهێنانی دەسەڵات و لادانەوەی کۆمەڵگەی میدی بەرەو خۆشگوزەرانی و ناپاکی گەورە، سەرکردەکانی میدی نموونەی هارپاگ، گرینگترین فاکتەری ڕووخانی مەملەکەتی ماد بوو، ئەگینا کوڕشی دووەمی فارس، بەو گشت بلیمەتی و داناییەی خۆیەوە پێی نەدەکرا مەملەکەتی ماد بڕوخێنێت و لەسەر کاولگەی ئەو مەملەکەتە دەوڵەتی ئەخمینی دامەزرێنێت.

گومانی تیا نییە، کە کوڕش پیاوێکی وریاو زرنگ بووەو لە پێناو ڕێگەخۆشکردن بۆ کۆنترۆڵکردنی میدییەکان، سەرەتا فرە نەرمونیان بووە، هۆی ئەم نەرمونیانییەش تەنیا و تەنیا لە پێناو لغاوکردنی ئەواندا بووە، نەک شتێکی دی. دیاکۆنۆف یەژێت: "**کوڕش دەسکاری مەملەکەتی میدیای نەکرد و لە ڕەگوڕیشە هەڵینەکێشا، بگرە وەک خۆی هێشتییەوە، تا گومانی خراپی لێ نەکرێ، لەپاڵ هێشتنەوەی ناوی خۆی وەک پادشای فارس، خۆی بە پادشای مەملەکەتی میدیاش بە خەڵکی ناساند، تا سەردەمی فەرمانڕەوایی داریوش پاشای فارس و میدیا بوو، لەهەمان کاتدا نووسراوە فەرمییەکان بە ناوی (پاشای میدیا و فارس ) دەنووسرا**"[١٣٥].

ئەی ئەوە چییە، کە زیرەکی و دانایی کوڕشمان بۆ دەسەلمێنێ؟

دەبینین لەسەر توندوتۆڵی پێوەندیی خۆی و میدییەکان، جەختی کردووەو بەردەوام ئەو پێوەندییەی پاراستووە و سوودی لە توانا و لێهاتوویی سەرکردەکانی بینیوە و پلەو پایەی سەربازی بە برێک لە گەورە پیاوانی سپاردووە. لەو پیاوە ناودارو لێهاتووانەش **هارپاگ** ـ ی میدی بووە.

---

(١٣٥) دیاکونوف: میدیا، ص

(ویل دیورانت) یەژێت: "**میدییەکان بە ڕووخاندنی پاشا ستەمکارەکەیان فرە دڵخۆش بوون و ڕازی بوون بەوەی کورش بووە بە پاشایان و هیچ دەنگێکی نارەزایەتییان لێ بەرز نەبووەوە**"[١٣٦].

(دیاکۆنۆف) ڕوونتر دەدوێت و دەڵێت: "**سیاسەتی بەردەوامی کورش هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات، سیاسەتی ڕێکەوتن و تەبایی لەنێوان خۆی و (خانەدانە) میدییەکان، تا سەرنجیان بۆ لای خۆی رابکێشێت و پشتگیرییان بەدەست بهێنێت، ئەم سیاسەتەش لەوەدا ڕەنگی دەدایەوە، کە ئەو پاشایانەی لە نەتەوەی مادبوون و بە دیلی بەردەستی دەکەوت نەیدەکوشتن)**"[١٣٧].

پلانەکەی کوڕش لە سنووری دڵڕاگرتنی دەستەبژێرە میدییەکاندا قەتیس نەبوو، بگرە بە پێویستی دەزانی ڕێگەی هەموو ئەگەرێک ببڕێت، کە دەشیا لە ئایندەدا ببێتە تەگەرەو هەڕەشە بۆسەر دەسەڵاتەکەی و نەخشەی دەستبەسەراگرتنی یەکجارەکی دەوڵەت و خاک و گەلی ماد. یەکێک لە ترسناکترین ئەو هەڕەشانەش، مانەوەی ئەستیاگ بوو بە زیندوویی، چونکە دەیزانی مانەوەی ئەو، ئەگەر وەک دیلێکیش بێت، ئەوا واتای هێشتنەوەی سومبولی مەملەکەتی مادو شکۆمەندی میدییەکانی دەگەیاند، هەر بۆیە بڕیاری لەناوبردنی دەرکردو گوناهەکەشی خستە ئەستۆی بەتسیاک.

بەڵام کوشتنی ئەستیاگ مەترسییەکەی بە یەکجاری نەڕەواندەوە، چونکە هەڕشەیەکی تر لە هەڕەشەکەی ئەستیاگ مەترسیدارتر لەئارادابوو، ئەویش میراتگرەکەی پاشا بوو. ڕاستە ئەستیاگ کوڕی لەپاش بەجێ نەمابوو تا جێگەی بگرێتەوە، بەڵام لەم حاڵەتەدا بەپێی یاسای میدییەکان زاوای پاشا مافی میراتگری پێ دەدرا و ئەو ڕەوایەتییەی پێ دەبەخشرا تا لەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشێت. ئەودەم (**ئامیتیدا**)ی کچی ئەستیاگ مێردی بە (**ئەسپیتام**)ی خانەدان کردبوو. وەکو باسمان کرد، یاسای میدییەکان ئەو مافەی بە ئەسپیتام بەخشی بوو، تا جێگەی پاشای کۆچکردوو بگرێتەوە و کوڕشیش ئەو ڕاستییەی باش دەزانی، بۆیە ئەسپیتامی کوشت وئامیتیدای

---

(١٣٦) ول دیورانت: قصە الحضارە، ص٢/٤٠٢.

(١٣٧) دیاکونوف: میدیا، ص٢٩٧.

بێوەژنی کچی ئەستیاگی مارە کرد، بەم پێیەش ڕەوایەتی دەستووری بۆ خۆی زامن کرد[١٣٨].

بەم سیاسەتەی، کۆرش دوو ئامانجی پێکا:

**یەکەم ئامانج:** زوبانی دەستەبژێرە میدییەکانی بەست و ناڕاستەوخۆ پێی گوتن، کە دەوڵەت دەوڵەتی خۆیانە، چونکە دایکی ئەو (ماندانا) کچی ئەستیاگە، واتا میدییەکان خاڵۆی ئەون و لەهەمان کاتدا لە کۆشکی پاشایەتیدا گەورەبووەو پەروەردەکراوەو ڕۆشنبیری میدی کاریگەریی لەسەر کەسایەتی داناوە. هەر کەسیش، شارەزایی لە کۆمەڵگەی کوردی هەبێت، دەزانێت کورد چ سۆزو خۆشەویستییەکی بۆ کچەزاو کوڕەزا هەیە.

نموونەی ئەم سۆزو خۆشەویستییەشی لە پشتگیری کورداندا بۆ **(ئەبی ئەلهەیجاء عەبدولابن حەمدان)**، کە دایکی کورد بوو، دەبینین. کاتێک ناوبراو دژ بە عەباسییەکان، لە ساڵی (٣٠١ ک) لە شاری موسڵ شۆڕشی بەرپا کردو پاش ئەویش هەمان سۆزیان بۆ **(سەیف ئەلدەولەی ئەلحەمدانی)ی کوڕی** دەربڕی، بەوپێیەی کە دایکی کورد بووە[١٣٩].

**دووەم ئامانج:** کەڵک وەرگرتن لە هێزو توانای سەربازی و ئابوری گەلی میدیا لە کاتی داگیرکردنی مەملەکەتی بابل لە باشوری ڕۆژئاواو مەملەکەتی لیدیا لە باکوری ڕۆژئاواو لە کاتی هەڵگیرساندنی شەڕ دژ بە گەلی ماسساجیتای massagetae ئەودەمەی کە وڵاتەکەیان لە (ڕۆژهەڵاتی قەزوین) داگیر کرد.

بەڵام پاش کوشتنی کۆرش لە شەڕی دژ بە گەلی ماسساجیتا لە ساڵی(٥٣٠ پ.ز)، بارەکە گۆڕا و بەلایەکی دیکەدا کەوت، چونکە لە گەرمەی دەسەڵاتی کۆرشدا، فارسەکان دەستیان بەسەر کاروباری دەوڵەتدا گرت و وردەوردە میدییەکانیان دوورخستەوە و پەراوێزیان خستن. فارسەکان کاتێ ئەم کارەیان ئەنجام دا، بڕێ لە سەرکردە میدییەکان بەهۆشدا هاتن و درکیان بەوە کرد، کە بێدەنگییان لە بەرانبەر فارسەکان باری پاشکۆیی و کۆیلایەتی

---

(١٣٨) هارفی بورتر: موسوعه مختصر التاریخ القدیم، ص٨٧. دیاکونوف: میدیا، ص٣٩٦.

(١٣٩) ابن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ٥٢٠/٧. احمد عدوان: الدوله الحمدانیه، ص١١١.

بەسەر خۆیاندا دەسەپێنن. (ویل دیورانت) یەژێت: **"لە چاوتروکانێکدا، گەلی ماد بەرانبەر بە فارس گەورەیی لەدەستدا و بوو بە ژێردەستە و فارسیش بوو بە گەورەی میدیا. هاوزەمان فارس لە ئامادەباشیدا بوو تا ببێتە گەورەی هەموو دنیای ڕۆژئاوای نێزیک"**[140].

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کەمبیزی کوڕی کوڕش (٥٣٠-٥٢٢پ.ز) دەسەڵاتی تاکڕەویی فارس ڕەگ و ڕیشەی تەواو داکوتا، تا ساڵی (٥٢٥ پ.ز) کەمبیز پەلاماری وڵاتی میسری داو داگیری کرد. پاشا کەمبیزی کوڕی کۆڕش لەپاڵ توشبوونی بە نەخۆشی فێ، دەم دەم هەڵچوون و تووڕەبوونێکی شێتانە دەیگرت و کاری زۆر ئابڕووبەرانەی لەدەست دەقەوما.

ئەو کارە ئابڕووبەرانەی چ دەرهەق بە میسرییەکان یاخۆ لەگەڵ خودی فارسەکان جێگەی باسە. بۆ نموونە: گۆڕی پاشاکانی میسری هەڵدەدایەوە و مردووەکانی دەدایە بەر قامچی و فەرمانی دەدا کاهینەکانی خواوەندی (ئەبیس) لە میسر دارکاری بکەن و فەرمانی دا، کە هەر میسرییەک ئاهەنگ بۆ جەژنی ئەو خواوەندە بگێڕێ لە قەنارە بدرێت.

سەرەڕای ئەمانەش فەرمانی بە **(برکسا سبیس)**ی هاوڕێی دا، تا لە میسرەوە بگەڕێتەوە بۆ (سوس)ی پایتەختی فارسەکان و **(سەمیردیس)**ی براکەی خۆی بکوژێت، چونکە خەوی بینی بوو و لە خەونەکەیدا کابرایەک بەناوی براکەیەوە (سەمیردیس) جێگەکەی گرتۆتەوە. ئەمە و لە کارە ئابڕووبەرەکانی دی، **(ڕۆکسانا)**ی خوشکی خۆی مارە کرد، لەکاتێکدا بەپێی یاسای فارس ئەم کارە حەرام بوو. پاشان دووەمین خوشکی مارە کرد و کوشتی، چونکە ڕەخنەی لە ڕەفتارە خوێنڕێژییەکەی گرتبوو. جارێک کوڕێکی بەرکساسبیسی هاوڕێی بە پێش چاوی باوکییەوە بە تیرێک و بەدەستی خۆی کوشتی لەکاتێکدا کوڕەکە هیچ گوناهێکی نەکردبوو. جارێکی تر فەرمانی دا دوانزە پیاو لە سەرکردەکانی فارس سەربەرەو خوار زیندەبەچاڵ بکەن،

---

(١٤٠) ول دیورانت: قصه الحضاره، ٤٠٢/٢.

چونکە برێ تۆمەتی بێ واتایان درابووە پاڵ. ئەم قسانە، هیرۆدۆت پشتڕاستی کردوونەتەوە[141].

کاتێک کەمبیز لە وڵاتی فارسەوە بەرەو وڵاتی میسر کەوتە ڕێ، بەڕێوەبردنی کۆشکی بە موغێکی مەجوسی بەناوی **پیرتزیتس** (هیرۆدۆت بە باتیزیتس ناوی دەهێنێت) سپارد. ئەم پیرتزیتیس ناوە، ئاگەداری کوشتنی سەمیردیسی برای کەمبیز بوو، لە کاتێکدا کەمترین کەس ئاگەداری ئەو کوشتنە بوون و جەماوەری فارس لەو بڕوایەدابوون، کە سەمیردیس زیندووە. پیرتزیتیس برایەکی بەناوی **سەمیردیس** هەبوو[142]، ئەم سەمیردیسە **بە گۆماتا** (گئوماتا)ش ناسرابوو. دیاکۆنۆف دەڵێت: ئەم ناوە بە واتای (شوانە ئاقڵەکە)دێت، وا دەردەکەوێت ناوێکی ڕەسەنی ئارییایە، چونکە لە دەقە ئاوێستاییەکاندا بەشێوەی (هۆگۆ)hogo واتە (خودان گای باش)ـە[143].

میدییەکان لەو باوەڕەدا بوون، کە گۆماتا کوڕی **ئامیتیدا** کچی ئەستیاگە و لە ئەسپیتامی یەکەم مێردێتی، نەک لە کوڕش. ئەم گۆتامایە هاوشێوەی سەمیردیس (بردیا)ی کوڕی کوڕش (برای کەمبیز) بووە و فارسەکان بە (بردیای ساختە) بانگیان کردووە، پیرتزیتیس ڕووداوی کوشتنی سەمیردیسی ئەخمینی قۆستەوە و قەناعەتی بە گۆماتای برای کرد تا لەسەر تەختی پاشایەتی دابنیشێت، هیرۆدۆت دەڵێت: "**بەیاننامەیەکی بۆ هێزەکان لە وڵاتی فارس و میسر نارد، تیادا داوای لێ کردبوون: لەمڕۆ بەدواوە بڕیارەکانی سەمیردیس جێبەجێ بکەن، نەک بڕیاری قەمبیز**".

ئەودەم کەمبیز لە سوریاوە بەرەو فارس دەگەڕایەوە، دانەیەک لە بەیاننامەکەی بەدەست دەگات، بۆیە ڕوو لە برکساسبیس دەکات و پێی دەڵێت:

- **کەوابوو، فەرمانەکەمت ئاوا جێبەجێ کرد؟!**

---

(١٤١) هیرودوت، تاریخ هیرودوت، ص٢٣٣، ٢٣٤.

(١٤٢) لەوانەیە شێوە یۆنانییەکەی (سمیردیس) لە شێوەی ئاری (شاە مەرد)ەوە وەرگیرابێت، کە مانای (پاشای پیاوەکان/ پێشەوا) دەگەیەنێت.

(١٤٣) دیاکونوف: میدیا، ص٣٦٦.

برکسابیس پێی دەڵێت:

**- سەروەرم، ئەوەی بیستت درۆ و هەڵبەستراوە، سەمیردیسی برات لێت هەڵنەگەڕاوەتەوە، بۆیە هیچ هۆیەک نییە تا بکەویتە ناکۆکییەوە لەگەڵیدا، من فەرمانەکەتم بەجێ گەیاندووەو تەرمەکەی بەم دوو دەستەی خۆم شاردەوە. ئەگەر مردوو زیندووبێتەوە، ئەوا لەوباوەڕەدابە، کە ئەستیاخیسی میدی دەگەڕێتەوەو دژی تۆ جەنگ بەرپا دەکات. من ڕێنومایی ئەوەت دەکەم، کە ئەم پەیامهێنەرە (نامەبەر) بگریت و پرسیاری لێ بکەیت تا بۆت ڕوون بێتەوەو بزانیت کێ فەرمانی پێڕەوکردنی سەمیردیسی پاشای داوەتێ.**[144]

کەمبیز فەرمانی دا و کابرای نامەهێنیان ئامادە کرد، کەمبیز هەڕەشەی لێ کرد تا ڕاستی پێ بێژێ: **'سەمیردیس خۆی ئەم نامەیەی دایتێ، یان کەسێکی نێزیک بە ئەو؟ کابرا لەوەڵامدا وتی: لەو ڕۆژەوە، کە قەمبیزی پاشا لەگەڵ سوپاکەیدا بەرەو میسر هاتووە، من بەم دووچاوەی خۆم سەمیردیسی قۆڕشم نەدیوەو ئەو مەجوسەی کە قەمبیز کاروباری کۆشکی پێ سپاردووە ئەم بەیاننامەی پێدام و گوتی: سەمیردیس نووسیویەتی.**[145]

ئاڵەویادا بۆ کەمبیز ئاشکرابوو، کە موغە مەجوسییەکە و براکەی لێی هەڵگەڕاونەتەوەو ژیانی براکەی خۆیشی بە فیڕۆ چوو. بۆیە فرە تووڕە بوو.

بە نیازی گەڕانەوەی بۆ وڵاتی فارس تا پیلانگێڕان لەناو ببات، خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکەی کە بەسەر زینەکەوە خۆی قایم کرد شمشێرەکەی لە کیفەکە دەرچوو و نووکی چەقییە لاڕانیدا و بەو هۆیەوە نەخۆش کەوت. پاش بیست ڕۆژ هەستی کرد مەرگی نێزیک بووەتەوە. سەرکردە سەربازییەکانی فارسی کۆ کردەوە و لەوێدا وتارێکی بۆ دان و گوتی: **'هۆ پیاوانی فارس، ئەم بارەی کە منی تیادام وام لێ دەخوازێت نهێنییەکتان لا بدرکێنم، کە زۆر کۆشام بیشارمەوە. پاشان خەونەکەی خۆی**

(١٤٤) هیرودوت: تأريخ هيرودوت، ص٢٤٦. وليام لانجز: موسوعة تأريخ العالم ١/ ٩٣.

(١٤٥) هیرودوت: تأريخ هيردوت، ص٢٤٦. دياكونوف: ميديا، ص٣٩٠.

و بەرئەنجامەکەشی کە فەرمانی کوشتنی سەمیردیسی براکەی لێ کەوتەوە، هەمووی بۆ باسکردن و ئێستەش ئەوان ژێردەستەی مەجووسیەکانن".[146]

کەمبیز درێژە بە وتارەکەی دەدات و بەژێت: "لەکاتێکدا من لەسەرەمەرگدام، بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم ئەو شتەتان بۆ ڕوون بکەمەوە، کە دەخوازم ئەنجامی بدەن. بە ناوی ئەو خواوەندەی کە ئاگای لە خێزانی پاشایەتیمانە، فەرمانتان پێ دەکەم، بەتایبەتی ئەو ئەخمینییانەی کە لێرە ئامادەن، بە هیچ شێوەیەک ڕێ نەدەن ئارییەکان دەسەڵات بەدەست بهێننەوە، ئەگەر هات و لە ڕێگەی غەدرو ناپاکییەوە دەسەڵاتیان گرتەوە دەست، ئێوەش بەهەمان چەک لێیانی وەربگرنەوە، خۆ ئەگەر بەهێز وەریان گرتەوە ئێوەش پیاوبن و بەهێز لێیان زەوت بکەنەوە، ئەگەر ئەم فەرمانەی منتان بەجێ گەیاند، ئەوا بۆتان دەپاڕێمەوە، کە زەوی لە خێرو بەرەکەتی خۆیدا نوقمتان بکات و منداڵی زۆرتان پێ ببەخشێت و مەڕوماڵاتتان زۆر زیاد بکات و تا دونیا دونیایە بە ئازادی و سەرفرازی بژین. خۆ ئەگەر لە بەدەستهێنانەوەی دەسەڵاتدا سەرکەوتوو نەبوون، ئەوا بەر نەفرەتی من بکەون و چارەنووستان پێچەوانەی داخوازییەکانی من بێت، کە بۆتان پاڕامەوە. سەرەڕای ئەوەش کۆتایی هەر فارسێکی کڵۆڵ و نەگبەت وەکو ئەم کۆتاییەی من بێت".[147]

گریانی بەکوڵ و بارانە فرمێسکی بەخوڕی چاوی پاشا، کاری لە سەرکردەکانی فارس کرد. یەخەی خۆیان دادڕی و شیوەن و زارییان بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە. کەمبیز نەخۆشییەکەی زۆری بۆهێناو بە وچاخکوێری (بێ کوڕو کچ) سەری نایەوەو مرد.

---

(١٤٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٧، ٢٧٩.

(١٤٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## ڕاستییەکان، نەک قسەی پڕوپووچ

ئەوە وەسیەتەکەی کەمبیز بوو بۆ سەرکردە باڵاکانی فارس. ئێمە لە خوێندنەوەی وەسیەتنامەکەی پاشای فارسەوە، ئەم شتانەی خوارەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

یەک: پاش ئەوەی چەند ساڵێکی کەم بەسەر حوکمی فارسەکاندا تێپەڕی، میدییەکان بە هۆش خۆیاندا هاتنەوەو لایان ڕوون بووەوە، کە هاوبەشیی میدی- فارسی لە سەرکردایەتی دەوڵەتە تازەکەدا، جگە لە دەمچەورکردن زیاتر شتێکی تر نەبوو و نرخی ئەم پاشکۆیەتییەش دۆڕاندنی ئازادییەکان بوو، بۆیە لەپێناو بەدەستهێنانەوەی مەملەکەتەکەیاندا دەستیان دایە تێکۆشان.

دوو: فارسەکان بەگشتی و ئەخمینییەکان بەتایبەتی، ترسیان لێ نیشتبوو، ترس لە هەوڵی میدییەکان بۆ بەدەستهێنانەوەی دەسەڵات و فەرمانڕەواییکردنی فارس و گەلانی تری ڕۆژئاوای ئاسیا. ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە سەرکردە فارسەکانی نیگەران دەکرد، بەتایبەتی پاش هەڵسوکەوتکردنیان لەگەڵ چەند هەوڵێکی میدییەکان بۆ بەدەستهێنانەوەی دەسەڵات و زیندووکردنەوەی شکۆی خۆیان و دەوڵەتەکەیان.

سێ: بەر لە دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ لەلایەن باڵاترین سەرکردەی دەوڵەتی فارسەوە، بڕیارێک دەرچوو، تیایدا داوا لە فارسەکان دەکات، کە بە هەموو هێزو توانای خۆیانەوە تێبکۆشن و ڕێ لە دووبارە دامەزراندنەوەی دەوڵەتی میدی بگرن، ئیتر گرینگ نییە ئەو هێزە هێزی چەک بێت یان هێزی فریودان و لەخشتەبردن. بە واتایەکی دی، بۆ ئەوەی تاهەتایە کورد لەژێر چەپۆک و بندەستی فارسدا بمێنێتەوە، دەبێت فارسەکان ڕێ بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی نەدەن. ئالێرەدا هەر کەسێک لە پێوەندیی پانزە سەدەی ڕابردووی نێوان فارس و کورد وردبێتەوە، بەئاشکرا کاریگەریی ناوەڕۆک و ڕۆحی وەسییەتەکەی (کەمبیز) و سیاسەتی دەوڵەتی فارس لەمەڕ کوردانەوە، بۆ ڕوون دەبێتەوە.

**چوار:** بۆ بزرکردن و شاردنەوەی مێژووی دێرینی کورد و فەرهەنگ و ناسنامە نەتەوایەتییەکەی لەناو گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا و جیهان و هەوڵدان بۆ لەبیربردنەوەی کۆی کولتووری کورد، وەسیەتنامەکەی کەمبیز بوو بە بەردی بناخەی ئەو پرۆسەیە.

**پێنج:** وەسیەتەکەی کەمبیز لەپشت شێواندنی وێنەی کوردەوە ڕاوەستاوە. ئەگەر کتێبە مێژووییەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا بخوێنینەوە، ئەوا ئاشکرا دەبێت، کە ڕەچەڵەک و نەژادی فارس و تورک و عارەب و ئەرمەن هەر هەموویان بنیادەمی هاوڕەنگ و هاوتان، بەڵام نەژادی کورد.. نا!!

لەو کتێبانەدا جارێ کورد بە نەوەو وەچەی جنۆکە لە قەڵەم دراوە و تاوێکی دی بە نەوەی جاساد (جسد) شەیتان ناوزەد کراوە و کەڕەتێکی دیکەش بە بەرهەمی پێوەندیی حەرام (حەرامزادە)ی نێوان کەنیزە ئەوروپاییەکان و دێو و درنجەکانی سلێمان پێغەمبەر (پێغەبەری جوولەکە) لە قەڵەم دراوە.

بەکورتی و پووختی و بە کوردییەکەی، ئەو سەرچاوانە گوتوویانە، کە نەژادی کورد لەبنەڕەتدا بنیادەم، مرۆڤ (بەشەر) نەبوون، بگرە بە ڕەگەزی مرۆڤ نامۆن. سەرەڕای ئەمانەش هەر هەموو، لەشان و شکۆیان کەم کردۆتەوەو بە خەڵکانی سەرەتایی و شوان و گاوان ناویان زڕێنراوە.

من ئەم بۆچوونەم لەسەر خەیاڵ و وەهم بونیات نەناوە. دیارە ئەو زانیارییە خورافییانەی پێوەست بە نەژادی کورد لە سەرچاوە مێژووییەکانی مێژووناسە موسڵمانەکانەوە هەڵێنجاوە، جا پرسیارە هەستیارەکە ئەمەیە: ئایا مێژووناسەکان ئەم زانیارییانەیان لەکوێوە دەست کەوتووە؟ ئاخر نە لە قورئان و نە لە فەرموودە باوەڕپێکراوەکانی پێغەمبەری ئیسلامدا، شتێک لەمەڕ کوردو نەژادی کورد باس نەکراوە، ئێ خۆ بەرلە ئیسلامیش عارەب مێژوونووسی تیا هەڵنەکەوتووە و لە کەلەپووری سەرزارەکیانیشدا هیچ شتێکیان سەبارەت بە کورد نەگوتووە، بەڵام لە سەرهەڵدانی ئیسلامدا زانا بەڕەچەڵەک عارەبەکانی نموونەی (محەمەدی کوڕی سائیب ئەلکەلبی (١٤٦ک- مردووە)، ئەبول یەقزان سوحەیم کوڕی خەفس (١٩٠ک- مردووە)، هاشم

کوڕی محەمەد کوڕی سائیب ئەلکەلبی (٢٠٤ک- مردووە) گوتوویانە گوایە، نەژادی کورد عارەبە، کەچی بە هیچ جۆرێک باسیان لەو زانیارییە خورافییانە نەکردووە، کە پشتیان پێ بەستووە.

کەوابوو ئەو سەرچاوانەی باس لە ڕەچەڵەک و نەژادە خورافییەکەی کورد دەکەن سەرچاوەی عارەبی نەبوون، لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر، لە هیچ یەک لە سەرچاوەو نووسراوەکانی سەردەمی ئەمەوییەکانی (بەر لە ساڵی ١٣٢ک) زانیارییەکمان لەوبارەوە بەرچاو ناکەوێت، بگرە ئەو جۆرە زانیارییانە هەر هەمووی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عەباسییەکاندا نووسراونەتەوە، دیارە ئەو کەسەی کە مێژووی چەرخی زێرینی عەباسییەکان (١٣٢-٢٣٢ ک/ ٧٤٩-٨٤٧ ز) بخوێنێتەوە، باڵادەستی فارس و سریان (هاوپەیمانی فارسەکان ) لە بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەکەی ئەودەمی لا ئاشکرا دەبێت و ڕۆڵی گرینگیان لە چالاککردنی بزوتنەوەی وەرگێڕاندا بۆ دەردەکەوێت.

ئەمەو دەستبەسەرداگرتنی فارس و هەوادارانی ڕۆشنبیری فارسی بەسەر زۆرینەی وەزارەتەکاندا لا ڕوون دەبێتەوە، ئەمەش ئەو بۆچوونەمان پشتڕاست دەکاتەوە، کە یەژین، (ئەلمەسعودیی ٣٤٦ ک مردووە)، گشت زانیارییە پڕوپووچەکانی (خورافی) لەمەڕ بنج و بناوانی کورد لە کتێبی (مروج الذهب)دا تۆمار کردووە، لە سەرچاوە فارسییەکان یاخۆ سریانییەکانەوە هەڵێنجاوەو وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عارەبی، هەر ئەوانیش بوون ئەو سەرچاوە فارسییانە، کە هەوڵی شێواندن و سوککردنی میدییەکان و کوردانی نەوەی مادیان داوە، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عارەبی.

## ڕێڕەوی کودەتاکە

لێگەڕێن با بپرسین میدییەکان چۆن لە دەسەلات هەلگەڕانەوە؟

لەودەمەیدا، کە کەمبیز مرد، سەرکردە فارسەکان بە ئەقلیاندا نەدەچوو، سەمیردیسی میدی و - پیرتزیتیس- ی برای دەستیان بەسەر دەسەلاتدا گرتبێت. ئەم بڕوایەیان پتەوتر بوو کاتێک برکساسبیس بەتوندی کوشتنی - سەمیردیس - ی کوڕی کەمبیزی ڕەت کردەوە. ئەم ڕەتکردنەوەشی لەکاتێکدا هات ترسا لەوەی کە پاش مردنی کەمبیز فارسەکان سزای بدەن و تۆلەی لێ وەربگرنەوە. ئەوە بوو سەمیردیسی میدی بۆ ماوەی حەوت مانگ دەسەلاتی گرتە دەست. لە ماوەی ئەو حەوت مانگەدا گرینگی بە ئازادکردنی گەلە چەوساوەکانی بن دەسەلاتە ستەمکارەکەی فارس داو باج و خەراج و باربووە زۆرەکەی لەسەر لادان و بڕیاری دا لەوەو پاش ڕۆلەکانیان ڕەوانەی بەرەی جەنگە یەک لەدوای یەکەکانی ئیمپراتۆرییەت نەکات. لەم بارەوە هیرۆدۆت یەژێت: **"لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەجووسییەکاندا، گەلە بندەستەکان قازانجی زۆریان کرد، هەر بۆیە جگە لە فارسەکان، هەموو گەلە بندەستەکانی دەولەتی فارس مەرگی ئەو پیاوە، ئێشی پێگەیاندن و دایان بەچۆکدا بۆی، ئەو هەر کە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، گشت نەتەوە ژێردەستەکانی بۆ ماوەی سێ سال لە خزمەتی سەربازی بواردو لە باج و خەراجیشی بەخشین، بەلام دوای حەوت مانگ لە فەرمانڕەوایی بارودۆخێک هاتە ئاراوە ئیتر شتەکە ئاشکرا بوو و ڕووی ڕاستەقینەی هەلمالرا"**(١٤٨).

بەرانبەر بەم کودەتایە، سەرکردە فارسەکان دەست لەسەر ئەژنۆ دانەنیشتن و زۆر زوو بەوردی بەدواداچوونیان بۆ کرد، ئەوەی کە زۆرتر بەم کارەی سەمیردیسی میدی ڕاچلەکا و ترسی لێ نیشت، ئۆتانیسی کوڕی فرناسبیسی گەورە دەولەمەندی فارس بوو. یەکەم شت، کە تێبینی کرد ئەوە بوو، کە سەمیردیس لە ڕۆژی دەسبەکاربوونییەوە شوێنە قایمەکانی پایتەختی بە

(١٤٨) هیرودوت: تاريخ هيرودوت، ص٢٤٩.

جێنەهێشتووەو نەچووەتە دەرەوەی کۆشک و لە هیچ دانیشتنێکی تایبەتی خۆیدا تەنیا بۆ جارێکیش، کەسێکی لە خانەدانەکانی فارس چاو پێ نەکەوتووە، هەروەها دەستی بەسەر هەموو شاژنەکاندا گرتووە و لێکی جیاکردوونەتەوەو هەریەکێکیانی بە تەنیا لەکۆشکێکدا دوور لەیەک نیشتەجێ کردووە.

ئەمە و - فیدم - ی کچی ئەوتانیش یەکێک بوو لە ژنەکانی پاشا، بۆ دڵنیایی خۆی ئۆتانیس لە (فیدم)ی کچی پرسی، کە ئایا ئەو سەمیردیسە، کوڕەکەی کۆڕشە یان نا؟

کچەکەی گوتی: ئەو ناتوانێ لێکیان جیا بکاتەوە، چونکە تا ئێستە سەمیردیسی کوڕی کوڕشی چاو پێ نەکەوتووە.

ئۆتانیس دەیزانی جارێک لە جارەکان کۆرش لە گوماتا (سەمیردیس)ی میدی ڕقی هەڵساوەو وەک سزایەک هەردوو گوێچکەی بڕیوە، بۆیە نامەیەکی بۆ کچکەی نووسی و تیایدا وتی: "**ئەوەی پێت دەڵێم دەبێ بیکەیت، هەر شەوێک بۆ ڕابواردن هاتە لات، بەوردیی بڕوانە تا خەوی قووڵ دەیباتەوە، پاشان دەست بە گوێچکەکانیدا بهێنە، ئەگەر گوێکانی بەردەستت کەوتن، ئەوا بزانە مێردەکەت سەمیردیسی کوڕی کۆڕشە، خۆ ئەگەر گوێیەکانی پێوە نەبوون، ئەوا بزانە مێردەکەت سەمیردیس مەجووسییە**"(١٤٩).

شەوی جووتبوون، **سەمیردیسی** پاشا هات و **فیدیم** داواکەی باوکی جێبەجێ کردو دڵنیابوو، کە پاشا هەردوو گوێچکەی بڕاوە، کەواسا پاشا کوڕی کۆڕش نییە، ئیتر زۆر بەپەلەو بۆ بەیانییەکەی باوکی لێ ئاگەدار کردەوە. بەوپێیە ئۆتانیس دڵنیابوو، کە پاشاکەیان، پاشا سەمیردیسی میدییە، نەک سەمیردیسی کوڕی کۆڕش. ئینجا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو کوشتنی دوو برا میدییەکەو بەدەستهێنانەوەی تەخت و تاجی ئەخمینی، لەگەڵ شەش کەس لە گەورە پیاوانی فارسدا ڕێک کەوت. دارا (داریوش)ی کوڕی هایستاسبیس (هەشت ئەسپ) یەکێک بوو لە ناودارترین ئەو حەوت کەسە. شایەنی باسە دارا (داریوش) ( کوڕی فەرمانڕەوای هەرێمی فارس بوو)، هەر حەوت هاوڕێ سوێندیان بۆ یەک خواردو تاوتوێی ئەو پلانەیان کرد، کە دەبێت جێبەجێی

---

(١٤٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٠.

بکەن. بڕیاریان دا زۆر بەپەلە کودەتا پێچەوانەکە جێبەجێ بکەن، بەڵام دەبێت زۆر بەوریاییەوە هەنگاو بنێن و بۆ پاراستنی نهێنییەکەیان هەموو ئەگەرەکان بەرچاو بگرن، بۆیە دارا پێداگری لەسەر زوو ئەنجامدانی پلانەکە دەکرد و دەیخواست هەر ئەو ڕۆژە جێبەجێی بکەن.

مشتومڕێکی توند لەنێوان حەوت کەسەکەدا ڕووی دا. ئۆتانیس بە بڕیارەکەی دارا ناڕازی بوو. ئەو دەیگوت: بەناو ئەو هەموو پاسەوانەدا، کە هەموو کون و کەلەبەرێکیان تەنیوە چۆن دەکرێ بچینە ناو کۆشک و دەستمان بگاتە پاشا؟ بەڵام دارا لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو و گوتی: پاسەوانەکان بێ دوودڵی ڕێگەیان دەدەن، چونکە ئەوان لە سەرکردە باڵاکانی فارسن. ئەو زیاتر بابەتەکەی ڕوون کردەوە پێی گوتن: **"سەرەڕای ئەوانە، من بیانوویەکی گونجاو و ماقوڵم بەدەستەوەیە، یەژم من لە فارسەوە هاتووم و نامەی باوکم، کە فەرمانڕەوای فارسە، پێیە بۆ پاشا، ئەی ئەگەر درۆ پێویست بێت، بۆ نەیکەم؟! ئێمە هەموومان یەک ئامانجمان هەیە، جا چ درۆ بکەین یان ڕاست بێژین"**(١٥٠).

جۆبریسا(١٥١) یەکێک بوو لە حەوت سەرکردە فارسەکە، زۆر لایەنگری پلانەکەی داریوش بوو و گوتی: **"هاوڕێیانم ئایا هەلێکمان بۆ هەڵدەکەوێت لەم هەلە لەبارتر، تا تەختی تیا ڕزگار بکەین؟ خۆ ئەگەر سەرنەکەوتین، دەبا هەر ئێستە بمرین، ئایا ڕەوایە مەجوسییەکی گوێبڕاو حوکمی فارس بکات؟ هەر**

---

(١٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٢.

(١٥١) ئەرشاک سافراستیان دەڵێت: بە پشتبەستن بە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان جۆبریاس (گۆبریاس ـ Gobryas)، سەرکردەی میدیی (ئۆگوبارۆ ـ Ugbaru) بووە، کە پێشەنگی جەنگاوەرە گوتییەکان (پێشینانی کورد) بووە، کە لە داگیرکردنی شاری بابلدا لە ساڵی (٥٣٨ پ.ز) یارمەتی کوڕشی دووەمیان داوە. هەر ئەوانیش یەکەم کەس بوون چوونە ناو شارەکەوە. ئەو بە (گۆبارۆ ـ Gubaru)یش ناوی براوە و لەپای خزمەتکردنی لە بواری سەربازییدا خەڵاتی کردووە و بە فەرمانڕەوای ئەو شارە دایمەزراندووە و دوای ئەوەیش بە جێگری پاشای ئەوبەری ڕووباری فورات و پاشای سوریاو فەلەستین دایمەزراند. بەڵام (د. محەمەد بەیومی مەهران)، دەڵێت: (گۆبارۆ/ گۆبریاس – Gubryas) فەرمانڕەوای بابلی نەژاد بوو و بە لای کوڕشدا شکانییەوە. بڕوانە: أرشاک سافاراستیان: الکرد وکردستان، ص٣٨. محمد بیومی مهران: تأریخ العراق القدیم، ص٤٦٥.

کەسێک لە ئێوە لە کاتی سەرەمەرگدا لەپاڵ کەمبیزەوە ڕاوەستابێ، لەعنەتەکەی لەبیر ناچێتەوە، نەفرەتی لەو فارسە کرد، کە لەپێناو ڕزگارکردنی تەختدا تێ ناکۆشێت... دەی با بەپەلە ڕوو لە کۆشک بکەین و پەلاماری مەجووسییەکان بدەین. هەموو بە پێشنیازەکەی ڕازی بووون".[152]

(١٥٢) هیرودوت: تأریخ هیرودوت، ص٢٥٣.

## کوشتوپر و ئەنجام

وا دەردەکەوێت، کە لەو دەمەدا بەدگومانی لە ناسنامەی سەمیردیسی میدی زیادی کردبێت، بۆیە بۆ خۆڕزگارکردن، هەردوو برا بیریان لەڕێگەچارەیەکی ئاسان کردەوە، سەرەتا بڕیاریان دا پێوەندیی بە (بەرکساسبیس)ەوە بکەن و بۆ لای خۆیان ڕای بکێشن؛ چەند هۆیەکیش لەپشت ئەم بیرۆکەوە بوو، **یەکەمیان** کەمبیز زۆر دڵڕەقانە ساتوسەودایی لەگەڵدا کردبوو و کوڕەکەی کوشتبوو. **دووەم** ئەو تاکەکەس بوو، کە دەیزانی سەمیردیسی کوڕی کوڕش لەژیاندا نەماوەو کوژراوە. **سێیەم** لەناو کۆمەڵگەی فارسدا پیاوێکی ناودار و ناسراو بوو، بۆیە بانگیان کردو لە پای پشتگیریکردنیان تەماحێکی باشیان خستە بەرچاوی و بۆ بێدەنگکردنی پارەیەکی مۆڵیان خستە بەردەستی. برکساسبیس بەداواکەیان ڕازی بوو، بۆ ئەو مەبەستەش هەردوو برا جەماوەری فارسیان بانگێشتی دەرەوەی شورەی کۆشک کرد، تا برکساسبیس وتاریان بۆ بدات و پێیان ڕابگەیەنێت، کە پاشاکەیان سەمیردیسی کوڕی کوڕشەو جگە لەو کەسێکی تر نییە، هەر بەم جۆرەش گومانی جەماوەر دەڕەوێتەوە.

لە کاتی دیاریکراودا پیاوانی فارس گردبوونەوەو برکساسبیس لەسەر لووتکەی (تاوەر)ەکە ڕاوەستا، تا گەواهی بۆ پاشا بدات، بەڵام پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی کە بە هەردوو برای دابوو، لە وتارە گەرم و بە جۆشەکەیدا ڕێک دژی خواستەکانی ئەوان هاتە گۆ و باسی لە شەجەرەی ڕەچەڵەک و نەژادی کوڕش کردو پاشان بە شانوباڵی باوەگەورەی ئەخمینیی ئەودا هاتە خوارەوە. ئەو لە وتارەکەیدا پەنجەی خستە سەر گشت ئەو خزمەتە زۆرو زەوەندەی کە کوڕش پێشکێش بە فارسی کردووەو باسی لەوەش کرد، کە چۆن لەژێر فشاری کەمبیزی پاشادا سەمیردیسی کوڕی کوڕشی بەدەستی خۆی کوشتووە. **"ئێستە وڵات لە بندەست مەجووسییەکاندایە، لە کۆتاییشدا دوعای کرد و پاڕایەوە، کە فارسەکان قەت خۆشی لە ژیانی خۆیان نەبینن ئەگەر**

**تەختی پاشایەتی نەگێرنەوە ژێر دەستی خۆیان. پاشان هەر لەو بەرزاییەوە بەبێ هیچ دوودڵی خۆی هەڵدایە خوارەوە"**[153]، کتوپڕ گیانی دەرچوو.

هاوپەیمانە حەوت کەسییە فارسەکە، بێ ئاگا لەو ڕووداوەی ناو کۆشکی پاشایەتی، هەنگاویان دەنا. لەنیوەی ڕێگەدابوون بەرەو کۆشک هەواڵی دانپیادانانەکەی برکساسبیسیان پێگەیشت. پاش ڕاگۆڕینەوەیەکی سەرپێیی و بەپەلە ناکۆکییەکانیان بەزۆرینەی دەنگ بەلای ڕاکەی دارادا براندەوە و بەبێ ئەوەی پاسەوانەکان ڕێگەیان لێ بگرن چوونە ژوورەوە، بەڵام پیاوە خەسێنراوەکانی کۆشک ڕێگریان لێ کردن، بەڵام ئەوان بۆچوونە ژوورەوە زۆریان بەکارهێناو بە خنجێر پیاوە خەسێنراوەکانیان لەتوپەت کرد، ئا لەو کاتەدا، کە هەردوو برا میدییەکە لە ئەنجامی ناکۆکی برکساسبیس دەکۆڵینەوە، گوێیان لە هات و هاواری خەسێنراوەکان بوو، بەپەلە بەرەو لایان چوون، بەڵام زانییان تازە کار لەکار ترازاوەو دەبێت خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە بکەن، لەو پێکدادانە کتوپڕەدا دوو کەس لە دەستە حەوت کەسییەکە بریندار بوون. لە ئەنجامدا جووتبرای میدیی شەڕەکەیان دۆڕاند. ئەم ڕووداوە لە ساڵی (٥٢٢ پ.ز) قەوماوە. هیرۆدۆت دەڵێت:
**"دوای کوشتنی مەجووسییەکان، پێنج پیلانگێڕەکە سەریان لەلاشەیان جیاکردەوە و بە دوو سەری براوەوە و بەدەم بەرپاکردنی هەرا و هورییایەکی زۆرەوە ڕوویان لە خەڵکی کرد و باس و خواسەکەیان بۆ گێڕانەوە. ئینجا قۆڵیان لێ هەڵماڵی و هەر کەسێکی مەجووسییان بەدەم ڕێوە دەبینی پەلاماریان دەدان و دەیانکوشتن. خەڵکەکەش، کە بەخیانەتی دوو براو قارەمانێتی فارسیان زانی زۆر بەپەلە چاویان لە پێنج کەسەکە بڕی و دەستیان کرد بە مەجووسی کوشتن. ئەو ڕۆژە ئەگەر تاریکی و شەوی بەسەردا نەهاتایە، ئەوا فارسەکان، مەجوسییەکانیان تاقبڕ دەکردو قڕیان تێ دەخستن. ئیتر ئەو ڕۆژە لە ساڵنامەی فارسدا بوو بە ڕۆژێکی دیارو هەموو ساڵێک بەناوی کوشتنی مەجووس ئاهەنگیان دەگێڕا و ڕێگە نەدەدرا لەو ڕۆژەدا هیچ مەجوسییەک دەربکەوێت. بۆیە لە ماڵەکانیاندا هەر هەموویان خۆیان حەشار دەدا و دەرنەدەچوونە دەر"**[154].

---

(١٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٤.

(١٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٥٥ – ٢٥٦.

له وردبوونەوەمان بۆ ئەو کودەتا میدییە، ئەم ئەنجامانەمان بۆ دەردەکەوێت:

- **یەک:** سرووشتییە هەوڵی دوو برا میدییەکە بۆ بەدەستهێنانەوەی دەسەڵات بەفیرۆ بچێت، چونکە پشتیان بە جەماوەر نەبەستبوو. بەپێی قسەی هیرۆدۆت و دیۆرانت، هیچ کەسایەتییەکی میدی لەگەڵ پیرتزیتس و گۆماتای برایدا بەشداری کودەتاکەیان نەکردووە، بەتایبەتی دەبینین لەناو پایتەختی مەملەکەتدا ژمارەیەکی زۆر لە میدییەکان بوونیان هەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی ڕۆژی کوشتنی دوو برا میدییەکە، خەڵکێکی زۆر لە میدییەکان بەکوشت چوون.
- **دوو:** سەرکردە فارسەکان پێداگیرییان لەسەر جێبەجێکردنی وەسیەتنامەکەی کەمبیز کردووەتەوەو بڕیاریان داوە بەوپەڕی بوێری و باوەڕبەخۆبوونەوەو بە ڕۆحێکی پڕ لە فیداکارییەوە دەسەڵات لە دەستی میدییەکان وەربگرنەوە.
- **سێ:** لەبارەی گۆماتاوە، دیۆرانت دەڵێت: "**ئەو کابرایەکی توندڕەوی سەر بە ڕێبازی مەجوسی کۆن بوو هەردەم دەکۆشا ئاینی زەردەشتی، کە ئاینی دەوڵەتی فارس بوو لەناو ببات، بۆیە لە دژی ئەو شۆڕشێکی تر بەرپابوو و تەخت و تاراجیان تێکوپێک دا**"[١٥٥]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ناکۆکی و ململانێکە تەنیا سیاسی نەبووە، بگرە ئایدۆلۆجیش بووە.

## ئایا مەجوسەکان میدی بوون؟

گێڕانەوەکەی هیرۆدۆت لەمەڕ کودەتای میدییەکان، ئەو پرسیارەی سەرەوەمان لەلا دەورووژێنێت، تا وەڵاممان بەدەست بکەوێت دەبێت بەپەلە چاوێک بە ئاین و بیروباوەڕی گەلانی ئاریایی پێش زەردەشتییەتدا بخشێنین.

ئەو دەمە قەومی میدیی و فارس و باقی گەلانی ئارییە ڕۆژهەڵاتییەکان ئاینی مەزدایی و میترایی Mithraism یان پێڕەو دەکرد، ئەمەو ئاینی میترایی دەدرایە پاڵ خواوەند میترا (مترا/ میترو/ مترا)ی خواوەندی پەیمان و داد و

(١٥٥) ول ديورانت: قصه الحضاره، ص ٢/٤٠٦.

ستەم، ئارياييە ڕۆژهەڵاتييەكان خۆريان بە سيمبولی ئەو خواوەندە دادەناو پاشاو خەڵكە ڕەشۆكييەكەش دەيان كردە پێشناوی خۆيان، نموونەی متراداتيس (ميترادات- بەخششی ميترای خوداوەند) بوو[١٥٦].

بە گشتی دەكرێ بڵێين: مەزدايی و ميترايی دوو دێرينترين بيروباوەڕی ئاينی ئارياين لە جيهانی كۆندا و چينێك لە موغی ميدی بە فەرمی ئەم پلەوپايە ئاينييەيان بە ميراتی بۆ دەمايەوە و سەرپەرشتی نوێژ و تاعەت، پەرستن و فەرمانە ئاينييەكانيان دەكرد، ئەمە و پياوانی ئەم چينە ئاينييە بە ڕەچەڵەك دەچوونەوە سەر خێڵی ميديی ماغۆيی (ماغوويیmagoi)، ئەم خێڵەش بە يەكێك لە شەش خێڵە سەرەكييەكەی نەتەوەی ماد دەژمێردرێت. ئاشكرايە، كە پاشكۆی (س) لە تايبەتمەندی ناوە يۆنانييەكانە و هيرۆدۆت بەزۆرينەی ناوەكانەوە لكاندوويەتی.

بەم پێيەش ناوی (ماغويی ـ magoi) ميدی گۆڕا بۆ وشەی (magos)ی يۆنانی و (موغە) زەردەشتييەكانی سەردەمی ئەسكەندەريان بەم ناوە ناساند. ئەم وشەيەش بەلای يۆنانييەكانەوە واتای (مەزن، فرە)ی دەگەياند، چونكە مەجوسەكان (موغەكان) لەبواری دانايی و كاری جادوويی سەير و تەردەستيدا داهێنەر بوونە. عارەبەكانيش وشەی (مەجووس)يان لەناوی (ماجوس) وەرگرتووە و لە زمانی ئينگليزيدا وشەی [15] (magic، سيحر دەگەيەنێ، دەبێت ئەوەش بڵێين، كە چينی مەجووس هاوشێوەی چينی كاهەنوتی عيبرانی بەتايبەت نەوەی سيتەكان و هاوشێوەی چينی كاهەنوتە بتپەرستەكانی عارەبە مەككەييەكانی سەردەمی جاهيلی سەر بە (بەنی عەبد مەناف) بوون.

ئاشكرايە، كە زەردەشت (زەرتوشت، زەرتەشت، زرادەشت، زاراتوشترا، زراووستر) لە ئەترۆپاتين atropautene [158] نێزيك دەرياچەی ورمێ لەدايك بووە و لەنێوان سالانی (٦٦٠-٥٨٣ پ.ز) ياخۆ (٦٣٠-٥٥٣) يان (٦٢٨-٥٥١) پێش زاين ژياوە.

---

(١٥٦) جفری بارند: المعتقدات الدينيه لدى الشعوب، ص١٢٥-١٢٦.

زەردەشت، لە تەمەنی چل ساڵیدا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و داوای لە نەتەوەکەی خۆی (میدییەکان) کرد تا بێنە سەر ئاینەکەی، بەڵام میدییەکان دەستیان بە ڕوویەوە ناو بەرەنگاری بوونەوە، بۆیە زەردەشت ڕووی لە هەرێمی باکتریا (باختریا) کرد. باختریا ناوچەیەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاریانا (کە ئێستە دابەش بووەتە سەر باشووری تاجیکستان و باکوری ئەفغانستاندا)، ئەودەم (هەشت ئەسپ ـ فشتاسپ) hyestaspes ی فەرمانڕەوای باکتریا ئاینەکەی قبووڵ کرد. ئەمە و لە پتر لەیەک سەرچاوەدا هاتووە، کە هیستاسپ باوکی دارا بووە[159].

ئاینی زەردەشتی لەنێو گەلانی ئاری نەژاددا بڵاو بووەوە، بەتایبەتی لە هەرێمی فارس و بەرەبەرە تەنگی بە بیرو باوەڕی مەزدایی هەڵچنی، بەڵام مەزداییەت وەک بیروباوەڕێکی سەردەمی مەملەکەتی ماد پێڕەو دەکرا، کەچیی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەخمینییەکاندا ئەم وێنەیە ڕۆشن نییە، ئەوە بوو کەمێ بەرلە ئێستە، وتەکەی دیۆرانتمان باس کرد، کە دەڵێت: "**سەر بە مەزهەبی مەجوسی بوو**[160]**، بێوچان بۆ لەناوبردنی زەردەشتییەت، ئاینی فەرمی دەوڵەتی فارس تێ دەکۆشا**".

هەر لەسەر ئەم بابەتە دیورانت دەڵێت: "**دارای یەکەم بۆیە ئەم ئاینە نوێیەی قبووڵ کرد، ڕەنگە ئاینەکەی بە هاندەرێکی باش بۆ گەلەکەی لە قەڵەم دابێت، هەر لەسەرەتای دەسەلات گرتنەدەست، جەنگێکی سەختی دژ بە پێڕەوکەران و موغە مەجوسییەکان بەرپاکرد و ئاینی زەردەشتی بە ئاینی فەرمی دەوڵەت قبووڵ کرد**"[161].

لەدرێژەی ئەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئاینی زەردەشتی، ئاینی فەرمی دەوڵەتی ئەخمینییەکانی سەردەمی کەمبیز نەبووە، بەڵگەش بۆ ئەم

---

(١٥٩) صمویل نوح کریمر: اساطیر العالم القدیم، ص٢٩٤. حامد عبدالقادر: زرادشت بین قدامی الایرانین، خ٢٩. دیاکونوف: میدیا، ص٣٤٠، ولیام لانجر: موسوعه تاریخ العالم،٩١/١-٩٠، ولز: معالم تاریخ الانسانیه، ٣٥٨/٢. احمد فخری: دراسات فی تاریخ الشرق القدیم، ص٢٣٠.

(١٦٠) دوور نییە، کە مەبەستی بیروباوەڕی مەزدایی بووبێت.

(١٦١) ول دیورانت: قصه الحضاره، ٤٢٦/٢.

بۆچوونەمان ئەوەیە، کەمبیز موغە پیرتزیتیسی مەجوسی بە ئەمینداری کۆشکی پاشایەتی دەستنیشان کردبوو. ئەو موغەیە، کە لەسەر ئاینی مەجوسیی کۆن (مەزدائییە- ئەزدائییە) بووە، لە سەرگوزەشتەکەی دیورانتەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە لە دەمی فەرمانڕەوایی دارای یەکەمدا زەردەشتییەت بووەتە ئاینی فەرمی دەوڵەت.

ڕەنگە ئاینی مەجوسیی کۆن (مەزدائی - ئەزدائی) ئاینی بەربڵاوی سەردەمی مەملەکەتی ماد بووبێت و ئەو دەمە پێگە فەرمی و جەماوەرییەکەی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی کۆرش و کەمبیزدا لەدەست نەدابێت، بەڵام ئاینی زەردەشتی پرسەکەی بەلادا خستبێت، ئەم یەکلاییکردنەوەش بە مەرگی هەردوو برا میدییەکە بە ئەنجام گەشتووە. دیارە نێزیکترین ڕێگەش بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتەکەیان سەرنگونکردنی بیروباوەڕەکەیان و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بە بیروباوەڕی زەردەشتی نەیاری وەک ئاینی فەرمی دەوڵەت، کۆتایی بە پرسەکە هێنابێت.

وا دەردەکەوێت، کە ململانێی نێوان میدییەکان و فارسەکان تەنیا سیاسی نەبووە، بگرە ململانێی ئایدۆلۆجیش بووە، بۆیە هەریەک لەو دوو گرووپە، کە لە سێبەری ئایدۆلۆجیایەکدا تێکۆشاون، کە ڕەوایی سیاسی پێ بەخشیون، ئەوەتا دارای یەکەم بە شانازییەوە دەڵێت: **"ئەو پەرستگایانەی کە گۆماتا وێرانی کردن من وەک ئەوەی هەبوون بونیاتم نانەوە، ئەو شتەش گۆماتای موغە دەستی بەسەردا گرتبوو، من بەدەستم هێنایەوە"**[١٦٢].

لەو ڕۆژەوەی کە ئایدۆلۆجیای مەزدایی دۆڕاندی و ئایدۆلۆجیای زەردەشتی سەرکەوت، ئیتر میدییەکان (باوباپیرانی کورد) لە ڕۆژئاوای ئاسیا ڕۆڵی ڕۆشنبیری و سیاسی خۆیان دۆڕاندو مێژوو، تەنانەت بوونیشیان بەر هێرشی بزرکردن و شێواندن کەوت. من وای بۆ دەچم، کە هەردوو موغە میدییەکە پیرتزیتیس و سەمیردیس، کاریان بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی مەزدایی و لەغاوکردنی زەردەشتییەت کردبێت، بەوپێیەی کە ئاین و ئایدۆلۆجیای

---

(١٦٢) دیاکونوف: میدیا، ص٤٠١.

میدییەکان بووە، ئەم کارەشیان ڕێگەخۆشکەربوو بۆ گێڕانەوەی دەسەلات و مەملەکەتی ماد.

لێرەدا دەبێت بڵێین: گرینگە بەوردیی لە سرووشتی پێوەندیی نێوان مەزدایی و زەردەشتی بڕوانین و ئەو ڕووداوە سیاسییە یەک لەدوای یەکانە بخوێنینەوە، کە لەتەک دەرکەوتنی زەردەشتی لە ڕۆژئاوای ئاسیا هاتنە ئاراوە، چونکە هیچ بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری لە بزوتنەوەی سیاسی جیاناکرێتەوەو خوێندنەوەی سەرهەڵدانی ئاینەکان بەدوور لە ڕووداوە سیاسییە کۆمەلایەتییە ئابوورییەکانی هەر سەردەمێک خوێندنەوەیەکی ناتەواو و نەزۆک دەبێت.

## (١٠)

# شۆڕشگێڕی میدی (فراوورت)

## (ساڵی ٥٢١ پ.ز کوژرا)

**باوکەکان و کوڕەکان**

سێ کەس بە کەڵکی سەرکردایەتی نەتەوە نایەن: ستەمکار، گەمژە (ئەحمەق)و گێل.

**ستەمکار**، کەسێکی بیر تەسکەو لە گۆشەنیگای بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە مامەڵە لەگەڵ واقیع و ڕووداوەکاندا دەکات و خۆپەرستانە سیاسەت دادەڕێژێت، سەرەڕای ئەمانەش بەچاوی گومانەوە لە کەسایەتییە هۆشمەندو خاوەن ئەزموونەکان دەڕوانێت و ڕاوبۆچوونیان بەهەند وەرناگرێت و سوودیان لێ نابینێت و تواناو هێزی داهێنانیان یەک ناخات، هەربۆیە کۆمەڵگە دەبێتە دوو بەشەوە: بەشە گەورەکەی لە کەسانی دڵسۆزو بەرهەمهێن پێک دێت، بەڵام تووڕەو تۆڵەسێن، چونکە ڕێی پێ نادرێت لە بونیاتنان و پێشخستندا بەشداریێکی کارابێت. ئەو بەشەکەی تر، کەمینەیەکی هەلپەرست و گەندەڵ و ڕووخێنەرە. بۆیە ئەم دابەشکردنی کۆمەڵگەیە دەبێتە هۆی ململانێ و گەندەڵی و ناکۆکی و لاوازی و بەرئەنجام ماڵوێرانی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بەڵام ئەحمەق **(گەمژە)**، چونکە زۆر بڕوای بە خۆیەتی، پەی بەهێزو

توانای خۆی نابات و نازانێت چ شتێکی پێ هەڵدەسورێت و چ کارێکی پێ ناکرێت. ئەو لە هەڵسوکەوتیدا هەڵەشەیەو هەڵسەنگاندنی بۆ شتەکان ناواقعییەو بە لۆجیکی قازانج و زەرەر لە مێژوو ناڕوانێت، بگرە بڕیارەکانی بە دیدگەیەکی شێوە نموونەیی (میسالی) وەردەگرێت و خۆی بە کەسێکی لەڕادەبەدەر بەتوانا دەزانێت و ئارەزووەکانی بەسەر داناییدا زاڵ دەبێت و تاکڕەوانە بڕیار دەدات و لەبڕیاروەرگرتندا بەپەلەو تیژڕەوە. ڕاستە کەسی ئەحمەق تائەوپەڕی بەرائەت دڵپاک و ئازاو بەجەرگەو فرە زوو هەڵدەچێت، سەخی تەبیعەتە تا ڕادەی دەسبڵاوی و تا ئاستی لەخۆباییبوونیش شانازی بەخۆیەوە دەکات و تا سنووری لوتبەرزی هەست بە گەورەیی دەکات، لە فریادڕەسیی و بەدەنگەوەچوونەوە بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێت، بەڵام ئەمانە هەمووی نابنە لەمپەرو ڕێگر لەبەردەم هەڵەی گەورەو کوشندە، هەڵەیەک خۆی و گەلەکەی و نەوەکانی ئایندەش تووشی کارەسات و بەڵای قورس و ماڵوێرانی دەکات.

هەرچی کەسی گێلە، ئەوا چونکە کورتبین و کۆڵکە ڕۆشنبیرە، بەگوێرەی پێویست درک بە شتەکان ناکات و لەتوانایدا نییە پشت پەردە ببینێت و لە خوێندنەوەیدا بۆ ڕووداو و کەسەکان بێ تواناو کۆڵە. ڕووداو و کەسە ناوخۆیی و هەرێمایەتی و جیهانییەکان بەوردیی و قووڵ ناخوێنێتەوە و ساحێب بیرکردنەوەیەکی ڕووکەش و سادە لەوح و نائەقڵانییە و لەڕووی شارەزایی و ئەزموونی سیاسی و ئیدارییەوە دەستکورت و هەژارە، کەسی شیاو لە شوێنی شیاو دانانێت و بڕیاری گونجاو لە کاتی گونجاودا وەرناگرێت و کەسێکی خۆشباوەڕەو هەر خۆی ساحێب کردارو پەرچەکردارە. بەرئەنجام شکست دێنێت و خۆی و گەلەکەی تووشی داڕووخان و ترازان و لاوازی و دۆڕان دەکات.

جا ئەگەر هەریەک لەو کەسانەی کە باسمان کرد، حاڵی وابێت، ئەی حاڵی ئەو کەسە چۆن دەبێت، کە لەیەک کاتدا ستەمکار و ئەحمەق و گێلیش بێت. بە واتایەکی دی ئەگەر ئەو سێ پەسنە لە سەرکردەیەکی وەک ئەستیاگی پاشای ماددا کۆببێتەوە، دەبێت چ ڕوو بدات؟

ئێمە لێرەدا مەبەستمانە قسە لە ئەستیاگ بکەین. ئەستیاگی پاشای مەملەکەتی ماد، کە بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەتێکی لە ئەستۆدا بوو. ئیمپراتۆرییەتێک لە بارودۆخێکی هەرێمایەتی ئاڵۆز و دەورەدراو بە دوشمنگەلێک، کە چاویان لە موڵک و تاجەکەی بڕیبوو، ئاخۆ لەودەمەدا دەبێت حاڵ لەچ بارێکدا بووبێت؟!

بەڵێ، ئەمە ڕوانینی سەرەتایی ئێمەیە، کاتێک باس لە مێژووی ژیانی ئەستیاگ دەکەین. ئێمە لێرەدا ئەو قسانە دەگێڕینەوە، کە پێمانگەیشتووە، یان ڕاستتر وایە بڵێم: ئەو هەواڵە دەست هەڵبەست و قسە هەڵواسراوانەی کە بە مەبەست و نیازەوە بۆ نەوەکان گوازراوەتەوە، لەم کاتەدا، کە ئەم بابەتە دەنووسمەوە، ئەم پەندەم دەکەوێتەوە بیر، کە دەڵێت: **(ئەگەر بەران بەلادا هات چەقۆبەدەستان زوو دەگەنە سەری)**، ئەم نموونەیە سەبارەت بە ئەستیاگ شیاوە.

دوای ئەوەی ئەستیاگ بەرانبەر بە کوڕش جەنگ و مەملەکەت و تەخت و تاراجی دۆڕاند، ئیتر بوو بە ئامانج و بەلایەنی کەمەوە، لە سێ بەرەوە تیرباران کرا:

**بەرەی یەکەم:** فەرمانڕەوا فارسەکان بەگشتی و دەسەڵاتدارە ئەخمینییەکان بەتایبەتی، هەوڵی ناوزڕاندنی ئەستیاگیان داوەو گەرەکیان بووە لەبەرچاوی نەوەی گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا، وەک ستەمکار وێنای بکەن. ئەوان دەڵێن: ئەم پاشایە (ئەژدیها) بووەو فەرمانی داوە ڕۆژانە دوو گەنجی بۆ بکوژن و مۆخی سەری ئەو دوو گەنجە دەرخواردی دوو مارەکەی سەرشانی بدەن، تا ئازاری بشکێت و کەفوکوڵی دەروونی دابمرکێتەوە، ئەنجامی ئەم قسە پڕوپووچانە، پاکانەکردن بووە بۆ ڕووخاندنی و دەسگرتن بەسەر ئیمپراتۆرییەتی مادا.

**بەرەی دووەم:** ئەو سەرکردە میدییانە بوون، کە ڕقیان لێ هەڵگرتبوو و ململانێیان دەکرد، تا گەشتە ڕادەی یارمەتیدانی کوڕش و ناپاکیکردن لە پاشاو مەملەکەت و چارەنووسی نەوەی گەلەکەی خۆیان. نموونەی باڵای ئەو ناپاکییەش، فەرماندەی باڵای سوپای میدیی، هارپاگ بوو. من وای بۆ دەچم، کە سەرکردە ناپاکەکانی میدیی لەبواری ناشرینکردنی ناو و ناوبانگی

ئەستیاگ هیچیان لە فارسەکان کەمتر نەبوو و هێندەی فارسەکانیش بە کەوتنی مەملەکەت و مەلیکەکەیان دڵخۆش بوون.

**بەرەی سێیەم:** ئەو مێژونووسانە بوون، کە ئەستیاگیان بە کەیخوسرۆی باوک و خەشتریتی باپیرو دەیاکۆی باوەگەورە بەراورد دەکرد. ئەم مێژووناسانە جیاوازییەکی گەورەو زۆریان لەنێوان ئەم و ئەواندا بەدی دەکرد. ئەوان، کەڵەپیاوی بەتواناو یەکلاکەرەوە لە مەیدانی جەنگدا، پیاوانی پێشەواو سیاسەتمەداری لێزان و بەتوانا، دامەزرێنەرو بونیادنەر، کەچی ئەستیاگ، پیاوی شەیدا بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و کۆشک، گێلەپیاوێکی ئەحمەق و ناسیاسی و بەرپرس لە ڕادەستکردنی ئیمپراتۆرییەتی ماد بە فارسەکان.

ڕاستە ئەستیاگ لە هیچ ڕوویەکەوە بە باوباپیرانی بەراورد ناکرێت، بەڵام ڕاست نییە گوناهی ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتەکە هەر هەمووی بخرێتە ئەستۆی ئەو، ڕاست نییە لێکهەڵوەشاندەوەو لەتلەتبوون و لاوازی و ئایندەی تاریک و ونبوونی کۆمەڵگەی میدیی بە تاکی تەنیا ئەوی پێ تاوانبار بکرێت. هیچ گومانی تیادا نییە، کە لەناو میدییەکاندا سەرکردەی وەک هارپاگی فەرماندەی باڵای سوپا بوونیان هەبووە، کە هاوشانی ئەستیاگ لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاردا کاریگەری خۆی بەجێ هێشتووە، بەڵام بۆ نالەبارکردن و خراپ بەلاداخستنی باری ناوخۆو دەرەوەی مەملەکەتەکە، ئەستیاگ کاریگەرتر بووەو پشکی شێری بەردەکەوێت.

بەکورتی، باوکەکان تفتوتاڵییان چەشت، بەڵام کوڕەکانیان جاڕس بوون و باجەکەیان دا، هەرچۆن سەمیردیس (گۆماتا)و پیتزیتیسی برای، یەکەمین دوو کەسی میدی بوون ڕاپەڕین و باجەکەیان دا. ئێمە لێرەدا باس لە مێژووی کوڕە میدییەکی دی دەکەین، کە باوانی ئەو تفتوتاڵییان چەشت و ئەم یەقی کردەوە و باجی دا. ئەو کوڕەش (فراوورت- phraortes)ی میدیی شۆڕشگێر بوو.

## پرۆژەی ئیمپراتۆری

بەر لەئێستە گوتمان دەبێت بەوریاییەوە مێژوو بخوێنرێتەوە، بە خوێندنەوەیەکی کەتواری و ڕوون و زانستییانە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و بە زهنییەتێکی بابەتییانە، هاوسەنگی تیادا بپارێزرێت و لەسەر بنەمای ڕاست و ڕەوان دوور لە نیازی شاراوەو ناڕەوا خوێندنەوەی بۆ ئەنجام بدرێت و دوور لە لێکدانەوەی پڕوپووچ و مەبەستی ناڕەوا، بەتایبەتی لە کاتی خوێندنەوەی مێژوویەکدا، کە لایەنێکی دی نووسیبێتییەوە و بە شانوباڵیدا هەڵدابێت و زیادەڕەویی تیادا کردبێت یاخۆ شێواندبێتی و ساختەی تیادا کردبێت. لێرەدا من بەوپەڕی جورئەتەوەو دوور لە درێژدادڕی هەق بە خۆم دەدەم جارێکی تر چاو بەو سەرگوزەشتە ئەفسانەییەدا بخشێنمەوە، کە سەبارەت بە دۆڕاندنی پاشا ئەستیاگی میدی و سەرکەوتنی کۆڕشی ئەخمینی دارێژراوە.

بە بۆچوونی خۆم و بەوپێیەی لۆژیکی مێژوو قبووڵی دەکات، پرسەکە جگە لە ململانێی نێوان دوو گەلی هاوسێ و سەربەیەک ڕەگ و ڕەچەڵەکی دێرین، کە ئەوانیش (فارس و میدیی) بوونە شتێکی تر لەئارادا نییەو نەبووە:

- گەلی فارس لەسەر جوگرافیا و خاکێکی هەژاری کەم پیت و بەرەکەت، ژیانێکی سەختی گوزەراندووەو پاشکۆ و ژێردەستەی دەوڵەتی مادی هاوسێی بووە. بۆیە بیری لە خۆدەربازکردن لە (جوگرافیای برسێتی)و داگیرکردنی (جوگرافیای بەپیت) کردووەتەوە و چاوەڕوانی هەلێکی گونجاو و لەباری کردووە تا ئازادی بەدەست بهێنێت و خۆی حوکمی خۆی بکات، بۆ هەنگاونان و گەیشتن بەم ئامانجەش پێویستی بە پێشەوایەکی ژیر و ئازا و وریا و بە توانا هەبوو. سەرکردەیەک توانای ئەوەی هەبێت تاکەکانی گەل لەوپەڕی پەرتوبڵاوییەوە ڕزگار بکات و یەکیان بخات و بەرەو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و سەروەت و سامانی باش ئاڕاستەیان بکات، تا لە دواجاردا

ئەو سەرکردە چاوەڕوانکراوەیان بۆ پەیدا بوو، ئەویش کوڕشی دووەمی کوڕی کەمبیزی یەکەم بوو.

لەولاشەوە گەلی میدیی خۆی لە (جوگرافیایەکی دەوڵەمەند)دا دەبینییەوە. جوگرافیایەک (ڕێگەی ئاوریشم) ڕێگەی بازرگانی جیهانی بەناودا تێ دەپەڕی و لە سایەی سەری سەرکردە بەناوبانگەکانی وەک (دەیاکۆ، خەشتریت و کەیخوسرۆ)دا، لە چەند هۆزو خێڵێکی پەرتوبڵاو و ناکۆکەوە ببێت بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ و خودان دەوڵەتێکی بەهێز و ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بۆڕ بدات و بیڕوخێنێت، لەدواییشدا ببێت بە بەناوبانگترین ئیمپراتۆرییەتی ڕۆژئاوای ئاسیاو لەپاڵ ئەو باج و خەراج و دەسکەوتە زۆر و زەوەندەدا، کە پاشاکانی بەدەستیان دەهێنا ئاسوودە و بەختەوەر بژێت، بەڵام ئەم نەتەوە تووشی بەڵایەک بوو، کە لە پاشا ئەستیاگ و چەند سەرکردەیەکی بیرتەسک و خۆپەرستدا بەرجەستە بوو. دەردو بەڵایەک، یەکگرتوویی ئەم نەتەوەیەی هەڵوەشاندەوەو دواییش زەمینەی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ناکۆکی و ململانێکانی هێندە قووڵ کردەوە تا وەک خۆرە بەربووە جەستەی کۆمەڵگەکەی و شی کردەوەو لێکی ترازاند.

ئیتر زەمینە خۆش و لەبار بوو، تا گەلی فارس بجوڵێت و ئازادی و سامانی زۆر بەدەست بهێنێت، بەڵام گرفتی کوڕش لەوێدا زەق بوویەوە، کە بە ڕزگارکردنی گەلەکەی دڵی ئاو ناخواتەوەو ڕازی نابێت، بۆیە بزووتنەوەکە لە شۆڕشێکی نیشتمانییەوە دەگۆڕێت بۆ فەرمانڕەواییەکی ئیمپراتۆری و حەزو ئارەزووی داگیرکاری بەسەریدا زاڵ دەبێت و وەک هەژموونگەرایەک بەرەو مەملەکەتی بابل و پاشکۆکانی لە سوریای گەورە پەل دەهاوێت و داگیری دەکات.

کۆرش بەوەشەوە ڕانەوەستاو مەملەکەتی لیدیاو باقی دەوڵەتەکانی ئاسیای بچووکی داگیر کرد. ئەم داگیرکارییانە کە میدییەکان هەنگاویان بۆ هەڵهێناو پێیان نەکرا، کۆرش بە ئەنجامی گەیاند.

دوای جەنگ و داگیرکارییەکی زۆر، کۆڕش پەلاماری مەملەکەتی ماسساجیتای massagete ی (ڕۆژهەلاتی دەریای قەزوین)دا، دواجار لەوێ

دۆڕاندی و سەری خۆیشی لەسەر دانا. **هیرۆدۆت** لەم بارەیەوە دەڵێت: **جەنگەکە کۆتایی هات، تۆماریس** (ژنە پاشای گەلی ماسساجیتای) فەرمانی دا، لەنێو تەرمی کوژارەوەکاندا بەدوای تەرمی کۆڕشدا بگەڕێن و بۆی بهێنن، کە تەرمەکەی کۆڕشیان هێنایە بەردەستی، کەللە سەرەکەی هاویشتە ناو مەنجەڵێکی پڕ لەخوێنەوەو پڕ بە گەرووی هاواری کرد و گوتی: "**دەی هێندە خوێن بخۆرەوە تا تینوێتیت دەشکێ**"[163].

لە بواری داگیرکاریدا، کەمبیز لە کۆڕشی باوکی کەمتر چاوچنۆک و تینوو نەبوو. ئەم پاشایە وڵاتی میسری داگیر کردو چاوی بڕییە ئەسیوبیای باکوری ئەفریقا. پاش کەمبیز نۆرەی دارای یەکەم هات. دارا هێندە چاوچنۆک بوو لە تەنگەی بسفۆر پەڕییەوە ئەوبەرو لە باکوری دەریای ڕەش، وڵاتی ئیسکیتی داگیر کردو بە نیاز بوو پەلاماری وڵاتی یۆنانیش بدات، بەڵام (ئەحشویرەش)ی کوڕی، پرۆژە داگیرکارییە ئیپراتۆرییەکەی تەواو کرد. ئەوە بوو ئەسینای داگیر کردو ئەکرۆپول، کە کۆمەڵگەی ئاینی گریکی پیرۆزی لەخۆگرتبوو، ئاگر داو سووتاندی.

## وریابوونەوەی دەستەبژێری میدییەکان

چاوچنۆکی و چڵێسی ئەخمینییەکان و قۆرخکردنی هەموو جومگەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری، میدییەکانی بەگشتی و سەرکردەکانی بەتایبەتی بەئاگا هێنایەوە و زانییان خراپ تووش بوون. ئاخر هەر ئەوان بوون دەسبەرداری پاشاکەی خۆیان (ئەستیاگ) بوون و لە پێناو ڕزگاربوون لە ستەم و زۆرداری پشتی کۆڕشیان گرت، چونکە کۆڕش لەناو کۆشکی پاشا ئەستیاگی میدی باپیریدا، پێگەیشت و لە کانیاوی فەرهەنگی میدیی پاراو و لەناو دامەزراوە سەربازییەکەیدا وەک سەرکردەیەک هەڵسوکەوتی کردبوو. ڕەنگە ئەمانە هەموو پێکەوە سەرکردە باڵاکانی میدی نموونەی هارپاگی هان دابێت تا ئەو بڕوایەیان لا بچەسپێت، کە مەملەکەتی میدیا وەک خۆی دەمێنێتەوەو

---

(١٦٣) هیرودوت: تاریخ هیرودت، ص١٣٠.

سەرکردە میدییەکان لە لووتکەی دەسەڵات لانادرێن و مەملەکەتەکەشیان لە ناوەڕۆک و شێوەدا نابێتە مەملەکەتێکی ئەخمینیی فارسیی ڕووت و پەتی.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کوڕشدا، بەرپابوونی هیچ شۆڕش و ڕاپەڕینێکی میدییەکانمان بەرگوێ ناکەوێ. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە، کە کوڕش وەک پادشای میدیا حوکمی کردووە، نەک وەک پادشای فارس، هەر ئەم هۆیەش وای لە شاژنی ماسساجیتای و هی دی کردووە تا لە نامەکانیاندا کوڕش بە (پاشای میدییەکان) ناوبەرن. هەر هەمان هۆ سوپای میدی و سەرکردەکانی نموونەی مازاریس و هارپاگی هان داوە تا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە لەژێر فەرمانی کوڕشدا بجەنگن و لە داگیرکارییەکاندا یارمەتیدەری کارابن.

بەڵام لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کەمبیزدا، شتەکان گۆڕان و دەوڵەت بە دڵ و بە گیان بوو بە دەوڵەتی فارس و هەموو پلە باڵاکان و گشت سامانی مەملەکەتەکە لەلایەن دەسەڵاتدارە فارسەکانەوە قۆرخ کرا، هەر ئەم وەرچەرخانە بوو سەرکردە میدییەکانی بەئاگا هێنایەوە.

سەرکردە میدییەکان، کە چاویان کردەوە بەسەر ڕاستییەکی فرە تاڵدا کەوتن، ئیتر بۆ خۆڕزگارکردن لەو بارە نالەبارە، کە خۆیان و گەلەکەیان تێی کەوتبوون، لەپێناو بەدەستهێنانەوەی دەسەڵاتدا کەوتنەخۆو یەکەم هەوڵی کودەتا بە سەرکردایەتی هەردوو موغەی برا سەمیردیس (گۆماتا) و پیرتزیتیس بەرپا کرا، بەڵام داراو هاوڕێکانی وەسیەتنامەکەی کەمبیزیان جێبەجێ کردو ڕووبەڕووی میدییەکان بوونەوە و نەیانهێشت کودەتاکە سەر بگرێت، ئەنجامەکەشی کوشتنی هەردوو برا میدییەکە و کوشتارگەیەکی کەم وێنەی دەرهەق بە میدییەکانی لێ کەوتەوە.

لۆجیکی ڕووداوەکان پێمان دەڵێت: داراو هاوڕێکانی لە سەرتاپای میدیادا پاکتاوێکی بەرفرەوانیان ئەنجام داوەو هەرچی سەرکردەیەکی میدیایان بەر چنگ کەوتبێت و سووکە گومانێکیان لێ کردبێت، کە دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژان بێ گوێییان بکات و لە قسەی دەسەڵاتدارە ئەخمینییەکان دەربچێت، کوشتویانن. هەروەها لۆجیکی ڕووداوەکان جارێکی دی یەژێت، دەشێت دارا

کۆڵەکەی ئیداری سەربازی و ئابووری و ڕۆشنبیری وا داکوتابێت، بەتەواویی ڕێی لەبەردەم فارسەکان خۆش کردبێت تا هەرچی دامودەزگەی گرینگی دەوڵەت و کۆمەڵگەی هەیە، هەمووی خستبێتە بندەست و چنگی خۆیانەوە، هەر ئەم سیاسەتەش پێبەپێی میدییەکانی پەراوێز خست و لە گشت بوارە جیاجیاکاندا لەبەرچاو بزری کردن، تا لەکۆتاییدا و بەدرێژایی دوو سەدە لە گۆڕەپانی هەرێمایەتی و جیهانیشدا، ناوبانگ و بوونیان پشتگوێ بخرێت.

باشترین بەڵگە بۆ ڕاست و دروستی بۆچوونەکەمان ئەوەیە، لە سەردەمی پارسەکان (٢٤٩ پ.ز- ٢٢٦ز) دەبینین، وردەوردە باس و خواسی میدییەکان لە کەمی دەدات و لە سەردەمی ساسانییەکان (٢٢٦-٦٥١ز) بە یەکجاری ناویان لەبەین دەچێت و لە بازنەی شارستانییەت وەدەردەنرێت، بۆیە ناچار خۆی دادەبڕێت و بەرەو چیاکان هەڵدەکشێت و لەوێ دەگیرسێتەوە. پاشان وەک سالآنی پێش دامەزراندنی مەملەکەتی ماد دەست بە ژیانی ئاژەڵداریی خۆی دەکاتەوە. ئیتر لەو دەمەوە ئەرکی ئەم نەتەوە پڕکردنی گەنجینەی ئیمپراتۆرییەتە یەک لەدوای یەکەکان دەبێت و سوپاکەشیان بە جەنگاوەری بەتواناو ئەسپی ڕەسەن و بەهێز دەوڵەمەند دەکات. بەڵێ، ئیتر ئەم نەتەوە لەو دەمەوە ناوناوبانگی وەک (میدی) لەدەست دەدات و ناوی نوێی (کورد)ی شوانکارەو سەرەتایی و پاشکەوتووی لێ نرا. تەنانەت ئەگەر پاشایەکی فارس بیویستایە بە سووکی بانگی کەسێک بکات، ئەوا نازناوی (کورد)ی لێ دەناو دەیگوت: **(هێشتێ تۆ، کوردی لەژێر ڕەشماڵی کورداندا گەورە بوو)**. ئەم دەربڕینەش لە نامەیەکی پاشای بەرسی (ئەشگانی)دا هاتووە، کە بۆ ئەردەشێری کوڕی بابەکی ساسانی ناردویەتی[١٦٤].

(١٦٤) الطبري: تاريخ الطبري، ٣٩/٢.

## راپەڕین

پاش کودەتا سەرنەگرتووەکەی موغە سمیردیس (گۆماتا) و براکەی، وا دیارە دووهەمین نەوەی سەرکردە میدییەکان لە سایەی سیاسەتی فارسەکاندا پتر زەرەرمەند بوو‌بێتن و زیاتر هەستیان بە جەورو ستەم کردبێت. یەکێک لە سەرکردە بەناوبانگەکانی ئەم نەوەیە، **(فراوورت** - phraortes) (فرئوورت، فراوورتیس، فراوورتیش) بووە. بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبارەی ئەم سەرکردە لەبەردەست دایە، بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو کەسێکە لە چینە خانەدانەکانی میدی سەر بە خێزانی (پاشا دەیاکۆ) و نازناوی خەشتریت (گەشتریت)ی بۆخۆی هەڵبژاردووە. ئەمەش هەمان ئەو نازناوەیە، کە فراوورتی دووهەم بناخەدانەری مەملەکەتی میدی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. بەر لەوەی باس لە راپەڕینەکەی بکرێت، با چاوێک بە بارودۆخی وڵاتی میدیاو فارس و بەشەکانی تری ئیمپراتورییەتی فارسدا بخشێنین.

ئاشکرایە، دارای یەکەم هێزێکی فارسی دژ بە کودەتای دوو برا میدییەکە، سەمیردیس (گۆماتا)و پیرتزیتس پێک هێنابوو. ڕاستە توانی بچێتە کۆشکەوەو دوو برا میدییەکە بکوژێت و کودەتاکە کپ بکاتەوە، بەڵام ئەوە تەنیا میدییەکان نەبوون لەژێر باری قورسی دەسەڵاتی فارسدا دەیانناڵاند، بگرە گەل و نەتەوەکانی تری بندەستی فارس، ئارەزووی ئازادی و ڕزگاریی لەناخیاندا چەکەرەی کردبوو، بۆیە لە مانگی تشرینی دووەم و سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (٥٢٢ پ.ز)، ڕاپەڕینێکی سەرتاپاگیر بەرپا بوو.

لە **باشورەوە**، گەلی ئیلام بە سەرکردایەتی (ئەشین) ناوێک ڕاپەڕی **و لە باکورەوە**، شۆڕش لە ئەرمەنستان هەڵگیرساو لە **ڕۆژئاواوە**، گەلی بابلی بە سەرکردایەتی (تی دین توبل) شۆڕشی بەرپاکرد. شایەنی باسە، ئەم سەرکردە بابلییە کوڕی نابونیدی دواپاشای بابلیی بەر لە داگیرکاری فارسی ساڵی (٥٣٨ پ.ز) بوو. لە **ڕۆژهەڵاتەوە و** لە (مرغیانا)، کە بەشێک بوو لە وڵاتی باکتریا (باختریا)ی ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین، ڕاپەڕین بە

سەرکردایەتی (فرادا) ناوێک ڕووی دا. هەروەها لە ساڵی (٥٢٢ پ.ز) لە وڵاتی میسرو برێ بەشی تری ئیمپراتۆرییەتی فارس ئاڵای شۆڕش هەڵکرا[١٦٥].

وەک تاک، ئەشێ برێ کەس بیری کۆڵ بێت، بەڵام بیرەوەری گەل هەرگیز کۆڵ نابێت و ڕووداوەکان لە بیرەوەری کۆمەڵگەدا بەزیندوویی دەمێننەوە. ئاساییە کوشتن و سەرپەڕاندنی موغە سەمیردیس و براکەی، بە دەستی سەرکردە فارسەکان ڕۆحی تۆڵەی لای میدییەکان بەگشتی و سەرکردەکانیان بەتایبەتی جووڵاندبێت، یا بەلایەنی کەمەوە چەند کەسێکی وروژاندبێت. دیارە سەمیردیس و براکەی سەر بە چینی نەجیبزادەو دوو موغەی بەناوبانگ و ناسراوی ناو دامەزراوە ئاینییەکەی مەزدائییەت یا زەردەشتییەت بوون، (ئەم شتە فرە ڕوون نییە)، کەواسا خەڵکێک هەبووە پشتگیرو هەواداریان بووبێت، چونکە بێ پشت و پەنا ناچێتە عەقڵەوە سەمیردیس توانیبێتی بۆ ماوەی حەوت مانگ حوکمی ئیمپراتۆرییەتی فارس بکات! بۆیە بەدوور نازانرێت داوای هاوکاری لە هەوادارانی کردبێت و لۆجیکی سیاسەتیش پێمان دەڵێت بۆ ڕێگەخۆشکردن لەبەردەم ڕامالینی سەرکردە فارسەکان و زیندووکردنەوەی مەملەکەتی ماد، وردەوردە لەناو دامودەزگە دەوڵەتییەکەدا، خەریکی دامەزراندنی کەسایەتییە میدییەکان بووبێت.

بێگومان سەرکردە فارسەکان لە نێزیکەوە چاودێریی باردۆخەکەیان دەکردو زیندووبوونەوەی مەملەکەتی میدیا و لە کیسچوونی ئەو هەموو دەسکەوتەیان، کە لە سەردەمی کۆڕش و کەمبیزدا بۆ فەراهەم بوو، نێزیک دەهاتە بەرچاو. بۆیە زۆر زوو و بەپەلە حەوت سەرکردە، کە دارا چاوساغیان بوو، کەوتنە خۆو لەو هەڵمەتەدا تەنیا بە کوشتنی دوو موغە ئارییەکە نەوەستان، بگرە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە میدییەکان، ئەو ڕۆژە کوشتارگەیەکیان دامەزراندو دەستیان دایە کۆمەڵکوژی، هەر ئەم کۆمەڵکوژییە بووە مایەی بێزاریی و تووڕەبوونی میدییەکان و زەمینەی ڕاپەڕینی لە دڵ و دەروونی میدییەکاندا خۆش کرد، بەوپێیەی کە کەسانێکی بەرچاو لە خانەوادە میدییەکان وشیارتر و زەرەرمەندترین کەسی ئەو

---

(١٦٥) دیاکونوف: میدیا، ص٤٠٠-٤٠٨.

ڕۆژگارە تاڵ و پڕ لە ستەم و سوێیە بوون، بۆیە هاوبەشی کارای پەژارە و تووڕەیی جەماوەرەکەی خۆیان بوون.

**فراوورت،** ئەو نەجیبزادەیە، کە بە ڕەچەڵەک دەچووە سەر خانەوادەی پاشا دەیاکۆ، سەرجەم ئەندامی خانەوادە میدییەکان لە دەوری کۆبوونەوە، تا ئەودەمە بیرەوەریی میدییەکان لێوڕێژبوو لە وێنەی جوامێری و شکۆی باوباپیرە میدییەکانیان (دەیاکۆ، خەشتریت و کەیخوسرۆ)، ئەوان هەردەم چاویان بڕی بووە ئەو بنەماڵەیە، کە لە هۆز و خێڵە میدییەکان ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن و پڕ خێریان دامەزراند.

ئەوە بوو فراوورت سەرقاڵیی دارای لە سەرکوتکردنی گەلی بابلیدا قۆستەوەو سەرکرادیەتی ڕاپەڕینە مەزنەکەی کرد.

دیاکۆنۆف دەڵێت: **فراوورت** لەپاڵ جەماوەری میدیدا هاووڵاتییانی بارسیا (ڕۆژهەڵاتی فارس)و هیرکانیا (باشووری دەریای قەزوین، باکوری ئێرانی ئەمرۆ) و ئەرمەنستانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا(١٦٦).

ئەم هەنگاوە ژیرانەی فراوورت، واتە هاوڕێ گرتن و هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ گەل و نەتەوە دەراوسێ و چەوساوەکاندا، وانە و پەندێکی گرینگ بوو لە دامەزرێنەرانی مەمەلکەتی ماد فێری ببوو، لە کاتی پێویستدا دژ بە دەسەڵاتی فارس سوودی لێ بینی.

هاوشانی میدییەکان لە هەرێمەکانی ڕۆژئاوا بە چاوساغیی **(وەهەیزدانە)**ی سەرکردە، جەماوەر ڕاپەڕی. شایەنی ئاماژە پێکردنە، لە هیچ سەرچاوەیەکدا زانیاری وردو دروستمان سەبارەت بەم سەرکردەیە لەبەردەستدا نییە، نازانین ئایا فارس بووە یان میدی یان سەر بە ئەتنیکێکی دی، بەڵام سەبارەت بە ڕاپەڕینی (فراوورت و وەهەیزدانە)، دیاکۆنۆف هەواڵێکی سەرنجڕاکێشمان دەداتێ و دەڵێت: **"ئامانج لەو دوو ڕاپەڕینە زیندووکردنەوەی یاسای بەردییای ساختە (گۆماتا) بوو، کە ڕژێمی داریوشی یەکەم لەناوی برد"**(١٦٧).

---

(١٦٦) دیاکونوف: میدیا، ص٤٠٨.

(١٦٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٧.

مەبەست لە (یاسای گۆماتا) ئەو بڕیارە بوو، کە سەمیردیسی میدی (گۆماتا) لە سەرەتای دەسەلاتە حەوت مانگەکەیدا دەری کرد، کە لە دوو بواری گرینگ و لە ئاستی جەماوەریدا خۆی دەبینییەوە:

**یەکەم:** خۆشبوون لە هەموو ولایەتەکانی بندەستی ئیمپراتۆرییەت، لە خزمەتکردنی بەزۆری سەربازی بۆ ماوەی سێ ساڵ.

**دووەم:** خۆشبوون لە هەموو ولایەتەکان لە باج و خەراج و سەرانەی ئاژەڵ، کە ئیمپراتۆرییەتی فارس بەسەریاندا سەپاندبووی.

ڕەنگە (**وەهەیزدانە**) سەر بەخێڵێکی میدیی هەرێمەکانی ڕۆژهەلات بووبێت، یان سەر بە خێڵە ئارياییە نافارسەکان بووبێت، چونکە بڕوا ناکرێت ئەگەر فارس بووایە دژ بە دەسەلاتی دارای پاشای فارس بجەنگایە.

### داڕووخانەکە

ڕاپەڕینەکان تەشەنەیان سەند. ڕاپەڕینی فراوورت لە ولاتی میدیا و ڕاپەڕینی (وەهەیزادانە) لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلات بۆ دوو شۆڕشی جەماوەریی بەجۆش و خرۆش پەرەیان سەند. لە نەخش و نیگاری چیای بێستووندا هاتووە، دەڵێت: هاوولاتییە شۆڕشگێڕەکانی کۆمەڵگە ڕاپەڕین و پێوەندییيان بە فراوورتیش (فراوورت) کرد[١٦٨].

بەلام دارا پیاوێک نەبوو بە ئاسانی چۆک دابدات. ئەو سەرکردەیەکی بەتواناو ژیرو بوێر بوو، بۆیە بەوپەڕی چاوکراوەیی و داناییەوە هەڵسوکەوتی کردو بە سەرکردایەتی فەرماندەی ئەرمەنی (دادرشیش) سوپایەکی بە ئاراستەی ئەرمەنستاندا ڕەوانە کرد.

بەپێی قسەی دیاکۆنۆف، دارا سوپایەکی تری بە سەرپەرشتی (**ویدارنا**)ی **نزیکترین هاوڕێی خۆی**، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فراوورت ڕەوانەی میدیا کرد. دەبێت ئەوەش بڵێین: شوناسنامەی (ویدارنا) ئاشکرا نییە، کە ئایا بە ڕەگەز فارسە یان میدی؟ چونکە ئەودەمەش سەرکردە و جەنگاوەری میدی

---

(١٦٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٧-٤٠٨.

له سوپای فارسدا بوونیان هەبووە. هەرچۆنێک بێت دەستنیشانکردنی هاورێیەکی نێزیکی خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فراوورت، ئەوەمان پێ دەڵێت، کە قۆڵی میدیا گەورەترین هەڕەشەی سەر دەسەلاتی فارس بووە[١٦٩].

له ١٢ی کانونی دووەمی ساڵی (٥٢١ پ.ز) شەڕ لەنێوان سوپای ویدرانا و سوپای مادەکان، کە فەرماندەیەکی نێزیک لە فراوورت سەرکردایەتی دەکرد، لە ڕۆژئاوای میدیا بەرپا بوو، بەڵام ویدرانا هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێناو گەشتە ئەو بڕوایەش، کە ناتوانێ شۆڕشەکە دابمرکێنێتەوە، بۆیە چاوەڕێی پاڵپشتی و بەهاناهاتنی دارای کرد.

دارا پەی بە ڕاستی ئەو زانستە سەربازییە بردبوو، کە دەڵێت: پەرت و دابەشکردنی سوپای دوشمن بەسەر چەند بەرەیەکدا، تێکشکاندنی ئەو سوپایە لەجەنگدا ئاسانتر دەبێت، بەوپێیەی کە دارا سەرکردەیەکی سەربازی بە ئەزموون بوو لە جەنگی ستراتیجیدا، بۆیە پەنای بۆ ئەو تاکتیکە برد.

ماوەیەک بەر لە هەڵگیرساندنی ئەم شۆڕش و ڕاپەڕینە، دارا هەشتاسپ (ویستاسپ – hyestaspes)ی باوکی بە فەرمانڕەوای هەرێمی بارسیا لە ڕۆژهەلاتی میدیا دامەزراندبوو، بۆیە سرووشتییە لەوێ بەرەیەکی دیکەی جەنگی کردبێتەوە. لە ئازاری ساڵی (٥٢١ پ.ز) چنگاوشی شۆڕشگێڕە میدییەکان بووەوە. لەم بارەوە دیاکۆنۆف دەڵێت: "**فراوورت ناچار کرا لە دوو بەرەدا بجەنگێت**"[١٧٠].

لە مانگی نیسانی (٥٢١ پ.ز)، دارا جەنگی بابلییەکانی لە بەرژەوەندی خۆی یەکلا کردەوە، کۆنترۆڵی دۆخەکەی کرد. ئینجا ڕووی سوپاکەی بەرەو وڵاتی میدیا وەرچەرخاند و لەهەمان کاتدا بەشێک لەو سوپا تایبەتەی کە لە فارس و میدییەکان پێک هاتبوو بەرەو ڕووی وەهەیزدانە و سوپاکەی لە باکتریا ئاراستە کرد و لە دەوروبەری مانگی شوباتی ساڵی (٥٢١ پ.ز) فەرماندەی سوپای وەهەیزدانەی بە دیل گرت و لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا وەهەیزدانە خۆی بەدەستەوە دا. ئیتر ڕێگە لەبەردەم دارا خۆش بوو تا

---

(١٦٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٩.

(١٧٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هێزێکی زەبروەشێن ئاراستەی هێزەکەی فراوورت لە (کوندورو- kunduru)ی سەرو وڵاتی میدیا بکات[171].

بەم شێوەیە فراوورت لە دوو لاوە تەنگی پێ هەڵچنرا. سوپای دارا لە ڕۆژئاواو سوپای هیشتاسپ لە ڕۆژهەڵاتەوە. دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لەم جەنگانەدا فروورتیس تێکشکاو لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە سوارەکانیدا بەرەو ئەولای سنووری وڵاتەکەی -میدیا- بۆ ڕەغە (ڕەی) پاشەکشەی کرد. ئەو بۆ یارمەتیدانی، هیوایەکی زۆری بە هیرکانیا و بارت هەبوو"[172].**

تا حوزەیرانی ساڵی (٥٢١ پ.ز) دارا نەیتوانی ئاگری شۆڕشی میدییەکان دابمرکێنێتەوە. بۆ ڕێگرتن لەو یارمەتییانەی کە دەکرا، لە وڵاتی ئەرمەنستانەوە، بگاتە میدییەکان و دواییش کۆتاییهێنان بە شۆڕش، لە قوڵی ئەرمەنستانەوە هەردوو سەرکردە (وافومیسارا)و (دادرشیش) لە جەنگدابوون، بەڵام شۆڕش هەر بەردەوام بوو، بۆ پاڵپشتی هێزەکانی لە بەرەی شەڕدا، دارا بەناچاری سوپایەکی بەهێزی تری پێکەوەناو ڕووی لە وڵاتی میدیا کرد. ئەو دەیزانی پەنابردنی فراوورت بۆ بارتیاو هیرکانیاو مانەوەی لەوێ واتای بەردەوامی شۆڕش دەگەیەنێت، بۆیە بڕیاری دا سەرکردەکانی شۆڕش لەناو بەرێت، بۆ ئەو مەبەستەش تیپێکی سەربازی تایبەتی ڕەوانەی ئەوێ کرد.

دیاکۆنۆف دەڵێت: **"ئەو تیپە جەنگاوەرەی کە داریوش بۆ ڕەغەی نارد، توانی لەکۆتایی مانگی ژوئین[173]، فراوورت بە دیل بگرێت، پاشان داریوشی یەکەم تیپێکی ڕەوانەی ڕەغە (ڕەی) کرد تا یارمەتی - هشتاسپ - ی باوکی بدات و لە جەنگی (باتی کیان) لە خاکی بارت و لە ڕۆژی ١٢ ی ژوئیە[174]ی**

---

(١٧١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٧٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٠. ئاسەواری شاری (ڕەی)، دەکەوێتە نزیک تارانی پایتەختی ئێرانەوە. زۆرێک لە ناوداران بەناوی ئەم شارەوە ناسراوان، نموونە: الرازی پزیشک، الرازی خودان لێکدانەوەی قورئان. نێزیکایەتییەک لەنێوان (ڕغەو) وشەی (Raike)ی کوردیدا هەیە، کە واتاکەی (ڕێگە) دەگەیەنێت. دەبێت ئەوەشمان لەبیربێت، کە (ڕەی) دووڕێیانی پێکگەشتنی ئەو کاروانانە بووە، کە لە باکوری وڵاتی ئاریانا (میدیای کۆن)ەوە، دەهاتن.

(١٧٣) ئەشێ مانگی حوزەیران یان پاش ئەو بێت.

(١٧٤) نازانین مەبەستی لە کام مانگە، بەڵام بێگومان پاش حوزەیرانە.

**سالی (٥٢١ پ.ز) ئەم تیپە هاوپەیمان و یاریدەرانەی، فراوورتی بە یەکجاری تێکشکاند"**[١٧٥].

دیاکۆنۆف پتری لەسەر دەڕوات و دەڵێت: "**فراوورتیش ماوەیەکی زۆر خۆی ڕاگرت، لە دەوروبەری مەملەکەتی داریوش، حەوت مانگ لە غوتاما پتر خۆی ڕاگرت، بەڵام لەکۆتاییدا دۆڕاندی**"[١٧٦].

فراوورت جەنگەکەی دۆڕاند. دەی بابزانین کۆتایی خۆی چۆن بوو؟ لە خوێندنەوەی هەڵکۆڵراوەکانی کێوی بێستوونەوە، کە دارا باس لە شکۆو سەرکەوتنەکانی خۆی دەکات، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت و دەڵێت: "**فراوورتیش یان بۆ هێنام، من لووت و گوێم کرد و زمانیم بڕی و هەردوو چاویم هەڵکۆڵی و لە کۆشکەکەی مندا دەست و قاچیان بەستەوە، تا هەموو هاوولاتییە ئازادەکان ببیبنن، دوایی فەرمانم دا لە ئەکباتانا تیربارانی بکەن و ئەو کەسانەش، کە لەسەرەتادا پشتگیرییان لێ دەکرد، لەناو قەڵاکەدا هەر هەموویانم کوشت**"[١٧٧].

ئەم تۆڵەسەندنەوەو دڵڕەقییە هەمان شێوەی ڕەفتاری فەرمانڕەواکانی ئاشوورەو دارا پێڕەوی کردووە. سزادانی سەرکردەی ڕاپەڕینەکان بەم شێوە وەحشیگەرایە، بۆ تۆقاندن و کۆتکردنی ئیرادەی ئازادیخوازان و ئەو کەسانە بوو، کە ڕووبەڕووی داگیرکەرە زۆردار و ستەمکارەکان دەبوونەوە و هەوڵدانە بۆ دەستەمۆکردنی یەکجاری گەلان. سەرەڕای ئەم گشت زەبر و زەنگ و کوشتنی فراوورت و سەرکردەکانیان، بەڵام میدییەکان نەبەزین و چۆکیان دانەدا. دیاکۆنۆف دەڵێت: "**سەرەڕای ئەوەش شۆڕشی میدییەکان کۆتایی پێ نەهات و خێڵی ساگارتییەکان خۆیان بە دەستەوە نەداو پیاوێکی تری ئەم هۆزە وەک پاشاو بە یەکێک لە نەجیبزادەکانی خێزانی کیاکسار خۆی ناساند. ئەم پاشایە ناوی چیتران تەخمە بوو**"[١٧٨]

---

(١٧٥) دیاکونوف: میدیا، ص٤١٠.

(١٧٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٧٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٧٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بۆ خامۆشکردنی یەکجارەکی ئاگری شۆڕش، دارا پەنای بۆ شێوازێکی دی برد، ئەویش لێدانی شۆڕش بوو لە ناوخۆوە. کورد دەڵێت: ( دار کرمی لە خۆی نەبێت ناکەوێت ).

دارا ویژدانی بڕێ لە نەجیبزادەکانی مادی کڕی (ئەو خانەدانانەی کە لە مێژووی کورددا هەمیشە لەپاڵ شۆڕشەکاندا بوون) و بەڵێنی پلەوپایەو پاداشتی چەورو مفتی دانێ، بە مەرجێک لە تێکشکاندنی شۆڕشەکەی چیتران تەخمەدا هاوکاری بکەن.

ئاشکرایشە کەسە هەلپەرست و خۆپەرستەکان بەرانبەر پلەوپایە و سەروەت و سامان هەر زوو لیکاو بە دەمیاندا شۆڕ دەبێتەوە. لیکاوی دەمی ئەو نەجیبزادانەش زۆر زوو بە لالغاویاندا هاتە خوارەوەو دژ بە گەل و نەتەوەکانیان بەڵێنی پشتگیری داریوشیان دا، نەک هەر ئەوە، بگرە زۆر لەوە شەرمهێنترو خراپتر، یەکێک لەو کەسایەتییە خانەدانانەی کە ناوی (نهما سپادای) بوو سەرکردایەتی سوپای فارسی کردو پەلاماری میدیای داو کۆتایی بە شۆڕش هێنا. هاوزەمان چەتران تەخمە لە شاری هەولێر دەسگیرکراو لە تۆڵەی سەرکردایەتی شۆڕشدا هەر لەوێ تیرباران کرا.

## (١١)

# (هارپاگ)ی میدی و بلیمەتی سەربازیی
## (پاش ساڵی ٥١٥ پ.ز مردووە)

### ڕێنوێنی کیمیاگەرێک

نرخ و بەهای ناسنامە و کەسایەتی خۆت گوم مەکە و بە ڕووی جیهاندا بکرێوە. دوور لە نەرگسییەتی تاکەکەسی و نەتەوەیی بەهای ناسنامە و کەسایەتیت بپارێزە. ئەمەیە ئەو هاوکێشە ورد و گران و گرینگە لە ژیانی تاکەکان و نەتەوەکاندا.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم هاوکێشەیە دەبێت (خود)ی خۆت و (ئەویدی)یش بناسیت و بتوانیت سرووشتی پێوەندیی نێوان (خود)و (ئەویدی) دیاری و دەستنیشان بکەیت. هەروەها لەم بوارەدا پێویستیت بە پێڕەوکردنی ڕێنومایی ئەو کیمیاگەرە دێرینە هەیە، کە بە قوتابییەکەی گوت: **"وەک پێویست وەربگرە، وەک پێویست تێکەڵ بکە، ئەوەت دەست دەکەوێت، کە مەبەستتە".**

بەڵێ، پرسەکە ڕێک ئەوەیە، کە بتوانیت لە هەموو بارودۆخێکدا (وەک پێویست) ساتوسەودایی بکەیت.

لەبەر ڕۆشنایی خوێندنەوەکانم و بەپێی شارەزاییم لە ئەمڕۆدا بۆم دەرکەوتووە، بەدرێژایی مێژووی کۆن و نوێ، کەسایەتییە کوردەکان لە هەڵسوکەوتیاندا نەیانتوانیوە بەپێی پەندی (**وەک پێویست**) مامەڵە بکەن و بۆ بڕێکیان ڕەنگە زاراوەی (**بێگانە پەرست و کاسەلێس**) پڕ پێستیان بێت.

ڕەنگە ئەم دێرە، کە شاعیرێکی کۆنی عارەب خزمێکی خۆی پێ پێناسە کردووە، بۆ بڕێ کەسایەتیی کوردیش گونجاو بێت، کە دەڵێت:

**"کەسی وا هەس، لە سایەی ماندووبوونیدا بێگانە، کورە پاشایە**

**بۆ کەس و خوێش، هەتا دەمرێت دەردو میحنەت و بەڵایە"**

من بەش بەحاڵی خۆم لەناو گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیادا گەلێکم نەناسیوە پیاوەکانی ئەوەندەی پیاوی کورد، بە دڵسۆزییەکی بێ وێنە خزمەتی بەرژەوەندی گەلانی بێگانەی کردبێت و لە بێگانەپەرستیدا زیانی زۆری بە نەتەوەکەی خۆی گەیاندبێت. ئەم دیاردە سەیرو نامۆیە شایەنی لەسەر وەستان و شیکردنەوەیە.

ئێمە لێرەدا باس لە چەند کەسایەتییەکی ناوداری کورد دەکەین، کە ڕۆحی خۆپەرستی زاڵ بووە بەسەریاندا و بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان کوێریانی کردووەو دژ بە گەلەکەیان ڕاوەستاونەتەوەو گەورەترین خزمەتیان بە دوژمن و داگیرکەری گەل و نیشتمان کردووە.

یەکێک لەو کەسایەتییە ناپاکانەش، هارپاگی سەرکردەی میدی بووە. با بزانین ئەم کابرایە چۆن و لە چ بوارێکدا خزمەتی کرد و پێشکێشی بە کێ کردووە؟

## نەخشەی سیاسی ڕۆژئاوای ئاسیا

بە لای خوێنەری ئەم کتێبەوە هارپاگ harpage ی میدی نامۆ نییە. بەرایی گوتمان: هیرۆدۆت، کە باس لە ئەستیاگی میدی دەکات، ناوی هارپاگی بەشێوەی (هارپاجوس-harpagos) هێناوە. ئەودەم گوتمان ڕەنگە ناوی ڕاستەقینەی (ئارپاک- Ar Pak) بووبێت. دەشزانین هارپاگ بەلای گەلی میدییەوە پیاوێکی ناموبارەک بووە، چونکە جڵەوی خۆی دایە دەست قین و تەماح و لەتەک کۆرشی ئەخمینی پیلانی دژ بە دواپاشای میدییەکان گێڕا و

برێ له گەورە سەرکردەکانی میدی بۆ ڕیزی خیانەتکاری ڕاکێشاو بەرئەنجامیش ئەستیاگ، دژ بە کۆرشی نەوە و دوژمنی سەرسەخت، جەنگەکەی دۆڕاند و بەدیل گیرا.

ئیتر کۆرش له دەروازەی ئەگباتانای پایتەختەوە چووە ژوورەوە و مەملەکەتی مادی ڕوخاند و بەسەر وێرانەکەیەوە مەمەلکەتی ئەخمینی فارسی دامەزراند.

زیادەڕۆیی ناکەم ئەگەر بێژم بەدرێژایی مێژوو باوباپیرانی کورد باجی قورس و تاڵی ئەو پیلان و ناپاکییەی هارپاگیان داوەتەوە.

هارپاگ، کەسێکی ئاسایی نەبوو، بگرە ئەو سەرکردەیەکی میدی گەورەو ژیرو وریا بوو. خۆ ئەگەر وانەبووایە، چۆن پێی دەکرا پیلانێکی وا ئاڵۆز دابڕێژێت و ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن بڕوخێنێت؟ بۆیە ئاساییە بەرانبەر ئەو خزمەتە گەورەیە، کۆرش پاداشتێکی گەورەی پلەوپایە و ماڵیی هارپاگی هاوپەیمانی بداتەوە، لەهەمان کاتیشدا بەردەوام سوود له توانا سەربازییەکەی ببینێت و له پێناو پتەوکردنی پایەی دەسەڵاتەکەی و بەرفرەوانکردنی قەڵەمڕەویی و داگیرکردنی نیشتمانی گەل و نەتەوەکانی دیکه و تاڵانوبڕۆ و بەکۆیلەکردنی خەڵکانی ئەو گەلانە، هەوڵ و کۆششی هارپاگ و کەسایەتییە میدییەکانی دی بخاتە خزمەتی خۆیەوە.

بەر لەوەی باس له خزمەتە سەربازییەکانی هارپاگ لەناو سوپای کۆرشدا بکەین، با چاوێ بە بارودۆخی گشتیی هەرێمایەتی ڕۆژاوای ئاسیای بەرله ڕووخانی مەملەکەتی مادو دامەزراندنی دەوڵەتی فارسدا بخشێنین. بەر له ڕووخانی مەملەکەتی ماد له ڕۆژئاوای ئاسیا و له گۆشەی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقادا، چوار هێزی هەرێمایەتی پایەداربوونیان هەبوو، که ئەمانەی لای خوارەوەن:

١- **مەملەکەتی ماد:** دەسەڵاتی ئەم مەملەکەتە له ڕۆژهەڵاتەوە له ئەفغانستانەوە دەستی پێ دەکردو بەرەو ڕۆژئاوا بە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق)ی ناوەندی ئەنادۆڵدا درێژ دەبووەوە و بە ئێرانی ئێستە و کوردستان و بەشێک له باکوری سوریادا تێدەپەڕی. له باکوریشەوە

سەرسنووری قەوقازیاو بەرەو باشوور تا دەگاتە لێوارەکانی بەندەری فارس (عارەب)ی دەگرتەخۆ.

٢- **مەملەکەتی بابل:** لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەو ناوچەیە لە کەنداوی عارەبییەوە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبووەوە و دەگەیشتە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و عیراق (جگە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە) و سوریای مەزن (سوریا، ئوردن، فەلەستین) هەر هەمووی لەژێر قەڵەمڕەوی ئەم مەملەکەتەدا بوو. لەهەمان کاتدا هەڕەشەی لە وڵاتی میسریش دەکرد.

٣- **مەملەکەتی لیدیا:** دەستی بەسەر ڕۆژئاوای ئاسیای بچووکدا گرتبوو، سنووری ئەم مەملەکەتە لە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق) لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو کەنارەکانی دەریای ئیجە و تەنگەی دەردە نیل و بسفۆر لە ڕۆژئاواوە درێژ دەبووەوە.

لیدییەکان گەلێکی دێرینی ڕۆژئاوای ئاسیا بوون. کاتی خۆی بەر پەلاماری سیممیرییەکان (کیممیرییەکان – Cimmerians) کەوتن، ئەم گەلە (سیممیرییەکان) هۆزێکی کۆچەریی ئاریایی سەردەمی پاشای لیدی جیجیس بوون و جیجیس و کوڕەکەی لەتەک نەوەکەیدا، بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەرپەرچیان دانەوە.

ئیلیاتس (ئیلیاتتیس)ی نەوەی جیجیس لە هەرێمەکەدا و لە بەهێزکردنی لیدیادا دەستێکی باڵای هەبوو. ئەم پیاوە حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی مەملەکەتەکەی کرد و بە دەوڵەمەندترین پاشای ئاسیا ناوبانگی دەرکرد.

پاش ئەو، (کروویسوس- Croesus) (قاروون)ی کوڕی جێگەی گرتەوەو لەسەردەمی ئەودا مەملەکەتی لیدیا بە دەوڵەمەندترین و بەهێزترین مەملەکەت دەناسرا. جێکەوتەی مەملەکەتی لیدیا لەڕووی بازرگانییەوە فرەگرینگ بوو، چونکە پردی پێوەندیی نێوان ئەورووپای ڕۆژئاوا بەتایبەتی و ڕۆژهەڵات بەگشتی پێک دەهێنا. ئەم مەملەکەتە یەکەمین دەوڵەتی دنیا بوو، کە دراوی ئاسنی داهێناو (هوتێل)ی بۆ گەشتیارە بازرگانەکان بونیات نا[١٧٩].

---

(١٧٩) هـ .ج .ولز: معالم تاريخ الانسانيه، ٢/٣٤٥-٣٤٧.

٤- **مەملەکەتی میسر:** جێکەوتەی ئەم مەملەکەتە گۆشەی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقایە. ڕاستە لە ڕووی جوگرافییەوە میسر وڵاتێکی ئەفریقاییە، بەڵام چونکە هاوسنووری ئاسیایە، بۆیە فەرمانڕەواکانی گرینگی زۆریان بە پێوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوای ئاسیای سەردەمی کۆن دەدا. ئەودەمە میسر لە کاتی بەهێزیدا پەلاماری ناوچەکانی ئاسیاو بەتایبەتی سوریای مەزن و جارناجارێک ئاسیای بچوکی دەداو لەکاتی لاوازیدا لەلایەن پاشاکانی ڕۆژئاوای ئاسیاوە پەلامار دەدرا، نموونەش (داگیرکردنی سوریای مەزن و ئاسیای بچوک لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ڕەعسیسی دووهەم و پەلاماری ئاشوورییەکان و فارسەکان بۆ سەر میسر بوو). لە زۆرینەی کاتەکاندا میسر هاوپەیمانێتی سیاسی لەگەڵ ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتی زلهێزدا دەبەست، نموونەش (هاوپەیمانێتی میسرییەکان و میتانییەکان لە دژی حوسییەکان بەرچاوە).

## هاوپەیمانێتییە هەرێمایەتییەکان

لە لاپەڕەکانی پێشوودا گوتمان؛ کەیخوسرۆی میدی و نابوپۆلاسەری پاشای کلدانی (بابلی) هاوپەیمانێتییان بەست و بۆ پتەوکردنی ئەم هاوپەیمانێتییەش، نەبوخوزنەسر (بەختنەسر)ی کوڕی نەبوپۆلاسەرو ئامێدی کچی پاشای میدی هاوسەرگیرییان پێکهێناو ساڵی (٦١٢پ.ز) هەردوو هاوپەیمان مەملەکەتی ئاشووری دوژمنی سەرسەختیان تێکشکاندو وڵاتەکەیان برابەش کرد. بەشی باکورو ڕۆژهەڵات بۆ میدییەکان و بەشی باشورو ڕۆژئاوا بەر بابلییەکان کەوت. ئەوەی لەو نێوەندەدا مایەوە گەلی (ئیسکیت – scythians)ی دوشمنی هاوبەشی میدییەکان و بابلییەکان بوو.

ئیسکیت (Scythians) (ئیسکیزەکان/ ئەشقوزییەکان)، گەلێکی کۆچەریی جەنگاوەرو شڕەت و دڕو ژمارە زۆر، کە بە سەردا دادان و تاڵانوبڕۆی گەلانی تری کردبووە پیشە. نیشتمانی ئەم گەلە دەکەوێتە باکوری دەریای ڕەش (ئۆکرانیای ئەمڕۆ و دەوروبەری) و بەنێو ڕووباری دانوب لە ڕۆژئاوا و ڕووباری دوون لە ڕوژهەڵاتەوە شۆڕ دەبێتەوە. ئەو دەمە ئیسکیتەکان

شەڕێکی سەخت و دژواریان لەگەڵ (سیمیرییەکان- Cimmerians) دەسدایەو زاڵبوون بەسەریاندا، بۆیە سیمیرییەکان بەرەو ئاسیای بچوک هەڵهاتن و لە کەنارەکانی ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق)ی ناوەندی باکوری تورکیای ئەمڕۆ گیرسانەوە، بەڵام ئیسکیتەکان لە کۆڵیان نەبوونەوە، بەنیازی تێکشکاندنی یەکجارەکیی هێرشیان کردە سەر.

وڵاتی ئیسکیتەکان دەشتاییەکی گەلێ سارد و هەژار و دوور بوو لەڕێگەی بازرگانییەوە و وا ئێستە خۆیان بەسەر خاکێکی یەکجار بەپیت و کەشوهەوایەکی خۆش و سازگار، کە دەکەوێتە سەر گرینگترین دوو ڕێگەی بازرگانی جیهانی، کە ئەورووپای بە ئاسیاوە دەبەستەوە، بینیوەتەوە. ئەو دوو ڕێگەیەش، ڕێگەی ئاوریشم و ڕێگەی بخوور (مخوور) بوون. بەم بارودۆخی خۆشگوزەرانییەوە دڵیان دانەکەوت و بەرەو قووڵایی پەلاماری ئۆراتۆ (ئەرمەنستان)یان داو بەرەو باشوور ملیان نا، تا گەشتنە ڕۆژهەڵاتی میدیا (ڕۆژهەڵاتی کوردستان) و لەگەڵ میدییەکاندا ڕووبەڕووی شەڕێکی سەخت بوونەوە. بەم پێیەش ئاساییە، کە ئیسکیتەکان لەگەڵ ئاشوورییەکاندا هاوپەیمانی ببەستن، تا کار گەیشتە هاوسەرگیری لەنێوان کچە شازادەکانی ئاشوورو بڕێک لە سەرکردە ئیسکیتەکاندا. ئەمەو لە لاپەڕەکانی بەراییدا باسمان کرد، کە بە سەرکردایەتی کەیخوسرۆ، مادەکان هەڵیانکوتایە سەر مەملەکەتی ئاشوورو ئابڵۆقەی نەینەوای پایتەختیان دا، بەڵام ئیسکیتەکان ئەو هەلەیان قۆستەوەو لەپشتەوە پەلاماری وڵاتی مادیان داو دەستیان بەهەر شوێنێک گەیشت، خاپور و وێرانیان کرد، بەناچاری مادەکان دەسبەرداری شاری نەینەوا بوون و بەپەلە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئیسکیتەکان سوپاکەیان ئاڕاستەکردن. ئاشکرایە، کە ناکۆکی نێوان گەلە میدییەکانی دەراوسێ لە بەرژەوەندی ئاشوورییەکاندا بووەو هەمیشە کاریان لەسەر ئەو ناکۆکی و ململانێیە کردووە. (هـ ج. ولز) لەم بارەیەوە دەڵێت: **"جارجار پاشاکانی دەوڵەتی ئاشوور ئاشوب و ناکۆکییان لەنێوان گەلانی نێزیک بەیەک دەنایەوە، کیمیرییەکان، مادەکان، فارسەکان و ئەسکیزەکان دەدا بە گژ یەکدا"**[180].

(١٨٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢ / ٣٥١.

بەکورتی، ئەودەمە لە ڕۆژئاوای ئاسیادا دوو هێزی دژ بەیەک بوونیان هەبوو:

١. **ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری هەژمونگەر**، لەپاڵیدا وڵاتی میسر، کە لە ساڵی (٦٧٤پ.ز) هەڵیان کوتایە سەری و داگیریان کرد، لەپاڵ ئەواندا گەلی ئەسکیتە شەڕەنگێزو مەملەکەتی لیدیا، بەوپێیەی پاشا جیجیس و دامەزرێنەری خێزانی مرمنادای هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئاشووربانیپاڵ بەستبوو[١٨١].

٢. **مەملەکەتی تازە پێگەشتووی ماد**: لەتەک ئەم مەملەکەتەدا گەلی ئیلام و فارس، کە بەشێک بوون لە مەملەکەتی ماد، هەروەها بابل، کە بەوپێیە هاوپەیمانی مەملەکەتی ماد بوو و هاوشێوەی ئەو. ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور زیانی زۆری پێ گەیاندبوو.

کە لە ساڵی (٦١٢پ.ز) بە دەستی مادو کلدان (بابل)ی هاوپەیمان، ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بەیەکجاری تێکشکاو داڕووخا، هاوسەنگییە هەرێمایەتییەکەی ڕۆژئاوای ئاسیا لارەسەنگ بوو.

مەملەکەتی مادی تازەپێگەشتوو دەستی لە بینی ئەسکیەتەکان گیرکردبوو، ئەوانیش لە هەلێک دەگەڕان تا جارێکی تر پەلاماری ماد بدەنەوە، بۆیە کەیخوسرۆ هەڵیکوتایە سەریان و تێکیشکاندن، بەناچاری بەرەو ڕۆژئاوا هەڵهاتن و پەنایان بۆ مەملەکەتی لیدیای دراوسێی مەملەکەتی ماد برد تا پەنایان بدات.

کەیخوسرۆ داوا لە پاشای لیدیا ئەلیاتس دەکات، تا ئەسکیتەکانیان ڕادەست بکاتەوە، بەڵام لیدییەکان داواکەیان ڕەت کردەوە. ئەمەش کارێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراو بوو، چونکە ناکرێت ئەو هاوپەیمانەی کە هانایان بۆ بردووە ڕادەستی دەوڵەتێکی بەهێزی بکەنەوە، هێزێک دەستی گرتووە بەسەر (ڕێگەی ئاوریشم)دا، ئەو ڕێگەیەی کە بە ناوەڕاستی ئاسیادا تێدەپەڕێت و پێی دەکرێت نەک هەر هەڕەشە لە مەملەکەتی لیدیا بکات، بگرە لە ئاسیاو ئەورووپاشدا ببێتە مەترسی بۆ سەر پرۆژە بازرگانییەکانی.

لە لاپەڕەکانی پێشوودا، ئەوەشمان زانی، کە شەڕێکی شەش ساڵە لەنێوان مەملەکەتی میدیاو لیدیا هەڵگیرسا و پاش خۆرگیرانەکە، بە ناوبژیوانی

---

(١٨١) ویل دیورانت: قصه الحضارة،١٨٤/٢. ولیام لانجز: موسوعه تاریخ العالم، ٨٥/١.

(خوداوەند)و پاشای بابل (نابوبۆلاسەر) کۆتایی پێ هات و هەردوو لای ئاشت کردەوەو پاشان بە هاوسەرگیری **ئەستیاگی** کوڕی کەیخوسرۆ و **ئەرینسی** کچی ئیلیاتسی پاشای لیدیا، ئاشتبوونەوەکە سەری گرت و ڕێکەوتنەکەیان بەهێزتر کرد. پاشان هەر سێ مەملەکەتی (میدیا و بابل و لیدیا) هاوپەیمانێتییەکی سێ قۆڵییان بەست و ئاشتییەکی بەرفرەوان باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا. پاش ئەو گۆڕانکارییە بەرچاوە، جوڵەیەکی بازرگانی چالاک لەنێوان هەرسێ مەملەکەتەکەدا هاتە ئاراوە. لەکاتێکدا ئەم ناوچەیە (ڕۆژئاوای ئاسیا) لەودەمەدا گرینگترین ناوچەی بازرگانی جیهانی بوو، هەربۆیە گەلانی ئەو سێ مەملەکەتە لە سێبەری ئاساییش و ئارامیدا بە خۆشگوزەرانییەوە ژیانیان دەکرد.

**بلیمەتیی هارپاگ لە ڕووی سەربازییەوە**

لەگەڵ دەسگیرکردنی ئەستیاگی زاوای کورویسوس و سەرکەوتنی کۆرشی ئەخمینی و کەوتنی مەملەکەتی ماد و دامەزراندنی مەملەکەتی فارس[١٨٢] هاوسەنگی هەرێمایەتی لە ڕۆژئاوای ئاسیادا تێکچوو. لە بەرانبەر سەرهەڵدانی هێزی تازەی فارسدا، کورویسوس ئەو پاشایەی کە لە سەردەمی ئەودا مەملەکەتی لیدیا لە لووتکەی هێزو شکۆمەندیدا بوو، ترسی لێ نیشت "**بۆیە هەموو ڕێگەیەکی دەگرتە بەر تا ئەم هێزە تازەپێگەشتووەی فارس زیاتر بەهێز نەبێت و باڵا نەکات**"[١٨٣].

کورویسوس لەگەڵ میسرییەکان و لاکیدیمونە ئەغریقییەکان Lacedemoians هاوپەیمانی بەست و لە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق)، کە میدیا لە لیدیا جیا دەکاتەوە پەڕییەوەو پەلاماری وڵاتی میدیای ژێر دەستی ئیمپراتۆرییەتی فارسی دا. لە ناوچەی (پتریا) یاخۆ (پتیریا) سوپاکەی لەگەڵ سوپای کۆرش ڕووبەڕووبوونەوە. هیرۆدۆت دەڵێت: "**شەڕەکە سەخت بوو،**

(١٨٢) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٦٣-٦٤.

(١٨٣) هـ.ج.ولز: تاریخ الانسانیه،٢/٢٥٢.

**خوێنی زۆر ڕژاو ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەران کوژران، تا شەو داهات شەڕ هەر بەردەوام بوو، بەڵام هیچ لایەک سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا"**[184].

کورویسوس هۆی سەرنەکەوتنی بۆ کەمی ژمارەی جەنگاوەران دەگێڕایەوە. دووهەم ڕۆژ کۆرش هێرشی نەکرد. کورویسوس بەرەو ساردیسی پایتەخت لە ڕۆژئاوای وڵات سوپاکەی کشانەوە، بە نیازی کۆکردنەوەی هاوپەیمانەکانی، بەتایبەتی هاوپەیمانە میسرییەکان، کە بەپێی ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ **ئەمادیسی** پاشای میسر بەستبووی، هەروەها بە **نابونید** (نەبونئید)ی پاشای بابل و ئەسپارتەکان لە وڵاتی یۆنان پێوەندیی کردو ئەو سوپایەی کە زۆرینەی جەنگاوەرەکانی کرێگرتە بوون بەرەڵا کرد، بە نیازی بەردەوامیدان بەشەڕ دژ بە فارس بڕیاریان دا لە وەرزی بەهاردا هێزەکەی لەتەک هێزە هاوپەیمانەکاندا یەک بخات، **"بێ ئەوەی بە خەیاڵیدا بێت، کە پاش ئەو شەڕە بێ ئەنجامە ئەشێ کۆرش سەرکێشی بکات و بەرەو ساردیس بکەوێتە ڕێ"**[185].

ئەو دەمە کۆرش بەوردی جموجۆڵەکانی کورویسوسی خستبووە ژێر چاودێرییەوە، چونکە بڕیاری دابوو مەملەکەتی لیدیای هاوپەیمانی میدیا تێکبشکێنێت تا دەستی بگاتە کەنارەکانی دەریای ئیجەو ئیتر لەوێوە بەئاسانی کۆنترۆڵی گشت ڕێگە بازرگانییەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا بکات و لەو ڕێگەیەشەوە پێوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کیشوەری ئەوروپادا ببەستێت، بۆیە زۆر چاوەڕوانی نەکردو نەیهێشت کورویسوس خۆی کۆ بکاتەوە، بەپەلە پەلاماری ساردیسی پایتەختی دا، هیرۆدۆت دەڵێت: **"بەپەلە کەوتەڕێ، تەنانەت خۆی یەکەم کەس بوو، کە بە پاشای لیدیای گوت، ئەوا گەیشتم"**[186].

هێرشی کتوپڕی فارسەکان کورویسی ڕاچەڵەکاند. سەرەڕای ئەوەش زوو خۆی و هێزەکەی کۆکردەوەو نێزیک بە دەشتی ساردیس هەردوو سوپا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە. دیارە جەنگاوەرە لیدییەکان بە ئازایەتی و

---

(١٨٤) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٦٥. بڕوانە: هـ.ج.ولز: معالم تاریخ الانسانیە، ٢/٢٥٢-٢٥٣-٢٥٣ ولیام لانجز، موسوعە تاریخ العالم ٨٦/١.

(١٨٥) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٦٦.

(١٨٦) هەمان سەرچاوەی پیشوو، ل٦٧.

نەترسی ناسرابوون. کاتێک کورش ڕوانی لیدییەکان ڕیزەکانیان ڕێک دەخەن و ئامادەی جەنگن، ئەو دیمەنە هەڵوەستەی پێ کردو ڕای گرت، چونکە شەڕەکانی پێشوو ئەوەی سەلماندبوو، کە زاڵبوون بەسەر سوارچاکەکانی لیدیادا ئاسان نییە.

لەڕاستیدا گرینگی چەکی ئەسپسواری لە جەنگەکانی سەردەمی کۆندا لە چەکی تانک و زرێپۆشی ئەم سەردەمە کەمتر نەبوو، چونکە ئەودەم چەکی سوارەکان شەڕیان یەکلایی دەکردەوەو زۆرجار ئەم چەکە سەرکەوتنی مسۆگەر دەکرد، خۆ ئەگەر ئاشوورییەکان، کە بە ژمارە کەم بوون، ئەم چەکە کاریگەرەیان شک نەبردایە، ئەوا هەرگیز پێیان نەدەکرا ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەی وەک ئەوەی خۆیان ئاوابکەن، چونکە چەکی ئەسپسواری بە تیژڕەوی و هێزو جوڵەی گورج دەناسرا، ئەی ئەگەر ئەم چەکە گرینگە نەبووایە، کە میدییەکان لە ئیسکیتەکان سودیان وەرگرت و ئاشنای بوون و لە شەڕەکاندا بە باشی کەڵکیان لێ وەرگرت، ئایا کەیخوسرۆ دەیتوانی سوپای ئاشوور تێک بشکێنێت؟ کورش بیری لە ڕێگە چارەیەک کردەوە تا بەسەر نەیارە لیدییەکاندا زاڵ بێت لە مەیدانی جەنگدا و سوارچاکەکانی بە چۆکدا بهێنێت، کە باس دەهاتە سەر ئاڵۆزی و تەنگ و چەڵەمەکانی شەڕ، ئەودەمە کورش لەگەڵ فەرماندە سەربازییەکاندا کۆ دەبووەو ڕاوێژی پێ دەکردن، بۆ خۆدەربازکردن لەو تەنگەژە سەربازییە، کە بەدەست سوارەکانی لیدیاوە تێی کەوتبوو پێشنیارەکەی هارپاگی میدی فریای کەوت، پێشنیارەکەی هارپاگ ئەمەبوو؛ "بە نیازی پشووپێدانی وشترە بارهەڵگرەکانی بەرەی جەنگ، بارەکانیان بخەن تا کەمێک دەحەسێنەوە، پاشان هەر جەنگاوەرێک و سواری پشتی وشترێک بێت و بکەونە پێش سوپاوەو ڕووبەڕووی ئەسپسوارەکانی لیدیا ببنەوەو پیادەکانیان بەدوادا برۆن و بەدوای ئەوانیشدا سوارە جەنگاوەرەکان بکەونە ڕێ، هیرۆدۆت دەڵێت: **"بەڵام هۆی چی بوو، کە کورش وشترەکانی ڕووبەڕووی ئەسپسوارە لیدییەکان کردەوە؟ چونکە ئەسپ لە جەستەی ناقۆڵا و نامۆ و بۆگەنیی دەمی وشتر سڵی دەکردەوە و لەبەری**

**هەڵدەمات و ئەم ترساندنەشی قۆستەوە تا سوارەکانی لە مەیدانی جەنگ دوور بخاتەوەو سەرکەوتن مسۆگەر بکات**[187].

پێشنیارەکەی هارپاگ جێبەجێ کراو سەری گرت. بۆنی ناخۆش و ترس لە حوشتر، ڕەوە ئەسپی لە بەرەی جەنگ ڕەواندەوە و پاشەوپاش کشایەوە. بۆیە سوارەی لیدییەکان ناچار بوون وەک جەنگاوەری پیادە ڕووبەڕووی سوپای فارس ببنەوە. سوپایەک، کە چەکی سوارەی میدییەکان هێشتا وەک هێزو چەکی یەکلاکەرەوە بەرچاو بوو، سەربازەکانی لیدیای ڕاودەنا و تێکیشکاندن.

سەربازە هەڵاتووەکانی سوپای لیدیا پاشەکشەیان کردو خۆیان لەپشت دیوارەکانی ساردیسی پایتەختەوە حەشاردا، پاش چواردە ڕۆژ ئابڵۆقە، شاری ساردیس خۆی بەدەستەوە داو کوریسویسی پاشای لیدیا بە دیل گیرا و ساڵی (٥٤٧پ.ز) کۆرش بوو بە یەکەم گەورە دەسەڵاتداری ڕۆژئاوای ئاسیا.

### دوا جەنگەکانی هارپاگ

ڕووداوەکانی دوای ڕووخانی مەملەکەتی لیدیا، پیمان دەڵێت، کە کۆرش بە بلیمەتیی هارپاگ سەرسام بووە، هیچ گومانیشی لە دڵسۆزی ئەم فەرماندە لە خزمەتکردنی پاشاو مەملەکەتی فارس نەبووە، بۆیە پاش ئەو جەنگە کارو ئەرکی سەربازی وای بە هارپاگ سپاردووە، کە هاوشێوەی ئەرکە سەربازییەکانی خۆی بووە، پاش دەستبەسەرداگرتنی ساردیسی پایتەختی لید، کۆرش بڕیار دەدا، درێژە بە داگیرکارییەکەی بدات. بۆیە بە نیازی گەیشتن بە کەنارەکانی دەریای ئیجەو دەریای ڕەش و تەنگەی بسفۆر لە باکور، ڕوو دەکاتە ڕۆژهەڵاتی نزیک (ڕۆژئاوای ئەمڕۆی تورکیا). ئەرکی داگیرکردنی بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی نزیک بە هارپاگ سپاردو خۆیشی دەستی بەسەر هەرێمەکانی باکوردا گرت[188].

---

(١٨٧) هەمان سەرچاوە، ل٦٨.

(١٨٨) هەمان سەرچاوە، ل١١٣-١١٤.

هارپاگ ئەرکەکانی سەرشانی زۆر بە ڕێکوپێکی ڕادەپەڕاند. (مازاریس)ی میدی فەرماندەی باڵا مردو بۆ تەواوکردنی کارەکانی لە باشووری ئاسیای بچووک، هارپاگ جێگەی گرتەوە. هیرۆدۆت دەڵێت: " **کە بوو بە فەرماندەی سوپا، بەرەو ئەیونیا ملی ناو شارەکانی یەک لەدوای یەک داگیر کرد. سەرەتا ئابلۆقەی جەنگاوەرەکانی ناو شورەی شاری دەداو لە دەرەوە بە خۆڵ گردی توورەکەڕێژی دروست دەکردو جەنگاوەرەکانی سەردەخست، بەم شێوە بەسەر شاردا زاڵ دەبوو**"[189].

ئینجا هارپاگ بەرەو شاری فوکای ئەغریقی ملی نا، ئەو شارەی کە بە شورەی قایم و پتەو دەورە درابوو. هیرۆدۆت دەڵێت: "**ئەم فەرماندەیە ئابلۆقەی شارەکەی داو داوای لە خەڵکەکەی کرد، کە یەک تاوەر لە تاوەرەکانی شارو بەشێک لە بەربەستەکەی بروخێنن تا ئابلۆقەیان لەسەر هەڵبگرێت و زیانی زیاتر نەکەن و نەبن بە کۆیلە. خەڵکی شار داوای یەک ڕۆژ مۆڵەتیان کرد، تا بیری لێ بکەنەوە، بە مەرجێک هارپاگ سوپاکەی بە مەودایەکی باش بکشێنێتەوە. هارپاگ لە نیازیان گەیشتبوو، بەڵام مەرجەکەی قبووڵ کردن، کە سوپای فارس کشایەوە، فوکییەکان ماڵ و منداڵیان لە پاپۆڕەکان بارکردو بەرەو خیوس هەڵهاتن، ئا بەم شێوەیە فارسەکان چوونە ناو شارێکی چۆڵ و هۆڵەوە**"[190].

پاش داگیرکردنی شاری فوکای ئەغریقی، هارپاگ سەرجەم شارەکانی تری ئەیونیای داگیر کردو پەلاماری شاری تیوس Teosی دا (شارێکی سەر کەناری دەریای ئیجەیە). هارپاگ بەهەمان ڕێگە و تاکتیکی شەڕی پیشوو دروستکردنی گردی توورەکەڕێژ و خەڵکی شاریش، بەهەمان ڕێگەی خەلکی فوکای، بە پاپۆڕ هەڵهاتن.

ئەیونییەکان مەردانە بەرگرییان لە شارەکەیان دەکرد، بەڵام لەکۆتاییدا نەیانتوانی خۆیان لەبەردەم شاڵاوی سوپای فارس و هارپاگدا ڕابگرن، بۆیە سەرتاپای

---

(١٨٩) هەمان سەرچاوە، ل١٠٦.

(١٩٠) هەمان سەرچاوە، ل١٠٧.

وڵاتەکەیان کەوتە بەردەستی فارسەکان. تەنانەت دورگەنشینەکانیش پاش داگیرکردنی شارو وشکانییەکان، ترس بەسەریاندا زاڵ بوو و خۆیان بە دەستەوە دا[191].

پاش دەست و پێ بەستنی سەرتاپای وڵاتی ئەیونیا، هارپاگ پەلاماری کارینەکان (نەتەوەکەی هیرۆدۆت)و کاونییەکان و لیسییەکانی باشوری دا. دیارە سوپاکەی هارپاگ تێکەڵەیەک بوو لە خەڵکی وڵاتە داگیرکراوەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچوک، لەوێ گەلی کاریی خۆی بەدەستەوەدا و گریکییەکان هێزی بەرگرییان لەدەست داو پاشان گەلی (کندیان)ی نیشتەجێی ئەو ناوچەیەش خۆیان ڕادەست کرد. دوا هەنگاو لەم شاڵاوەدا دەشتاییەکانی (زانتۆس) بوو، چەند شەڕێکی دژ بە لیسییەکانی ئەو دەشتە هەڵگیرساند، هیرۆدۆت یەژێت: **"ژمارەی سوپاکەی لە هی ئەوان زۆرتر بوو، سەرەرای ئەوەش لە شەڕەکاندا ئازایەتییەکی کەم وێنەیان نیشان دا، پاش شەڕێکی درێژ دۆڕاندیان و هەڵهاتن، بۆیە هارپاجوس فشاری خستەسەریان و ناچاری کردن بکشێنەوە بۆ پشت دیوارەکان، لەوێ هەرچی ماڵ و ژن و منداڵ و کۆیلەیان هەبوو لە قەڵاکەدا هەموویان کۆکردنەوە، ئاگریان تێ بەردان و لە چاوتروکانێکدا هەر هەموویان کوڵوکۆیان دامرکایەوە، پاشان پیاوەکانیان سوێندیان خوارد تا سەرکەوتن یان نەمان بجەنگن، ئەوە بوو لەپڕێکدا دەرکەوتن و ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە. لەکۆتاییدا گۆڕەپانەکە بوو بە کوشتارگەو هەر هەموو لەوێ تیاچوون و قڕیان تێکەوت، تەنانەت یەک کەسیان لێ ڕزگار نەبوو"**[192].

## خزمەتکردن تا کۆتایی

وا دەردەکەوێت ماوەی خزمەتکردنی هارپاگ لەناو ئیمپراتۆرییەتی فارسدا درێژەی کێشاوەو لای دەسەڵاتدارە ئەخمینییەکان فرە جێگەی باوەڕ بووە، تەنانەت لە دەمی کودەتاکەی دوو برا موغە میدییەکە، پیرتزیس (باتیزیتیس)و سەمیردیس (گۆماتا) لە کۆتایی فەرمانڕەوایی کەمبیز، لە ساڵی (٥٢٢ پ.ز)، تەنانەت پاش بزوتنەوە تۆڵەسێنەکەی ئەخمینییەکان، هارپاگ نە باوەڕ و نە

(١٩١) هەمان سەرچاوە، ل١٠٩.

(١٩٢) هەمان سەرچاوە، ل١١٣.

پلەوپایەکەی خۆی لەدەست نەدا، تەنیا هۆی سەرەکی ئەم نەدورانەش نواندنی دڵسۆزیی بێ وێنەی خۆی بووە لە ئاست گەورەکانیدا. ئەمەو دژایەتیکردنی هەمیشەیی یاخیبووە میدییەکانی هاوخوێن و هاونیشتمانی خۆی، وەک پیاوێکی وریاو ڕق لەدڵی دژ بەنەتەوە و مەملەکەتی میدیا، فاکتەرێکی تری مانەوەی بووە.

تا سەرەتای دەسەڵاتی پاشای فارس، دارا (داریوش)ی سییەم، هارپاگ لەناو تیمی سەرکردایەتی سەربازیی فارسدا مایەوە. پاش دامرکانەوەی شەرە یەک لەدوای یەکەکانی دژ بە ئیمپراتۆرییەتی فارس و پاش داگیرکردنی بابل، دارا بڕیاری دا وڵاتی ئیسکیتەکان داگیر بکات **"بە نامەبەرەکانیدا فەرمانی پاشایەتیی بۆ گشت وڵاتە ژێردەستەکانی ناردو تیادا داوای کردبوو، هەندێکیان بەسەربازو بڕێکیان بە پاپۆڕ کۆمەکی سوپای ئیمپراتۆرییەت بکەن و داوای لە بڕێکی تریان کردبوو بۆ دەروستکردنی پرد بەسەر تەنگەی بسفۆرەوە کرێکاریان بۆ بنێرن"**[193].

لەو پەلامارە سەربازییەدا ناوی هارپاگ ناکەوێتە بەرچاو. دوور نییە لەودەمەدا دارا ئەرکی پاراستنی ئارامی و سەقامگیری وڵاتی لیدیاو ناوچەکانی دەوروبەری پێ سپاردبێت، چونکە ناوچەی ئاسیای بچوک، گرینگی تایبەتی خۆی هەبوو و لەدەستدانی ئەو ناوچەیە واتە ئابلۆقەدانی داراو سوپاکەی لەلایەن ئیسکیتەکانی باکورو ئەغریقە شۆڕشگێڕەکانی باشورو گرتن و بڕینی ڕێگەی گەڕانەوەیەتی بۆ وڵاتی فارس.

ئەو هۆیەی کەوای لێ کردین تا بڵێین: هارپاگ بەشداری ئەو شاڵاوە سەربازییەی نەکردووە، کە بۆ دامرکانەوەی شۆڕشەکانی گریکەکان لە ئاسیای بچووک، فارسەکان دەستیان دابوویە، ئەوەیە کە فەرماندەیەک بە ناوی **هستیایوسی** ملّتی (میلیسی) سەرکردایەتی ئەو هەڵمەتە سەربازییەی کردووەو هەر ئەم فەرماندەیە بوو، کە بە شاڵاو بردنەسەر وڵاتی ئیسکیتەکان خزمەتێکی گەورەی دارای کردبوو، بەتایبەتی لە کاتی شکستە سەربازییەکەی سوپای

---

(١٩٣) هەمان سەرچاوە، ل٣٢٥.

فارسداو پاشەکشەکردنی بۆ ئاسیای بچووک، ئەودەم دارا، هیستیاوسی وەک نیمچە دەسبەسەرێک لەتەک خۆیدا بۆ (سوسا)ی پایتەخت هێنایەوە.

بەلام هسیتایوس بە مانەوەی لە ڕیزی سوپای ئیمپراتۆرییەتی فارسدا، دلخۆش نەبوو، بۆیە نامەیەکی نهێنی بۆ برێ لە فەرماندە ئەغریقییەکان ناردو داوای هەلگیرساندنی شۆڕشی لێ کردن. پاشان دارای ڕازی کرد، کە تەنیا کەسێک بتوانێت ئەو شۆڕشە دابمرکێنێتەوە، ئەوەو بەس. بۆیە دارا بە داواکەی قایل بوو، ئەو ئەرکەی بە هستیایوس سپارد، بەلام کە گەشتە ولاتی ئەغریق لە دارا هەلگەڕایەوەو دژی فارس دەستی دایە شۆڕش.

ئەودەم هارپاگ پلەیەکی بالای وای هەبوو شانبەشانی ئەرتفرنیسی فەرمانڕەوای ساردیس و زڕبرای دارا حسابی بۆ دەکرا، هەر لەودەمەدا هستیایوس لە ناوچەی کیکوسی میسیی (لەسەر دەریای ئیجە) سوپاکەی خۆی مۆل دابوو، هیرۆدۆت یەژێت: "**بەڕێکەوت هارپاجۆسی فەرماندەی فارس بە سوپایەکی گەورەوە لەهەمان ناوچەدا ئامادە بوو و سوپاکەی لەگەل هێزە ئەغریقییەکە بە سەرکردایەتی هستیایوس، ڕووبەڕووبوویەوە و لە مالینای سەر بە ئەتانیوس شەڕ هەلگیرسا، بۆ ماوەیەکی زۆر شەڕ درێژەی کێشاو لەو شەڕەدا هەردوو سوپا هاوسەنگ بوون، بەلام هێزی سوارەی فارسەکان گەشتە شەرگە، کە ئیتر شەڕ لە بەرژەوەندی فارسدا شکایەوەو ئەغریقییەکان دۆڕاندیان. زۆرینەی جەنگاوەرەکانیان کوژران و ئەوەی مایەوە هەلهات، بەلام هستیایوس لەو بڕوایەدا نەبوو داریوش بیکوژێت، بۆیە بۆ دواجار هەولی خۆ ڕزگارکردنی دا، لەو کاتەدا، کە بە نیازی هەلهاتن بوو، پیاوێک لە فارسەکان کەوتە دوای و لەوەدا بوو تیرێکی تێ بگرێت، هاواری کردو وتی: من هستیایوسی ملتیم**"[194]

هستیایوس دیل کرا. هیرۆدۆت وای بۆ دەچێت، کە دارا لێی خۆش دەبوو. ئەو دەلێت: "**بەلام لەڕاستیدا ئەرتفرنیس مرزبان**[195]، **ساردیس و هارپاجوسی فەرمانڕەوا دەسگیریان کردو بڕیاریان دا بیکوژن تا جارێکی دی لە کۆشکی**

(١٩٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٩.

(١٩٥) زاراوەیەکی ئیداری ئاریانی کۆنە، واتا: (فەرمانڕەوای هەرێم).

داریوس پلەوپایەی خۆی بەدەس نەهێنێتەوە، بۆیە بە تەور کوشتیان و ئینجا سەریان لە لاشەی جیاکردەوە و مۆمیایان کرد و کەللەسەرەکەیان بۆ داریوش، لە سوسا، ناردەوە"[١٩٦].

سەرکەوتنە سەربازییەکانی هارپاگ لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا، بەڵگەی بلیمەتیی هارپاگ لەڕووی سەربازییەوە دەسەلمێنێت. بەرچاوترین لایەنی بلیمەتی ئەم فەرماندەیە، داهێنان و دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیانە بوو، کە هێزی بەرانبەری تێک دەشکاندو هاوکێشەکەی لە گۆڕەپانی جەنگدا سفر دەکردەوە. داهێنانە بەرچاو و کاریگەرەکەشی لە پووچەڵکردنەوەی کاریگەریی و تێکشکاندنی هێزی سوارەی دوشمنداو دروستکردنی گردی خۆڵ (توورەکەڕێژ) بەرانبەر بە قەڵای دوژمن و پووچەڵکردنەوەی کاریگەریی قەڵاو شورەکانی بوو.

پاش ئەو گشت سەرکەوتنانەی لە جەنگەکانی ئەوپەڕی باشوری ڕۆژئاوای ئاسیا، ئیتر ناو و دەنگوباسی هارپاگ بەرگوێ ناکەوێت. دیاکۆنۆف دەڵێت: گوایە هارپاگ پاش داگیرکردنی ئەیونیا (ڕۆژئاوای ئاسیا) ئارەزووی گەڕانەوەی نەبووە بۆ وڵاتی میدیا و لە ئاسیای بچووک دەستی گرتووە بەسەر موڵک و زەوی و زارێکی زۆرو زەوەنداو لەوێ بەیەکجاریی نیشتەجێ بووە.

لە چەند کتێبێکدا، کە بەزمانی لیکی و یۆنانی نووسراون، ناوی یەکێک لە نەوەکانی بەرچاو کەوتووە[١٩٧].

بە لەبەرچاوگرتنی ساڵی هاتنەسەر تەختی پاشایەتی لە ساڵی (٥٢٢ پ.ز) دارا سێ یا چوار ساڵ بە دامرکاندنەوەی شۆڕشی بابلەوە خەریک بووەو وڵاتی ئیسکیتی داگیر کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ سوسا، وا دەردەکەوێت هارپاگ لەدوای ساڵی (٥١٥ پ.ز) مردووە.

---

(١٩٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٩

(١٩٧) دیاکونوف: میدیا، ل٣٩٧.

# (١٢)

## (داتیس)ی میدی

## فەرماندەی جەنگی ماراتۆن

**(دوای ساڵی ٤٩٠ پ.ز مردووە)**

کێبڕکێی ماراتون! ئایا کەسێک هەیە گرینگی بە وەرزش بدات و ناوی ئەم کێبڕکێیەی نەبیستبێت؟ ئەشێ بڕێ لە هەوادارانی وەرزش بزانن، مێژووی ئەم کێبڕکێیە دەگەڕێتەوە بۆ نێزیکەی (٢٥٠٠) ساڵ بەر لەئەمڕۆ، کە ڕێکەوتی ساڵی (٤٩٠پ.ز) دەکات و پێوەندیی بە یەکێک لە گەورەترین شەڕەکانی ئاسیاو ئەورووپای نێوان فارس و ئەغریقەوە هەیە. ئەم شەڕە لە دەشتی (ماراتون)ی (٤٠ )کم نێزیک لە ئەسینا ڕووی داوەو فەرماندەی سوپاکەی فارس لەو شەڕەدا، گەورە فەرماندەیەکی میدی، بەناوی (داتیسی میدی) بووە.

با کەمێ باس لە داتیس و شەڕی ماراتون بکەین.

یاخۆ با بزانین شەڕی ماراتون بۆچی ڕووی دا؟

## دروستکردنی ئیمپراتۆرییەت

بۆ زانینی هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی ماراتۆن و نموونەی ئەم شەڕە یەکلاکەرەوەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بەگشتی و لە مێژووی ئاسیا و ئەوروپا بەتایبەتی، دەبێت پێشەکی قسە لەسەر (ئیمپراتورییەت)و چۆنییەتی سەرهەڵدانی بکەین.

وا دیارە هەموو ئیمپراتۆرییەتەکان لەسەر چوار کۆڵەکە دادەمەزرێت:

١- **سەرکردەیەکی ئارەزوومەندی گەردوونی**، خاوەن کەسایەتییەکی کاریزمایی میکاڤیلی (پراگماتی)یەو کەسێکی ژیرو وریاو خاوەن ویست و بەتوانایە، بەوردی بارودۆخی گەل و کەشوهەوای سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەرێمایەتیی جیهان بەوردی و دروست دەخوێنێتەوە و پیاوی شیاو لە شوێنی شیاودا دادەنێت و بڕیاری گونجاو لەکاتی گونجاودا وەردەگرێت.

ئەو چاوی لەسەر ئامانجەو بۆ پێگەشتن بە ئەو ئامانجە دەکۆشێت و لەگشت بارێکدا گوێ ناداتە ژمارەی بریندار و کوژراوەکانی هیچ لایەک، نە لای خۆی و نە لای دوژمنەکەی.

٢- **گەلێکی کەللەڕەق و سەرکێش**، کە بۆچوون و دیدگەی سەرکردەکەی تێرو پاراو دەکات و بیروباوەڕە داگیرکارییەکەی بەهێزتر دەکات. ئەم گەلە باوەڕی بە ئامانجی داگیرکاری سەرکردەکەی هەیەو بێ دوودڵی سەر بۆ پرۆژەکە دەلەقێنێ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبێت و بە سەروماڵ لە خزمەتیدا دەبێت.

٣- **سوپایەکی جەنگاوەر و خاوەن دسپلین و کارامە و بەئەزموون و دڕ**، پڕچەک بە هەموو تفاقی جەنگیی کوشندە. سوپایەکی گوێڕایەڵ، کە کوێرانە فەرمانەکانی سەرکردە جێبەجێ دەکات و بەبێ گوێدانە هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتی و دوور لە ویژدان؛ دەبڕێت و دەکوژێت و خوێن دەڕێژێت.

٤- سەروەت و سامانی پێویست، داهاتی پێویست بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە داگیرکارییەکەی سەرۆک فەراهەم بکات و لەتوانایدا بێت بەئاسانی موچەی جەنگاوەران و پارەی کڕینی چەک و جبەخانەی کوشندەی پێ دابین بکات.

سەرەڕای ئەمانە بە تەنیا بوونی سەرکردەی بلیمەت و کاریزما بەس نییە بۆ دروستکردنی ئیمپراتۆرییەت، بگرە فاکتەری زۆر گرینگی دیکەیش پێویستە، ئەو فاکتەرانەش (ڕووبەڕووبوونەوەو وەڵامدانەوە)، هەروەک چۆن مێژوونووسی بەریتانی (ئەرنۆڵد توینبی) لە پێداچوونەوەی مێژووی ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی دونیای کۆندا فاکتەری ڕووبەڕووبوونەوەو وەڵامدانەوەی لەپێشەوەی هۆکارەکانی دیکەوە داناوە، کە لە دەسپێکی سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرییەتدا پێویستە. لەوانە ڕووبەڕووبوونەوەی هەژاری وڵات و بێ پیتی خاک و کەمی سەرچاوەی ژیان، یاخۆ دەستبەسەرداگرتنی وڵات لەلایەن هێزێکی هەژموونگەرای ستەمکار، یان هەردوو فاکتەر لەیەک کاتدا پێکەوە بوونیان هەبێت.

خۆزگە خوێنەر لە بارودۆخی کاتی سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکان و تازەکانی ئەکەدی، بابلی، ئاشووری، میدیی، فارسی، مەکەدۆنی، ڕۆمانی، عارەبی، مەغۆلی، عوسمانی، ڕووسی و بەریتانی بڕوانیایە. من لەو باوەڕەدام فاکتەری (ڕووبەڕووبوونەوەو وەڵامدانەوە)ی وەک بەرچاوترین و کاریگەرترین فاکتەر لە دەمی نەشونماکردنی ئیمپراتۆرییەتەکاندا بەرچاو دەکەوت.

## جوگرافیای فارس

بابەتی سەرەکیمان لێرە، ئاواکردنی ئیمپراتۆرییەتی ئەخمینی فارسییە. لەم سۆنگەوە هەر نووسەرێک باسی لە نیشتمانی یەکەمی گەلی فارس لە باشوری وڵاتی فارس (باشوری ڕۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆ) کردبێت، گوتویەتی، کە بەشێکی گەورەی نیشتمانەکەیان دەشتاییەکی بێ پیت و لەڕووی سەرچاوەی ژیانەوە هەژار بووە، گەلی فارس لەو دەمەدا کۆچەری بوون و مەمرە و مەژی ژیانیان گوزەراندووە. ئەوەتا هیرۆدۆت لەم بوارەدا باس لە پلانەکەی پاشای لیدی کوریسوس دەکات، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیری لە

هێرشکردنەسەر ئیمپراتۆرییەتی ئەخمینی کردووەتەوە، هیرۆدۆت دەڵێت: **"کاتێ کورویسوس بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر فارسەکان، ساندانیس یەکێک لە داناکانی لیدیا نەسیحەتی دەکات و پەژێت: ئەی پاشا دەبینم خۆت ئامادە دەکەیت هێرش بکەیتە سەر گەلێک نەک هەر شەرواڵی پێست دەپۆشن، بگرە سەرتاپا پێستپۆشن. ئەوان بە ئارەزووی خۆیان ناخۆن، بگرە لەسەر زەوییەکی بێ پیت دەژین. ئەوان لەبری شەراب ئاو دەخۆنەوە. ئەوان نە هەنجیرو نە هیچ لە میوە خۆش و بەتامەکان ناخۆن. دەی باشە، کە تۆ باری نالەباریانت زانی ئێستە لەحاڵ و ماڵیان ئاگەداریت، گەر چوویت و زاڵ بوویت بەسەریاندا چیت پێ دەبڕێت؟ خۆ ئەگەر ئەوان تۆیان بۆرداو شکستیان پێ هێنایت دەزانیت زیانێکی گەورە دەکەیت! ئەو دەمەی زاڵ دەبن و تام و لەزەتی ژیان دەچێژن و مەچەکمان با دەدەن، ئیتر لە کۆڵمان نابنەوە، ئەگەر تۆ لە من دەپرسیت و ڕام وەردەگریت، من سوپاسگوزاری خواوەندم، چونکە هانی فارسەکانی نەداوە بۆ داگیرکردنی لیدیا"**[198].

هیرۆدۆت پێ لەسەر هەژاری و نالەباری ژیانی فارس دادەگرێت و لەهەمان کاتدا باس لە خێروبەرەکەت و خۆشگوزەرانی و سەرچاوەی دەوڵەمەندی نیشتمان و گەلی میدییەکان دەکات و دەڵێت: **"لەڕاستیدا فارسەکان بەرلە داگیرکردنی وڵاتی ماد، واتای خۆشگوزەرانیان نەدەزانی و تامی خۆشی ژیانیان نەکردبوو"**[199].

لەمەڕ هەمان پرس (هارڤی بۆرتەر) دەڵێت: **"وڵاتی فارس بۆ داگیرکەرانی تەنگەبەرە، ڕووبەرەکەی بەحاڵ دەگاتە (١٠٠٠٠٠) میل چوارگۆشە، لە باکورەوە مادو لە ڕۆژهەڵاتەوە بیابانێکی شۆرەکات و لە باشورەوە کەنداوی عەجەم[200]، لە ڕۆژئاواوە هەمان کەنداو و سوسیانا، ئەمەو نیوەی وڵاتەکەیان بیابانەو بۆ هیچ ناشێ، ئەوەی دەمێنێتەوە خاک و خۆڵی نێو چیاکانە، جگە لە گوندەکانی سەر دەریا، وڵاتێکی تەنگەبەرو یەکجار گەرمەسێرەو بڕێکی بۆ**

---

(١٩٨) هیرودوت، تاریخ هیرودوت، ل٦٢.

(١٩٩) هـ ج .ولز: معالم تاریخ الانسانیه، ٣٥٣/٢.

(٢٠٠) کەنداوی فارس (عارەب).

**کشتوکاڵ دەشێت، بەڵام زەوییە چیاییەکان هەرچۆن باسمان کرد وەک زەوی ماد وایە، دۆڵەکانی ڕووباری گچکەی پیادا تێ دەپەڕێت و زەوی و زارەکەی بە پیتەو چەند دەریاچەیەکی بچووکی شۆری تیادایە"[٢٠١].**

کەواسا هەژاریی وڵاتی فارس لەڕووی سەرچاوەی ژیان و بندەستەییان لەژێر ڕکێفی مادەکانی دراوسێداو کۆڵەمەرگی و سک گوشین، فاکتەرگەلێک بوون ئامادەی کردن تا لە گەلێکی ستەمدیدەو خاو و خلیچکو ڕاڕاوە، بگۆڕێن بۆ گەلێکی دەسڕۆیشتوو و بۆ ماوەی نیزیکەی هەزار ساڵێک فەرمانڕەوای ڕۆژئاوای ئاسیا بن. ئەودەم تەنیا یەک شتیان کەم بوو ئەویش دەرکەوتنی سەرکردەیەکی کاریزما، ئەو سەرکردەیەش کورشی دووەمی کوڕی کەمبیزی یەکەم بوو.

### بازرگانی و داگیرکاران

بەرهەمهێنەری مێژووی مرۆڤانی کۆن، کۆچەری و جووتیار و بازرگان بوون. ئەمەش لەبەر دوو هۆی سەرەکییە، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

**یەکەم:** لەڕووی زهنییەتی سایکۆلۆژییەوە (کۆچەری) لە (بازرگانەوە) نیزیکترە تا لە (جوتیار). سەخت و قورسە کۆچەرییەک بتوانێت ببێتە جوتیارێکی کارامە یا پیشەوەرێکی لێزان، بەڵام ئاسانە ببێتە بازرگانێکی بەتوانا یا چالاکەوان لە دامودەزگایەکی بازرگانی هەرێمایەتی یاخۆ جیهانی هەژمونگەر.

**دووەم:** دیدگەی داگیرکاری، بەرهەمی ڕۆشنبیریی کشتوکاڵی نییە، بگرە دەرهاویشتەی ڕۆشنبیری کۆچەری و بازرگانییە. بەڵێ، جوتیار پێویستی بە داگیرکاری نییە، چونکە سەرچاوەی بژێوی لەبەردەستدایە، جا با کەمیش بێت، بەڵام کۆچەریی پێویستی بە داگیرکاری و هەڵکوتانە سەر ئەوی دی هەیە تا درێژە بە ژیانی خۆی بدات. لەهەمان کاتدا بازرگان پێویستی بە

---

(٢٠١) هارفی بورتر: موسوعە مختصر تاریخ القدیم، ص١٥٢-١٥٣.

داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی شمەک و بازاڕەکان هەیەو کۆنترۆڵکردنی ڕێگەی بازرگانییە هەرێمایەتی و جیهانییەکان بۆ ئەو پێداویستییەکی ژیارییە.

ناڵێم ئەم حاڵەتە بناخەیەکی هەمیشەیی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتەکانە، بەڵام وای دەبینم، کە لە مێژووی گشت ئیمپراتۆرییەتە کۆن و تازەکاندا، ئەم بابەتە بناخەیەکی سەرەکی بێت.

من لە مێژووی دەوڵەتی ئەخمینییەکاندا شتێک لە ڕاستی و دروستی ئەم بناخەیە بەدی دەکەم. گەلی فارسی کۆچەری، گەر بە گەلی ماد بەراوردی بکەین، ئەوا دەبینین ئەوان بەسەر خاک و زەوی وڵاتێکی بێ پیتەوە ژیانیان بەسەر بردووەو وڵاتەکەیان لە ڕێگە بازرگانییەکانەوە دوور بووە. دوای دەستبەسەرداگرتنی مەملەکەتی ماد (ئەفغانستان تا دەریای سپی ناوەڕاست)، ئیتر فارسەکان بە زاراوەی سەردەم بوون بە (ئیمپرایالی)و لەم پێگەیەوە توانیان کۆنترۆڵی بازرگانی هەرێمایەتی و جیهان بکەن و دەست بەسەر دەروازەی ڕێگە بازرگانییە جیهانییەکە (ڕێگەی ئاوریشم )دابگرن و لەوێوە بگەنە ئاسیای ناوەندو لەوێشەوە بۆ نیمچە کیشوەری هندو بەرەو ڕۆژهەڵاتی نێزیک.

بەڵام بەپێی حیساباتی ئیمپراتۆری ئایا ئەوە بەس بوو؟

نەخێر، ئیمپراتۆرییەت ئەگەر کۆنترۆڵی تەواوی گشت ڕێگە بازرگانییەکان نەکات، ئەوا لەڕێگەی ئابووری و سەربازی و سیاسییەوە، هەڕەشەی خنکانی لەسەرە. ڕاستە فارسەکان کۆنترۆڵی ئەو ڕێگە بازرگانییانەیان کردبوو، کە لە ڕۆژئاوای ئاسیاوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی دوور دەچوو، بەڵام هێشتا دەستیان نەگرتبوو بەسەر ڕێگە بازرگانییەکانی سوریاو ئاسیای بچوکدا، بۆیە دەستیان نەدەگەشتە بەندەرە گرینگەکانی کەناری ڕۆژهەڵاتی ناوین، هەر ئەم هۆیەش بوو پاڵی بە کۆڕشەوە نا، تا هێرش بکاتە سەر کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست و دەست بگرێت بەسەر بەندەرەکانی سوریاداو فینیقییەکان (پێشەنگەکانی دەریا لە ڕۆژئاوای ئاسیا) بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. دیارترین دەسکەوتی کۆڕش لەم بوارەدا، دەستبەسەرداگرتنی کەشتییە ناودارەکانی فینیقییەکان، بۆ گواستنەوەی بازرگانی، بوو. لەهەمان کاتدا بۆ پەلاماردان و داگیرکارییە دەریاییەکانی کەڵکی لێ وەردەگرت.

جارێکی تر ئەم دەسکەوتانەی بەس نەبوو، چونکە تا ئەو دەمە مەملەکەتی لیدیای (لەڕووی ئەتنیکی و ڕۆشنبیرییەوە نێزیک لە گریکەکان) ڕێگر بوو لە گەیشتنی دەوڵەتی تازە پێگەشتووی فارس، بە بەندەرەکانی ڕووی دەریای ئیجەی سەر هیلسپونت (دەردەنیل) و تا ئەو کاتە گریکەکان دوورگەکانی دەریای ئیجە و ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوینی لەبن دەستدا بوو. کۆرش دەیزانی تا دەست بەسەر ئەو بەندەر و دوورگانەدا نەگرێت ناتوانێت کۆنترۆڵی تەواوی (ڕێگەی ئاوریشم) بکات و بپەڕێتەوە بۆ قووڵایی کیشوەری ئەوروپا.

## پرۆژە فرەوانخوازییەکەی فارس

پرۆژە فرەوانخوازییەکەی فارس بە سێ قۆناخدا تێپەڕی.

**قۆناخی یەکەم:** بەردی بناخەی ئەم قۆناخە کۆرش دای نا، کاتێک لە ساڵی (٥٤٧ پ.ز) هێرشی کردە سەر مەملەکەتی لیدیا، لە ئاسیای بچووک، ئەمەش نە تەنیا بە هۆی هاوپەیمانێتی لیدیاو مەملەکەتی مادی (ڕکابەری فارس) و نە بەهۆی هێرشی کورویسوس پاشای لیدی بۆ سەر دامودەزگای ئەخمینییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری هالیس (قیزیل ئیرماق)، بگرە ئەم مەملەکەتە ڕێگر بوو لەبەردەم کۆرشدا بۆ گەشتن بە بەندەرەکانی دەریای ئیجەو هیلسپونت، لەوێشەوە ڕێگەی لەبەردەمدا خۆش دەبوو تا وڵاتی گریک داگیر بکات و کۆنترۆڵی گشت ئەو بەندەرە زۆروزەوەندانە بکات، کە بە ڕێگە بازرگانییەکانی کیشوەری ئەوروپاوە گرێ درابوون، هەر بەو ڕێگەیەش دەیتوانی تەنگ بە ئەوروپا هەڵبچنێت و چۆکی پێ دابدات. دیارە هەر ئەمەش پلانی ستراتیجی کۆرش بوو.

**قۆناخی دووەم:** پاشای دووەمی ئەخمینی کەمبیزی کوڕی کۆرش ئەم قۆناخەی جێبەجێ کرد، وەک هەموو داگیرکەرەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا، کەمبیز دەیزانی بە تەنیا کۆنترۆڵکردنی ڕێگە وشکانییەکانی بازرگانی جیهان، (مەبەست ڕێگەی ئاوریشمە)، کە بەرەو ڕۆژئاوای ئەوروپاو وڵاتی چین دەچێت و بە ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئاسیادا تێ دەپەڕێت بەس نییە، بگرە دەبێت دەست بەسەر دەستەخوشکەکەیدا (ڕێگەی بخور) بگرێت. ئەو ڕێگەیەی

که به بەندەرەکانی سوریاو میسری سەر دەریای ناوەڕاستدا تێدەپەڕێت و بەرەو باشور بە ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی عارەبدا گوزەر دەکات، هاوتەریب لەگەڵ دەریای سورو لە بەندەرەکانی یەمەنی سەر (دەریای عارەب) کۆتایی دێت و لەوێوە پێوەندیی بە بەندەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە دەکات.

وەک هەر داگیرکارێک، کەمبیز دەیزانی بەبێ کۆنترۆڵکردنی دەریای سوور ناکرێت ڕێگەی بخور کۆنترۆڵ بکرێت، چونکە بەشە دەریاییەکەی ئەو ڕێگەیە بە دەریای سوردا تێدەپەڕێت، هەرچۆن پێش ئەو، ئاشوورییەکان، مەکەدۆنییەکان، ڕۆمانییەکان، عارەب و هۆسمانییەکان لە کۆندا و داگیرکارە فەرەنسی و ئینگلیزەکان لە سەردەمی نوێدا، دەیانزانی بەبێ دەستبەسەرداگرتنی دەریای سوورو بەبێ کۆنترۆڵکردنی وڵاتی میسر، ئەستەمە بگەنە ئامانج، کەمبیزیش هەمان ئەو ڕاستییەی دەرک کردبوو، هەربۆیە لە ساڵی (٥٢٥ پ.ز) هەڵی کوتایە سەر میسرو داگیری کرد. پاشان بە نیازی داگیرکردنی وڵاتی نوبەی باشور (ئێستە بەسەر باشوری میسر و باکوری سودان)دا دابەش بووە، تا لەو ڕێگەیەوە دەسەڵاتی بەسەر بەشە باشورەکەی دەریای سووردا بکێشێت، کە تەنگەی (باب المندب)ی دەکەوێتە سەر.

کەمبیز پەلامارێکی بەرفرەوانی دا، بەڵام سوپاکەی لەناو لمی بیاباندا ڕێگەی گوم کردو نەگەشتە ئامانج[٢٠٢].

لەم هێرش و پەلامارانەدا، ئامانج فرەوانکردنی قەڵەمڕەوی فارس بوو لە جوگرافیا ئاوییەکانداو دەستگرتن بوو بەسەر کەنارەکانی باشوری دەریای سپی ناوەڕاستدا (باکوری ئەفریقا).

بەپێی ئەم پلانە، ئیمپراتۆرییەتی فارس، ناوەندە بازرگانییەکانی ڕۆژئاوای ئاسیاو باکوری ئەفریقا کۆنترۆڵ دەکات و ئەمەش دەبێتە ڕێگەخۆشکەر بۆ دەستبەسەرداگرتنی جیهانی گریکی بەهێزو پێشکەوتووی ئەوسای ئەوروپا، بۆ ئەو مەبەستە کەمبیز هێزێکی دەریایی بۆ پەلاماردانی قەرتاجنە (قەرتاجە) و کۆلۆنیالە فینیقییەکانی باشووری ئەفریقیا (کەنارەکانی تونسی ئەمڕۆ)

---

(٢٠٢) هیرودوت: تاريخ هيرودوت، ص٢٢٩.

ڕێکخست، چونکە بوونی هێزێکی دەریایی ڕکابەر لە دەریای ناوەڕاست، ڕێ لە بەرەوپێشچوونی ئیمپراتورییەتی فارس دەگرێت و بەرئەنجام دەستی بە خاک و سەروەت و سامانی گەلان ناگات.

بۆ داگیرکردنی قەرتاجە، کەمبیز داوای یارمەتی لە گەلەکەشتی فینیقییەکان و دەریاوانەکانی پاشکۆی ئیمپراتورییەتەکەی خۆی کرد، هیرۆدۆت دەڵێت: **"بەڵام فینیقییەکان داواکەیان ڕەت کردەوە، چونکە پێوەندییەکی بەهێز، فینیقییەکانی بە قەرتاجییەکانەوە دەبەست و شەڕکردن دژ بەوان تاوان و بەڵایەو ناشێت ئەوان ئەنجامی بدەن، چونکە هێزە دەریاییەکانی دی بەبێ بەشداریکردنی فینیقییەکان توانای پەلامارێکی لەو جۆرەیان نەبوو، بەم شێوە قەرتاجە لەدەست فارسەکان ڕزگاری بوو"**[٢٠٣].

**قۆناخی سێیەم:** ئەم قۆناخە سێیەم پاشای ئەخمینی، دارای یەکەم (داریوش)، دوای داگیرکردنی میسر جێبەجێی کرد. ئەو پەلاماری ئەغریقی دا. سەرەتا دورگە ئەغریقییەکانی دەریای ناوەڕاستی داگیرکردو پاشان پەلاماری ئەسیناو ئیسپارتای دێرین و بەهێزترین کۆمارەکانی گریکی دا. دارا وەک نەریتێکی تایبەت بەخۆی لە سەرکردەی ئەو گەلانە، کە نیازی داگیرکردنی وڵاتەکانیان هەبوو، وەک هێمای سەردانواندن و ڕازیبوون بە پاشکۆیی، داوای دەکرد بڕێ ئاو و خۆڵی بۆ بنێرن، ئەمەش هەمان ڕفتار بوو بەرانبەر بە گریکییەکان نواندی، لەهەمان کاتدا فەرمانی بۆ شارەکانی سوریا و وڵاتانی ئاسیای بن دەسەڵاتەکەی نارد، تا بە پاپۆڕی شەڕو ئەسپ پشتگیری بکەن.

لە کاتی خۆ ئامادەکردندا بوو بۆ هێرشە چاوەڕوانکراوەکەی، لەلایەن بڕێ لە شارە گریکەکان وشکانی و دەریاییەوە ئاو و خاکی پێگەشت، بەڵام فەرماندەکانی ئەسیناو ئیسپارتا داواکەی پاشای فارسیان ڕەت کردەوەو بەوەشەوە ڕانەوەستان و کەسی نێردراو (نامەبەر)ی دارایان گرت و هاویشتیانە ناو چاڵێکی قووڵەوە. خەڵکی ئیسپارتاش نامەبەرەکانیان فڕێ دایە ناو بیرێکی قووڵەوە و پێیان وتن: "ئا لەوێ ئاو و خۆڵتان چنگ دەکەوێت بۆ پاشاکەتان"[٢٠٤] و بڕیاریان

---

(٢٠٣) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٦.

(٢٠٤) هەمان سەرچاوە، ل٥٣٦.

دا سزای ئەو لایەنە گریکیە بدەن کە ژێردەستەیی فارسیان قبووڵ کردبوو، لەو کاتەدا برێ لە پیاوەکانی لایەنە سەرشۆڕکردووەکان، کە لە سوپای پایتەختی فارسدا لە خزمەت پاشادا بوون، بۆ پەلاماردانی ئەسینا و ئەسپارتا، دنەی پاشا دارای یەکەم یان دا، ئەم هاندانەش فرە دڵی دارای خۆش کردبوو، هیرۆدۆت پەژێت: **"سەرەڕای ئەوەش داریوش بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕا تا پەلاماری ئەو شارە ئەغریقییانە( گریکەکان ) بدات، کە ڕەتیان کردبووەوە ئاو و خۆڵی بۆ بنێرن، بەرئەنجامی شکستە سەربازییەکەی، دارا ماردونیو[٢٠٥]ی لەسەر کار لابردو لەبری ئەو، دوو فەرماندەی بۆ ئەو سوپایەی کە دەستنیشانی کردبوو هێرش بکاتە سەر ئێریتریاو[٢٠٦] ئەسینا، دەستنیشان کرد، ئەو دوو فەرماندەیەش داتیسی میدی و ئەرتفرنیسی کوڕی ئەرتفیسی برازای بوو و[٢٠٧] داوای لێکردن دانیشتوانی ئەسینا و ئێرتریا دەستگیر بکەن و وەک کۆیلە بۆی بنێرن"**[٢٠٨].

### خاڵیکردنەوەی بیرەوەری

لە ڕاستیدا و بەر لە شەڕی ماراتۆن، ئێمە هیچ شتێک لەبارەی داتیسی میدی نازانین. ئێمە لەمەوبەر ئاماژەمان بە کەمی زانیارییە مێژووییەکان لەمەڕ مێژووی میدی بەتایبەت و مێژووی کوردە دێرینەکان بەگشتی کرد. سەرەرای ڕۆڵی کاریگەری میدییەکان لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەدرێژای سەدەو چارەکی، کە لە ساڵی (٦١٢پ.ز) گەورەترین کودەتایان دژ بە هەژموونگەرایی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بەرپاکرد و گەلانی ناوچەکەیان لەبندەستی ڕزگار کرد و بەسەر ناوچەیەکی بەرفرەوانی زۆر، کە لە ئەفغانستانەوە درێژ دەبووەوە، تا دەگەیشتە دەریای سپی ناوەڕاست قەڵەمڕەوییان کرد.

---

(٢٠٥) نەوەی دارا، لە کچەکەی فەرمانەدەیەکی باڵای فارس.

(٢٠٦) Eretria شارێکە لە باکوری ئەسینا.

(٢٠٧) برازای داریوش.

(٢٠٨) هیرودوت، تاريخ هيرودوت: ص٤٦٦.

پرسیاره گرینگەکە ئەمەیە: ئایا ماقوڵە مەملەکەتێکی وەک مەملەکەتی میدیا بتوانێت بەسەرزارەکی کاروباری گەلەکەی خۆی و گەلانی دی ژێردەستی بەڕێوە ببات و هیچ نووسراو و تۆمارێکیان لەپاش بەجێ نەمێنێت؟ ئایا عەقڵ دەیگرێت زانیاری تەواو لەسەر سۆمەری و ئەکەدی و ئاشووری و ئەمەوی و ئارامی و ئەخمینی و پارس و ساسانییەکانی لەبەردەستدا بێت، لەهەمان کاتدا شتێکی وا یا زۆرجار هەر هیچ شتێک پێوەست بە میدییە پێشینەکانی کوردو باوباپیرانی لەبەردەستدا نەبێت، لەکاتێکدا ئەم گەلانە هەر هەموویان لەیەک ناوچەدا ژیاون؟! ئایا ئەم دیاردەیە فرە نامۆ نییە؟!

لە لاپەڕەکانی پێشوودا گوتمان، ئەم دیاردەیە بزرکردنێکی بەرنامە بو دارێژراو بووەو سەرکردە ئەخمینییەکان نەخشەیان بۆ کێشاوەو بەوپەڕی تواناوە پێیان لەسەر بەجێگەیاندنی داگرتووە و دواییش ئیمپراتورییەتە فارسییەکانی تر لە ترسی زیندووبوونەوەی بیرەوەریی (بەئاگاهاتنەوەی هۆشی) گەلی میدی، یەک لە دوای یەک پێڕەویان لێ کردووە، بەدرێژای مێژووی کۆن و نوێ دامەزرێنەرانی ئیمپراتۆرییەتەکان گرینگییان بە (خاڵیکردنەوەی بیرەوەری) گەلانی ژێردەستە داوەو نێزیکترین ڕێگە بۆ بەتاڵکردنەوەی زەینی گەل لە دوو شتدا خۆی بینیوەتەوە:

<u>**یەکەمیان:**</u> شاردنەوەی مێژووەکەی. <u>**دووەمیان:**</u> لەبیربردنەوەی زمانەکەی.

با بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو کەسایەتییە، کە هیرۆدۆت بە داتیسی میدی ناوی بردووەو وشەی (س(S)ی پاشکۆی لێ لابەین، دەبینین ناوەکە بە (دات) Dat دەمێنێتەوە. ئەم ناوەش لە زمانی کوردیدا واتای (بەخشش، پیدان) دەگەیەنێت، بەڵام ئایا باوکی داتیس کێیە؟ باپیری کێیە؟ نازانرێت.

سپاردنی فەرماندەیی سوپایەکی زەبەلاح بۆ تێکشکاندنی گەلی گریکی سەرسەخت و شەیدای ئازادیی، کە گۆڕەپانی کردارە سەربازییەکە یەکجار دوورەو کەوتوتە ڕۆژئاوای ئیمپراتۆرییەتی فارسەوە، بە کەسایەتییەکی میدیی چ دەگەیەنێت؟

لۆژیک پێمان دەڵێت؛ ئەم بڕیارە زیاد لە واتایەک هەڵ دەگرێت:

- یەکەمیان: داتیس گەورە فەرماندەیەکی سەربازیی سوپای فارس بووە.

- دووەمیان: ئەم کەسایەتییە خاوەن تایبەتمەندییەکی سەرکردایەتی و ئەزموونێکی سەربازی باڵای هەبووە.
- سێیەمیان: یەکێک بووە لە فەرماندە میدییە دڵسۆزەکانی سەرکردە ئەخمینییەکان.
- چوارەم: بەشداری نەکردووە لە کودەتاکەی (گۆماتا)ی میدی، دژ بە ئەخمینییەکان .

## کشان بەرەو ئەسینا

هەردوو فەرماندە داتیس و ئەرتفرنیس، وڵاتی فارس و مادیان بەجێ هێشت و بە سوپایەکی هیرۆدۆت واتەنی **(زەبەلاح و پڕچەک)** بەرەو باکورو ڕۆژئاوا ڕوویان کردە دەشتاییەکانی ئالیان لە ناوچەی (کیلیکیا Cilicia [209]) و لەوێ سوپا دای کوتاو بڕێ هێزی سەربازی دەریایی لەتەک ئەو بڕە ئەسپەدا، کە بە فەرمانی دارای یەکەم لە وڵاتەکانی دی لەبری باج و خەراج دەستی بەسەردا گیرابوو گەشتەجێ. پاشان ئەو هێزانە هەر هەمووی بە دەریادا ڕەوانەی ئەیونیا (ئەوپەڕی ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆ) کرد. ئەم هێزە پێک هاتبوو لە (٦٠٠) شەش سەد پاپۆڕی سێ سەوڵی.

کەشتیگەل بەرەو تەنگەی هیلسپونت (دەردەنیل)و تراقیا ئاڕاستە نەکرا، بگرە بەرەو دورگەی (ساموس- Samus)ی کەناری دەریای ئیجە (بەری لای تورکیای ئەمڕۆ)و ڕاستەوخۆ بە دەریای ئیکاری و دوورگەکاندا بەرەو دوورگەی (ناکسوس- Naxos) ئاراستە کرا. ئەم دورگەیە، لە پەلامارێکی پێشووی فارسەکان بۆ داگیرکردنی شکستی خوارد، کە پەلامارەکە گەشتەسەر ناکسوس **"دانیشتوان هیچ بەرگرییان نیشان نەدا و بەرەو هەردەو هەڵەتەکە هەڵهاتن. فارسەکان توانییان بڕێکیان لێ دەسگیر بکەن و بیانکەنە کۆیلەو پاشان شارەکەیان بە پەرستگەکانییەوە ئاگر تێبەردا و**

---

(٢٠٩) وەرگێڕە عارەبەکە، لە (تاریخ هیرودوت) ناوی بە (قیلقیلیە) بردووە.

**بەتەواوی سوتاندیان. ئینجا بە ڕێگەی دەریادا ڕوویان کردە دورگەکانی تر"[210].**

لەو کاتەدا، کە سوپای فارس دورگەی ناکسۆسی داگیر دەکرد، دورگە یۆنانییەکانی تر بۆ بەرگری ئامادەباشییان دەکرد، کە دانیشتوانی دورگەی (دیلوس- Delos)ی نێزیک ناکسوس لە باکور هەستیان بە مەترسی کرد، ڕووەو باکورو بەرەو دورگەی (تینۆس- Tenos) هەڵهاتن. لەو دەمەدا، کە کەشتیگەلی فارس پێشڕەوي‌یان دەکرد، داتیسی میدی فەرمانی دانێ، کە لە دوورگەی دیلۆس لانەدەن، بگرە بەرەو دورگەی ڕینایای بەرانبەر پێشڕەویی بکەن، کاتێک دەستنیشانی شوێنی دیلیان (دانیشتوانی دیلوس) بۆ کردو دڵنیابوو، کە لەوێ لایان داوە، نامەیەکی بۆ نووسین و ڕێزی خۆی بۆ پیرۆزییەکانیان دەربڕی، بەپێی گێڕانەوەکەی هیرۆدۆت، داتیس لەو نامەیەدا نوسیبووی: **"گەورەو بەڕێزان، بۆ هەڵدێن؟ ئەو بۆچوونە نامۆیە چییە، کە هەتانەو پاڵتان پێوە دەنێ تا لەبەر چاوان خۆتان ون بکەن؟ بەدڵنیاییەوە من هێندە دانایی و ژیریم هەیەو پێویستم بە فەرمانەکانی پاشا نییەو دەتوانم دوورگەکەتان، کە ئەپۆلۆو ئەرتمیس[211]ی تیادا لەدایک بووە ببوێرم، هیچ ڕەفتارێک نەکەم، کە زیان بەوان و گەلەکەیان بگات. بۆیە تکاتان لێ دەکەم بگەڕێنەوە سەرماڵ و دورگەکەتان"[212].**

هیرۆدۆت، زیاتر دەدوێت و دەڵێت: **"پاش ڕەوانەکردنی نامەکەی داتیس، نێزیکەی سێ سەد مسقاڵ بخور لە پەرستگای دیلوس دەسوتێنێت، تا لە خوداوەند نێزیک بێتەوە. پاشان دورگەکەی جێ هێشت و بە ڕێگەی دەریادا پێش هێزەکەی کەوت و ڕووی لە ئیریتریا کرد و ئایۆنەکان و ئەیولینەکان، کە دابویانە پاڵ فارس لەگەڵ خۆیدا بردنی"[213].**

---

(٢١٠) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٤٦٧.

(٢١١) لە گەورە خوداوەندەکانی یۆنان.

(٢١٢) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ص٤٦٧.

(٢١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هێزی فارس بە فەرماندەیی داتیس بەرەو دورگەی ئەتیکا (باشوری یۆنان، کە شاری ئەسینای لێ هەڵکەوتووە) پێشڕەویی کرد. فارسەکان دەگەشتنە هەر دورگەیەک داوایان لە خەڵکەکەی دەکرد، کە دەبێت بارمتە یا جەنگاوەریان بدەنێ، تا شەڕی گریکەکان و بەتایبەت خەڵکی ئەسینای پێ بکەن. ئەوان گەمارۆی ئەو دورگەیەیان دەدا، کە داواکارییەکانیانی ڕەت دەکردەوەو دەغڵ و دانەکانیان دەسوتاندو خەڵکەکەیان ناچار دەکرد بۆ داواکانیان مل کەچ بکەن.

## شەڕی ماراتۆن

پاش داگیرکردنی دورگە گرینگەکان، فارسەکان پێشڕەوییان کردو شاری ئیرتریایان کۆنترۆڵ کرد. بەپێی فەرمانەکەی دارا خەڵکەکەیان وەک کۆیلە لەگەڵ خۆیاندا برد، هیرۆدۆت یەژێت: "**پاش داگیرکردنی ئیرتریا و سەرکوتکردن و بەکۆیلەکردنی دانیشتوانەکەی، فارسەکان چەند ڕۆژێک چاوەڕوان بوون، پاشان بەدەم نەشئەی سەرکەوتنەوە بە دەریادا بەرەو ئەتیکا چوون، بەو نیازەی وەک ئیرتریا سەودایی لەگەڵ دانیشتوانەکەی بکەن، لەوێ دەشتی ماراتۆنیان هەڵبژارد، چونکە ئەتکیا نێزیکترین شوێن بوو لە ئیرتریا، سەرەڕای نێزیکییەکەی، ماراتۆن گۆڕەپانێکی لەبار بوو بۆ ڕمبازی و جوولەی ئەسپسوارەکان**"[٢١٤] .

کە دانیشتوانی ئەسینا زانییان هێزەکانی فارس بەرەو شارەکەیان دەچێت، خەڵکەکەی خۆیان گلێر کردەوە و دەستیان کرد بە بەربەست دروستکردن و هێلی بەرگرییان دامەزراندو لەتەک هاوپەیمانە گریکەکاندا بۆ ڕووبەڕبوونەوەی فارسەکان ڕوویان لە دەشتی (ماراتۆن) کرد، لەوێ بە درێژایی هێڵی جەنگەکە تێکڕژان بەیەکدا. هیرۆدۆت باس لە ئازایەتیی ئەسینایییەکان دەکات و ئاماژەش بە هەیبەتی فارسەکان لە دڵ و دەروونی ئەواندا دەدات و دەڵێت: "**لەناو گریکەکاندا ئەوان یەکەمین کەس بوون، کە**

(٢١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦٩.

**بەدەم ڕاکردنەوە ڕمیان دەهاویشت و یەکەم کەس بوون  کە وێرایان لە جلوبەرگی فارسەکان بڕوانن، یا ڕووبەڕووی ئەو پیاوانە ببنەوە بەبێ ئەوەی ترس دایان بگرێت، چونکە تا ئەو ڕۆژە هیچ گریکێک نەبوو  کە گوێی لە وشەی (فارس) ببوایەو ترس دای نەگرتایە"[٢١٥].**

لەنێوان هەردوولادا شەڕێکی قورس بەڕێوە دەچوو. شەڕی نێوان دوو کیشوەری (ئاسیاو ئەوروپا) بوو. سەرەتا سوپای گریک خراپ تێکشکا، بەڵام لەپڕێکدا هەردوو باڵی سوپای گریک ڕێڕەوی خۆیان گۆڕی و بەهەردوو ئاراستەدا شکستیان بە سوپای فارس هێنا، پاشان یەکیان گرتەوەو بەرەو قوڵایی و ناو جەرگەی سوپای فارس هێرشیان برد، ئیتر فارسەکان لە پاشەکشە و هەڵهاتن بەولاوە، هیچ بژاردەیەکی دیکەیان لەبەردەمدا نەمایەوە.

لەوێوە بە کەشتیگەلەکانیانەوە، ڕوویان کردە بەندەری (فالیریوم)، کە سەرەکیترین بەندەری ئەسینا بوو، بەڵام بەرلە فارسەکان گریکەکان خۆیان گەیاندە ئەسینا و شوێنپێی خۆیان قایم کرد و فارسەکان بەرەو ئاسیا ناچار بە پاشەکشە کران. ئەم شەڕە ساڵی (٤٩٠ پ.ز) ڕووی دا.

لەگەڵ تێکشکانی سوپای فارسدا سەربازێکی ئەسینایی بەناوی (**ڤیدبیدیس**) بە ڕاکردن بەرەو ئەسینا چوو، تا مژدەی سەرکەوتن بەگەل بگەیەنێت. مەودای نێوان ماراتۆن و ئەسینا (٤٠)کم بوو، لەگەڵ گەشتنیدا مزگێنی سەرکەوتنی دایە خەڵکەکە و بەرئەنجامی ئەو ڕاکردنە چل کیلۆمەترییە ڤیدبیدیس کەوت و گیانی سپارد. جا بۆ بەرزڕاگرتنی یادی ئەو سەربازە مژدەبەرە و زیندووڕاگرتنی یادی ئەو سەرکەوتنە مەزنە یەکلاکەرەوە، گریکەکان کێبڕکێی ماراتۆنیان خستە نێو گەمەی ئۆڵۆمپیاد و لەسەر ئاستی فەرمی و جەماوەری جوانترین ئاهەنگی بۆ دەگێڕن. لە ساڵی (١٨٩٦ز) کێبڕکێی ماراتۆن زیندووکرایەوەو ئێستە ئەو ڕێگەیە ڕێگەی ڕاکردنە و لە پردی گوندی ماراتۆنەوە دەست پێدەکات و لە ئەسینا کۆتایی پێ دێت.

---

(٢١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧٥.

## ڕێزگرتن لە پیرۆزییەکان

لە باسکردنی شەڕی ماراتۆندا بۆمان دەردەکەوێت، کە داتیس فەرماندەی باڵا بووە، بەڵام دەنگوباسی (ئەرتفرنیس)ی فەرماندە نییە. بە قسەی هیرۆدۆت لەو شەڕەدا (٦٤٠٠) شەش هەزارو چوار سەد جەنگاوەری فارس و (١٩٢) سەد و نەوەد و دوو سەربازی گریک کوژران. سەرەڕای شکستە سەربازییەکەی، داتیس پیاوێکی لێبوردەو هێمن بووە. مرۆڤێکی مرۆدۆستو بنەمای بیرو باوەڕی خۆی پاراستووەو ڕێزی لە پیرۆزییەکانی دوشمنەکەشی گرتووە.

کێ دەزانێ؟ لەوانەیە داتیس لەناخیدا دەرکی بەو ڕاستییە کردبێت، کە زوڵم و زۆری ئیمپراتۆرییەتی فارس بەسەر گەلاندا دابەش دەکات، ڕاستە بە ئەرکی خۆی زانیوە بەوپەڕی ئازایەتییەوە شەڕ بکات و بجەنگێت، بەڵام ئەرکی مرۆڤایەتی ئەوەیە، کە ڕێز لە تایبەتمەندییەکانی خەڵکانی دی بگرێت، ئەمەش دیاردەیەکە زۆرینەی پیاوە ناودارەکانی کورد و باوباپیرانی بەدرێژای مێژووی کۆن و نوێ بەرچاو دەکەوێت و پێی دەناسرێنەوە. لەمەڕ ڕێزگرتنی داتیس لە پیرۆزییەکانی گریک هیرۆدۆت دەڵێت: **"لەگەڕانەوەیدا بە سوپاکەیەوە بۆ ئاسیا، داتیس لە میکۆنۆس لایدا، لە نوستنیدا خەونێکی بینیبوو، نەیدەزانی ناوەڕۆکەکەی چییە، دەمەوبەیان فەرمانی دا گشت کەشتییەکان بپشکنرێن، لەناو یەکێ لە کەشتییە فینیقییەکاندا پەیکەرێکی ئەپۆلۆیان دۆزییەوە، کە لەناو برێ پارچە ئاڵتوندا شاردرابووەوە، کە زانی لە کوێ دزراوەو لە چ پەرستگایەک بووە، خۆی بە کەشتییەک دەگەڕێتەوە دیلۆس و پەیکەرەکە لە جێگەی خۆی دادەنێتەوە. ئەوسا داتیس دەگەڕێتەوە لای کەشتیگەلەکەی خۆی"**[٢١٦].

ئەنجامی شەڕی ماراتۆن، دارا فرە تورە دەکات و لە جاران پتر ڕقی لە ئەسینا هەڵدەستێت و جەخت لەسەر پەلاماردانی وڵاتی گریک دەکاتەوە. بۆ ئەو مەبەستە وڵاتەکانی بندەستی دەخاتە ئامادەباشییەوە، تا سوپایەکی زەبەلاحتر

---

(٢١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨٧.

لەوەی پێشوو پێکەوەبنێ و کەشتیگەلی زیاترو هۆکانی گواستنەوە و دەغڵ و دان بۆ بەرەی جەنگ دەستەبەر بکات، هیرۆدۆت دەڵێت: **"بەم شێوە فەرمانی ئیرادی پاشایەتی دەنگی دایەوەو ئاسیای هێنایە لەرزە"**[217].

ئامادەباشی بۆ ماوەی سێ ساڵ درێژەی کێشا، بەڵام زۆری نەبرد دارا لە ساڵی (٤٨٥پ.ز)و بەرلە پەلامارە چاوەڕوانکراوە بەربڵاوەکەی بۆ سەر وڵاتی گریک مرد.

پاش مەرگی دارا، **(ئەحشەویرەش)**ی کوڕی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و هێرشێکی بەربڵاوی کردەسەر وڵاتی گریک. لەو هێرشەدا دەنگوباسی فەرماندەی میدی داتیس نییە. ڕەنگە لەو کاتەدا خانەنشین کرابێ یا مردبێت، بەڵام لەو پەلامارە سەربازییەی ئەحشەویرەش ناوی دوو کوڕی داتیس وەک دوو فەرماندەی سەربازی بەرگوێ دەکەوێ. لە پەسنی سوپای فارسدا لە کاتی پەڕینەوەدا لەڕێگەی دەردەنیلەوە بۆ ئەورووپا هیرۆدۆت دەڵێت: **"سەرلەشکری ئەسپسوارەکان، بە دوو کوڕی داتیس سپێردرابوو، کە ناویان ئەرمامیتراس و تیتایوس بوو. فەرماندەی سێیەم فرنوخس، تووشی ڕووداوێک هات بۆیە لە ساردیس بەجێ هێڵرا"**[218]. دیاکۆنۆف ناوی یەکەم کوڕی داتیس بە (گرم متیر) و دووەمیان بە (تیتی) دەهێنێت[219].

ئاشکرایە، کە دەستە و لەشکری سوارە لە سوپای کۆندا، چەکێکی گرینگ و کاریگەر بووە. بەپێی قسەی هیرۆدۆت ئەحشویرەش گەورەترین سوپای لە مێژووی ململانێدا، لە ئاسیاوە ئاڕاستەی ئەورووپا کرد، گومانیشی تیادا نییە، کە سپاردنی فەرماندەیی لەشکری سوارە بە دوو کوڕەکەی داتیسی میدی هێمایە بۆ دڵسۆزی و لێهاتوویی ئەو دوو کوڕە میدییە بۆ پاشای ئەخمینی و لەهەمان کاتدا دەتوانرێت بگوترێت، کە تەنانەت پاش ڕووخانی مەملەکەتەکەی، گەلی ماد دەتوانێت سەرکردەی بلیمەت لەڕووی سەربازییەوە بەرهەم بهێنێت.

---

(٢١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧٦.

(٢١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢١

(٢١٩) دیاکۆنۆف: میدیا، ل٤١٢.

# (١٣)

## (ئەترۆپات)ی میدی و ئەسکەندەری مەکەدۆنی

## (دوای ساڵی ٣٢٠پ.ز مردووە)

### چوار فاکتەر

ڕاستە پاش ماوەیەکی کورتی فەرامۆشی، بڕێک پیاو لە خانەدانەکانی ماد دژی دەسەڵاتی فارسە ئەخمینییەکان دەستیان دایە شۆڕش و جەماوەریش پشتگیرییان کردو بەسەروماڵ دریغییان نەکرد، بەڵام ئەو شۆڕشانە شکستیان خوارد، چونکە بە ڕای من چوار هۆکاری گرینگی سەرکەوتن یارمەتیدەر نەبوون، یا بڕێکیان لەبار نەبوون، ئەو چوار فاکتەرەش ئەمانەی لای خوارەوەن:

**یەکەم فاکتەر:** سەرکردەیەک هەڵبکەوێت، کە کوڕی گەل بێت و لە ناخی گەلەوە هەڵقوڵابێت، بەوپەڕی تین و دڵسۆزییەوە خۆی بۆ خزمەتی نەتەوەکەی تەرخان بکات، سەرکردەیەک ستەمکارو هەڵەشەو گێل نەبێت و پرۆژەیەکی پوخت و گشتگیرو هەمەلایەنەی ئازادیخوازانەی هەبێت بۆ ڕێکخستن و یەکخستنی ڕیزەکانی گەل متمانە بەدەست بهێنێت و هەموو تواناکان بەلێهاتوویی بەکاربهێنێت.

**دووەم فاکتەر:** زۆرترین کەس لە (نەجیبزادە، پیاوانی ئاینی، سەرەک هۆز، بیرمەند، سەرکردەی گرووپە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان... هتد)، باوەڕیان بە پرۆژە ئازادیخوازەکەی هەبێت و دەسبەرداری پرۆژەی تاکەکەسی و خێڵەکی وئاینی و مەزهەبی ببن و ناکۆکی و ململانێکانیان وەلابنێن و هەوڵ بدەن جەماوەر لە پرۆژەکە کۆ بکەنەوەو مل بۆ سیاسەتی تۆقاندن و تەماح خستنەبەری لایەنی داگیرکەر نەدەن.

**سێیەم فاکتەر:** سەرهەڵدانی ناکۆکی ناوخۆی چینایەتی یا سیاسی یا بیروباوەڕ لەناو لایەنی دەسەڵاتدارداو خەریکبوونی سەرکردەو فەرمانڕەواکانی ئەو قەوارەیە بە ململانێ ناوخۆییەکان، لایەنی دەسەڵاتە زۆردارەکە بێ هێز دەکات و بەرەو پووکانەوەی دەبات، ئەوکات لە هێزێکی هێرشبەرو داگیرکەرەوە دەبێتە هێزێکی لاوازو قرچۆک.

**چوارەم فاکتەر:** سەرهەڵدانی هێزێکی هەرێمایەتی یان جیهانی دژ بە دەسەڵاتی ستەمکارو خۆسەپێن، لایەنی دووهەم توشی قەیران و شپرزەیی دەکات بە ڕادەیەک گرفتە ناوخۆییەکان فەرامۆش دەکات و دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ناوخۆی لاواز دەبێت و شیرازەی تێک دەچێت، هاوزەمان هێزە ڕکابەرە دەرەکییەکە، کە دەکرێت بە (دوشمنی دوشمن) ناوببرێت، دەستی یارمەتی لۆجستی، سەربازی، سیاسی و ئابووری بۆ گەلی ژێردەستە درێژ دەکات، کورد واتەنی (نەک لەبەر خاتری چاوی ڕەشی گەلە چەوساوەکە)، بگرە بۆ تێکشکاندنی دوژمنە سەرەکییەکەی خۆی.

وا دەردەکەوێت دەسەڵاتدارانی فارس لە سەرکوتکردن و تواندنەوەی نهێنیدا شارەزاییەکی باشیان هەبووەو لە بەتاڵکردنەوەی زاکیرەی گەلی میدی لە شکۆی باوباپیرانی، لەم ڕووەوە سەرکەوتنیان بەدەستهێناوەو لە ئاگایی قووڵی یەکێتی و نیشتمانپەروەری و سیاسی ڕووتی کردووەتەوەو لەناو بازنەی شارستانییەتدا وەدەری ناوەو کردوویەتی بە خێڵی شوانکارەو دواکەوتوو و تۆوی ناکۆکی لە دڵ و دەروونی تاکەکانیدا چاندووە. هۆزگەلێک، کە بە پلەی یەکەم داکۆکی لە هۆزو لەوەرگەکان بکات، نەک لە (نیشتمان). بەرگری لە شکۆمەندی (خێڵ) بکات، نەک لە کەرامەتی (نەتەوە)،

بەڵگەش بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە ئەمەیە، کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دارای یەکەم، پاش شۆڕشەکەی فەراوورت و چەیتران تەخمە لە مێژووی میدییەکاندا، هیچ شۆڕشێکی گەورە بەدی ناکەین، خۆ ئەگەر شۆڕشێکی کاریگەر هەڵبگیرسایە ئەوا نیشتمانی ماد بۆ ماوەی سەدەی شەشی پێش زایینی تا ناوەڕاستی سەدەی حەوتی زایینی لەبن دەستی دەسەڵاتی فارسدا نەدەمایەوە.

ئێمە هیچ سەرچاوەیەکی مێژووییمان لەبەردەستدا نییە باس لە شتێکی گرینگی گەلی ماد بکات، ئەمە گەر بڕێ کورتە زانیاری وەک ئەوەی لەسەر هەرێمێکی میدی بەناوی (میدیا ئەترۆپات)و (ئەترۆپات)ی فەرمانڕەوای لێ دەربکەین.

کەواسا با بزانین دەنگوباسی میدیای ئەترۆپات و خودی کەسایەتی ئەترۆپات چییە؟

## ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

بەلایەنی کەمەوە لە سەدەی (١٨پ.ز)ەوە، لە مێژووی (ئەوراسیا)دا دیاردەیەکی مێژوویی ناوخۆ بەرچاو دەکەوێت، ئەویش دیاردەی شەڕی لێدەو ڕاکە (حروب الكر و الفر) لەنێوان ئیمپراتۆرییەتەکانی هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەوروپا بەرپابووە. سەرچاوەکان پێمان دەڵێن: حیسییەکان یەکەمین گەلی ئەوروپی بوونە، ئاسیای بچووکیان داگیرکردوە و مەملەکەتیان تێدا دامەزراندووە. مێژووی دامەزراندنی مەملەکەتی حیسی کۆن، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی (١٧٥٠ پ.ز)و لە ساڵی (١٢٠٠پ.ز) بە زەبر و فشاری گەلانی ئیجە (گەلانی دەریا)، کە لە دەریا و دورگەکەکانی ئیجە و باشووری وڵاتی گریکەوە هاتبوون، مەملەکەتەکەیان لەناوچوو. دیارە شەڕی تەروادە[٢٢٠] ڕووداوێکی ئەو هێرش و پەلامارانە بوو، هەر لەو مێژووەدا فیرجییە کۆچەرییەکان لە تراقیاوە ڕوویان لە ناوچەکە کرد و ناوەندی

---

(٢٢٠) ولیام لانجز: موسوعە تاریخ العالم،١/ ص٨٣-٨٤.

ئەنادۆڵ لە ڕۆژئاوای ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق)ی داگیرکرد. پاش ئەوان سیمیرییەکان و ئیسکیتەکان ڕوویان لەو دەڤەرە کرد. ئەودەم ئیسکیتەکان لە باکوری میدیاو لەدەوروبەری ناوەڕاستی چەرخی حەوتی پێش زاین وەک هێزێکی بەرچاو ئامادەییان هەبوو، پاشان بۆ بەرپەرچدانەوە، ئاسیا هاتە مەیدانەوە. دارای یەکەم پاشای فارس (٥٢٢-٤٨٠ پ.ز) یەکەم کەس بوو پەلاماری ئەوروپای داو هێرشی کردە سەر وڵاتی ئیسکیتە ڕەسەنەکان لە باکوری دەریای ڕەش (ئۆکرانیاو دەوروبەری). دوابەدوای دارا ئەحشەویرەش پەرەی بە هێرشەکەداو لە وشکانی و ئاوەکانەوە بە هێزێکی بێ شوومارەوە، وڵاتی گریکەکانی داگیرکرد و چووە ناو شاری ئەسیناوە و ئەکرۆپۆڵ (ناوەندی گەورە خواوەندەکانی گریک)ی ئاگر تێبەردا.

ساڵی (٣٣٤ پ.ز) ئەسکەندەری مەکەدۆنی بە دژە هێرشێک لە ئەوروپاوە بەرەو ڕۆژهەڵات کشاو لە شەڕی جرانیکۆس ساڵی (٣٣٤پ.ز)و شەڕی ئیسۆس ساڵی (٣٣٣پ.ز) بەسەر دارای سێیەمدا زاڵ بوو، لەکۆتاییدا و لە شەڕی (گوگامیلا- Gugamela)ی نێزیک بە شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان، ساڵی (٣٣١پ.ز) سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی تۆمار کرد، **"پاشان ڕووی لە پرسیپولیس کردو لە دانیشتنێکی مەیخواردنەوەدا دەگاتە لووتکەی مەستی و فەرمان بە سووتاندنی ماڵی شا دەدات و پاشان دەڵێت: ئەمە تۆڵەی وڵاتی گریکە لە بەرانبەر سوتانی ئەسینا بەدەستی ئجرزسیس"**[٢٢١].

تا سەدەکانی دواییش ئەم بگرەوبەردەیە لەنێوان هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەوروپادا بەردەوام بوو. تاوێک لەنێوان ساسانی و ڕۆمانداو تاوێکی تر لەنێوان ساسانی و بیزنتییەکاندا، دواجاریش لەنێوان عارەبە موسڵمانەکان و بیزەنتییەکاندا و بەرئەنجام داگیرکردنی ئەسینای لێکەوتەوە و عارەبەکان دەستیان گەیشتە باشوری فەرەنسا. ئینجا پەلامارەکانی فرنجە (خاچپەرستان) لە ساڵی (١٠٩٥-١٠٩٦ز) بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی ناوین دەستی پێ کرد.

جارێکی دی ڕۆژهەڵات پێشڕەوی کرد. ئەوەبوو تورکە عوسمانییەکان قوستەنتینەی پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتەیان لە ساڵی (١٤٥٣ز) کۆنترۆڵ

---

(٢٢١) هەمان سەرچاوە،٢/ ل٤٣٦،٤٣٧، و اجزرسیس، پاشا ئەحشویرەش کوڕی دارای یەکەمە.

کردو لەوێشەوە هێرشیان کردە سەر ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، تا لە ساڵی (١٦٨٣ز) گەشتنە دەروازەی (ڤییەنا)ی پایتەختی نەمسا. ئینجا لە چەرخی نوێدا هێرشی ئەوروپا بەرەو ئاسیا دەستی پێکرد و تا ئێستەش تای تەرازووەکە بە قازانجی ئەوروپییەکان شکاوەتەوە.

لێکدانەوەی زۆر لەسەر فاکتەرەکانی پشت ئەم دیاردەو ململانێیەی نێوان ئەوروپاو ئاسیا دەکرێت. بەلای منەوە کۆنترۆڵکردنی (جێگەی باشتر)، کە لە (جوگرافیای بە پیت و دەوڵەمەند) و ڕێگەی بازرگانیدا، لەم ململانێیەدا فاکتەری سەرەکی و کاراو گرینگترە.

فاکتەرەکانی دیکەی وەک سیاسەت یاخۆ ئاین لە بەهانە زیاتر شتێکی دی نییەو مەبەست لە هێنانەوەی ئەم بیانووانە هاندانی جەماوەرە تا پاڵپشتی لە سەرکردەیەک بکات و لەو پێناوەدا لە بەخشینی ڕۆح و ماڵ دریغی نەکات.

بە درێژایی سێ هەزار ساڵ، جوگرافیای بەئامانجکراو ئەو ناوچەیە، کە دەکەوێتە نێوان چیای زاگرۆس لە ڕۆژهەڵات و باشووری ئەوروپا، لە ڕۆژئاوا و دەریای سپی ناوەڕاست، دیارە لەم پانتاییە جوگرافییەدا نیشتمانی مادەکان (کوردستانی ئەمڕۆ) لە ئێستەو لە ئایندەشدا، لەناو چەقی ئەم جوگرافیایەدایە، ئەمەو جگە لە سامانە ئابوورییەکەی (کانزاو بەروبوومە کشتوکاڵی و پیشەسازی)و سامانە مرۆییەکەی (کۆیلە، دیل، بەکرێگرتە)، ئامانجی گەورە لە داگیرکردنی کوردستان گەشتنە بازاڕە بازرگانییەکان لە قووڵایی ئاسیاو ئەوروپا

**ئەسکەندەر لە ماد**

با بگەڕێینەوە سەرباسی مادەکان. لەبەر ڕۆشنایی وەسیەتنامەکەی کەمبیز– لە پارچەپارچەکردنی تەواوی نیشتمانی مادەکاندا، سیاسەتی فارس سەرکەوتنی بەدەست هێنا. نە جوگرافیاو نە پێناسەی نەتەوایەتی مادەکان لە دەستی ئەو سیاسەتە ڕزگاری نەبوو. لە ناوەڕاستی چەرخی چواری پێش زاین پێکهاتەی سیاسی و ئیداری ماد هێندە بچووککرایەوە، تا لەم پانتاییە تەسکەدا (میدیای بچووک) بینرایەوە، کە هەرێمێک بوو لە هەرێمە پاشکۆکانی ئیمپراتۆرییەتی فارسی و دیاکۆنۆف ناوی (میدیای ڕۆژئاوا)ی لێ ناوە، کە

ئەمرۆ لە ئێراندا بە (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) دەناسرێتەوە، بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکەو لەپێناو جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی خۆیاندا، دەسەڵاتدارە فارسەکان کەسێکی میدییان دەستنیشان دەکرد.

ڕاستە ململانێ ناوخۆییەکان جەستەی مەملەکەتی ئەخمینییان کونکون دەکرد، لەهەمان کاتدا سیاسەتی لەتلەتکردنی جوگرافیای مادو خاڵیکردنەوەی بیرەوەرییان لە مێژوو ڕۆشنبیری و کوشتنی هەستی وابەستەگیی بۆ (نیشتمان ـ نەتەوە)، کۆمەڵگەی میدیی گەیاندە جۆرێک لە لاوازی و پارچەپارچەکردن، تا ئەو ڕادەیە لە مێژووی مادی مەزنداو لەوپەڕی لاوازی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی فارسدا هیچ شۆڕشێکی بەرفرەوانی مادەکان بەرچاو ناکەوێت.

لە چارەکی کۆتایی سەدەی چواری پێش زاین و لە سەرەتای ململانێی فارس– ئەغریق، کەسایەتییەک حوکمی مادی بچووکی دەکرد؛ دیاکۆنۆف بە **پیاوێکی مێژوویی** ناوی دەبات، ئەویش **(ئەترۆپات)**ی ڕەگەز میدی بوو. من لەسەرچاوەکاندا شتێکی وام سەبارەت بە ڕابوردووی ئەم پیاوە بەرچاو نەکەوتووە. بەپێی قسەی دیاکۆنۆف؛ ئەترۆپات ناوێکی زەردەشتییە و بەشێوەی (Atarapata) هاتووەو ئەم ناوە لەناو خانەوادەی هەشتاسپ (وەشتاسپ)دا، کە لە بانگەشە ئاینییەکەیدا پشتگیری زەردەشتی کردووە، بوونی هەیە[(٢٢٢)].

وا دیارە ئەم فەرماندەیە پەیوندییەکی باشی لەگەڵ دارای سێهەمدا هەبووە، بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە ئەوەیە، کە لە شەڕی (ئیسوس) لەساڵی (٣٣٣پ.ز) ˚ ٢ ˚ لەپاڵ فارسەکاندا سەرکردایەتی سوپایەکی مادەکانی کردووەو هەمان کات وا دەردەکەوێت، کە میدیای بچووک هێزێکی تاڕادەیەک بەتواناو بەرچاو بووە، بە جۆرێک لە کاتی شکستەکەیدا لەبەرانبەر ئەسکەندەری مەکەدۆنی، پاشای فارس چاوەڕوانی پاڵپشتی و یارمەتی ئەترۆپاتی کردووە. دیاکۆنۆف یەژێت: **"داریوشی سێهەم سوپایەکی زەبەلاحی**

---

(٢٢٢) دیاکونوف: میدیا، پەراوێزی بەشی حەوت، ژمارە ٩٧....˚٣.˚ ˚ هەمان سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزی بەشی حەوت، ژمارە ١٠٢.

**پێکەوە نا، ئەو چاوەڕوانی یارمەتی ئەترۆپات بوو تا ڕێ لە سوپای ئەسکەندەر بگرێت و نەهێڵێت بەرەو ڕۆژهەلات بۆ ناو قوولایی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ولاتەکەی پەل بهاوێت"**[223]، بەلام ئەسکەندەر لێ نەگەڕا دارای سێهەم پشوویەک بدات، بەردەوام لەڕێگەی ڕووباری دیجلەو فوراتەوە ڕاوی دەناو بەدوایەوە بوو، جگە لە ڕووبەڕووبوونەوە، دارا ڕێگەیەکی تری لەبەردەمدا نەمابوو، ئەوە بوو وەک لەپێشدا باسمان کرد، شەڕی (گوگامیلای- Gugamela) لێ کەوتەوە. لەو شەڕەدا وەک هەمیشە بۆ بەرگریکردن لە ئیمپراتورییەتی فارس، ئەترۆپات و سوپامیدییەکەی پەلکێشی شەڕەکە کرا. دیاکۆنۆف لەم بارەوە دەلێت: **"لەو شەڕەدا ئەترۆپات فەرماندەی هێزە مادەکە بوو و کادۆسییەکان و ئەلبانەکان و سەکسنییەکان (خەلکی سکسن)ی نیمچە سەربەخۆ**[224] **شانبەشانی مادەکان دەجەنگان، بەرلەم شەڕە ئەترۆپات سەرکردەی تیمێکی سوارەی تیروانین و چاودێری بوو، کە داریوش بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ڕەوانەی کردبوو"**[225].

لەکۆتاییدا سوپای دارا تێکشکاو ئەسکەندەر بەرەو باشور داکشاو ولاتی بابل و ئیلام و فارس و ولاتی مادەکان بە میدیای بچوکیشەوە داگیر کرد. بەپێی قسەی دیاکۆنۆف، ئەسکەندەر فەرماندەیەکی بەناو (ئۆکسۆدات- Oksudat)ی لە زیندانەکەی دارا ئازاد کردو بە فەرمانڕەوای ولاتی مادی گەورە (بەشی ناوەڕاست و باشوری کوردستانی ڕۆژهەلات و کوردستانی باشور و بەشی ڕۆژهەلات لە کوردستانی باکور) دەستنیشان کرد، بەلام بۆ میدیای بچووک (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) فەرمانڕەوایەکی مەکەدۆنی بە ناوی (پارمینون)، کە لە

---

(٢٢٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٥.

(٢٢٤) کادۆسییەکان خەلکی باشوری دەریای قەزوین بوون. ئەلبانەکان خەلکی ئازەربایجانی ڕۆژهەلات بوون، (کۆماری ئەزەربایجانی ئەمڕۆ). سەکسینەکان گەلانی قەوقازی باکور بوون. دیاکۆنۆف بە (ساکسیتی) ناویان دەبات. ئەترۆپات هاوپەیمانییەکی بەهێزی لەگەل سەرکردەی ئەم گەلانەدا هەبووەو لە مادەکان نزیکتربوون تا لە فارسەکان. (دیاکۆنۆف: میدیا، ص٤١٩).

(٢٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٥.

سوپای ئەغریق، پاش ئەسکەندەر بە دووەمین کەس دەژمێردرا دانا، **"ئەرکی ئەم پیاوە پاراستنی ئاسایشی بەرەی پشتەوە بوو"**[٢٢٦].

ئەسکەندەر بۆی دەرکەوت، کە ڤیلۆت کوڕی پارمینون لە پیلانی کوشتنەکەیدا بەشدار بووە، بۆیە خۆی و باوکیشی کوشت و **"بەرپرسیارییەتی بەڕێوەبردنی وڵاتی مادی بە سێ فەرماندەی سوپاکەی سپارد، کە کلتاندر، میندو و سیتالیک بوون"**[٢٢٧].

## سیاسەتی ڕاستەقینە

لە شەڕی گوگامیلا، سوپای فارس تێکشکا. ئەترۆپات ستراتیجییەتی سیاسی خۆی گۆڕی. وا دیارە دەرکی بەوە کردبوو، کە لە شەڕی نێوان فارس- گریک، ئەو هیچ قازانجێکی بەر ناکەوێت، تەنانەت گەر ئەغریقیش سەرکەوێت، کە ئەم ئەگەرە نێزیکە، ئەوا نیشتمانی ماد لەژێر چنگی فارس دەردەچێت و ئەغریق دەستی بەسەردا دەگرێت، بەڵام ڕەنگە وای بۆچووبێت، کە باری گریکی داگیرکەر لەسەر شانی گەلانی داگیرکراو لەوەی فارس سووکتربێت، بۆیە بڕیاری دا لەو نێوەندەدا بێلایەن بمێنێتەوە **"بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە شاری ئەگباتانا، بەرگری لەخۆی نەکردو کادۆسییەکانیش، کە هاوپەیمانی ئەترۆپات بوون دەستی یارمەتییان بۆ داریوشی سێهەم درێژ نەکرد"**[٢٢٨]. پاش تێکشکاندنەکەی، بە نیازی خۆگلێرکردنەوە، دارا ڕووی لە شاری ئەگاباتانا کرد، بەڵام گەلانی بن دەسەڵاتەکەی پشتیان تێکردو بەگوێیان نەکرد، بۆیە لە ئەگاباتاناوە بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵهات و چەند گەورە فەرماندەیەکی فارس ڕێیان لێ گرت و کوشتیان. ئەم ڕووداوە لە ساڵی (٣٣٠پ.ز) قەوماوە[٢٢٩].

---

(٢٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١٥-٤١٦.

(٢٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤١٦.

(٢٢٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٥-٤١٦.

ئۆکسودات لە وڵات بەڕێوەبردندا شکستی هێنا، بۆیە ساڵی (٣٢٨پ.ز) ئەسکەندەر ئەترۆپاتی وەک فەرمانڕەوای میدیا دەستنیشان کردو ئەویش سەلماندی، کە لەو بوارەدا، لە ئیدارەدانی وڵاتدا، لە ئۆکسودات سەرکەوتووتر بووە، سەرباری ئەوەش، کە پیاوێکی خاوەن تەماحی نیشتمانی بوو، بەڵام سیاسییەکی واقیعبین بوو و دەیزانی لە توانایدا نییە بەرەنگاری سوپای ئەغریق بێتەوە. دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لە ڕاستیدا وا دەردەکەوێت سەرەتا ئەترۆپات حەزی نەکردبێت لەگەڵ ئەسکەندەردا بکەوێتە ململانێوە، خۆ ئەگەر ئەوە ویستی ئەو بووبێت ئەوا لەتوانایدا نەبوو کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدات، چونکە بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئارەزووەی لەو کاتەدا هیچ هێزو دەسەڵاتێکی نەبوو[٢٣٠]".**

دیاکۆنۆف دەڵێت: **"ئەترۆپات دەسبەرداری حەزو ئارەزووەکانی نەبوو"**، بەڵام دیاکۆنۆف باس لە تەماح و ئارەزووەکانی ئەترۆپات ناکات. ئێمە لە خوێندنەوەمان بۆ سەرجەم ڕووداوەکانی ئەودەمەی ڕۆژئاوای ئاسیا بەگشتی و میدیاو فارس بەتایبەت، بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەترۆپات ئارەزووی دەستبەسەراگرتنی سەرتاپای نیشتمانی مادو ڕاماڵینی دەسەڵاتی فارسی بووە. هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەسکەندەردا بەهێزو پتەوکردو ململانێیەکی سەختی لەگەڵ پیاوێک بەناوی (بارباکس) دەست پێکرد.

ئەو (بارباکس)ە، کە نازناوی (پاشای فارس و ماد)ی لە خۆی نابوو، لەکۆتاییدا ئەترۆبات ناچاری کردو لەساڵی(٣٢٤ پ.ز) خستییە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو کۆنترۆڵی کرد[٢٣١] .

کە ئەسکەندەر لە شەڕی ڕۆژهەڵاتی فارس و هیند گەڕایەوە دەستی دایە سزادانی ئەو فەرمانڕەواو فەرماندانەی کە لێی هەڵگەڕابوونەوەو هەرسێ فەرماندەی گریکی فەرمانڕەوای وڵاتی ماد (کلتاندر، مینیدۆ، سیتالیک)و گرووپێکی تری کوشت، بەڵام ڕازیبوونی خۆی بۆ ئەترۆپات دەربڕی و بۆ ماوەیەک لای خۆی گلی دایەوە. سیاسەت و دانایی ئەترۆپات و هاوڕێیەتی

---

(٢٣٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٦.

(٢٣١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**لەگەڵ ئەسکەندەر وای کرد"بە ئازادییەکی رەهاوە هەڵسوکەوت بکات و جێگەی رێزو ستایشی هەموو کەس بێت"[232].**

ئەترۆپات کەسایەتییەکی سیاسی و لە بژاردەکانیدا دووربین بوو. کچێکی خۆی دایە پیاوماقوڵێکی بەناوبانگ و بوێرو دەوڵەمەندی مەکەدۆنی بە ناوی بیونی (پردیکا– Perdika )، کە رەنگە یەکێک بووبێت لە فەرمانده باڵاکانی ئەسکەندەر، دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لەدواییدا ئەسکەندەر رۆیشت بۆ میدیاو سەردانی دەشتە بەناوبانگەکانی نیستای کرد، ئەو دەشتاییەی کە لەوەڕگەی هەزار ئەسپی لەشکری پاشا بوو. ئەو سەردەمە سەرکەوتنە سیاسی و شەڕە جیاجیاکانی ئەسکەندەر دەکرا بە جەژن و ئاهەنگێران، ئەترۆپات لەبڕی لەو ئاهەنگانەدا بەشداری دەکرد"[233].**

لە ساڵی (٣٢٣پ.ز) ئەسکەندەر مرد. ئەترۆپات لە ئەنجومەنی ئامادەکاریی فەرماندەکاندا، کە لە بابل بەسترا، بەشدار نەبوو، چونکە ئەو ئەنجومەنە تایبەت بوو بە فەرماندە باڵاکانی یۆنان. ئەنجومەن بڕیاری دا وڵاتی میدیا بە پردیکای مەکەدۆنی و زاوای ئەترۆپات بسپێرن. بە قسەی دیاکۆنۆف، ئەترۆپات وەک جێگری پردیکا لە دەوڵەتە تازەکەی میدیا رەفتاری دەکرد. هەر بەپێی قسەکانی دیاکۆنۆف، ئەنجومەن پردیکای ڕاسپارد تا وڵاتە ژێردەستەکانی یۆنان، لە ڕۆژهەڵاتی ئێران و ئاسیای ناوەڕاست بەڕێوە ببات.

بەرئەنجام میدیای دەوڵەمەند بە سەرچاوەکان و سوپا بەهێزەکەی گرینگی بەرچاو و تایبەتی خۆی هەبوو.

دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لەڕاستیدا هاوڕێیەتی میدییەکان و مەکەدۆنییەکان گرینگ و بەهادار بوو، چونکە (مەکەدۆنییەکان) ئەگەر دەسبەرداری زەویوزاری ماد بوونایە، ئەوا پەیوەندییان بە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتەوە دەبڕا"[234].**

---

(٢٣٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٦-٤١٧.

(٢٣٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٧. هیرۆدۆت ناوی دەشتاییەکەی (نیستا) بە شێوەی (نیسیا) بردووە. هیرۆدۆت، ل٢٨٦.

(٢٣٤) دیاکونوف: میدیا، ل٤٢٠.

ئەترۆپات، بە کەسێکی نێزیک لە مەکەدۆنییەکان دەژمێردرا. ساڵی (٣٢٣پ.ز) لەتەک ئەکسبارت (خەزوری ئەسکەندەر)، جگە لە مەکەدۆنی و یۆنانییەکان، لەناو هەموو فەرمانڕەواکاندا دوو فەرمانڕەوا بوون، کە پلەوپایەی خۆیان لەدەست نەدا. وادیارە ئەترۆپات تەنیا فەرمانڕەوایی میدیای بچووک بووە، لەکاتێکدا دەسەڵاتی پردیکای زاوای بەسەر میدیای گەورەدا دەڕۆشت، سیاسەتی واقیعبینانەی ئەترۆپات ڕێگەی پێ نەدەدا ببێتە بەشێک لە ململانێی نێوان فەرمانڕەواکانی مەکەدۆنی و یۆنانییەکان، بەشداریش نەبوو لەو دەمەقاڵێیە، کە بۆ دەستنیشانکردنی میراتگری ئەسکەندەر لەنێوان فەرماندە گریکیەکاندا هاتبووە ئاراوە "**ئەو سەربەخۆیی خۆی بەتەواوی پاراست**"[٢٣٥].

## ئەترۆپاتیای سەربەخۆ

دوای مردنی پردیکا لە ساڵی (٣٢١پ.ز)، سەرکردەکانی گریک کۆبوونەوەو جارێکی تر وڵات و هەرێمەکانیان دابەش کرد، بەڵام میدیای بچوک (ولایەتی ئەترۆپات) بەر دابەشکردنەکە نەکەوت. ئەترۆپات بەلێهاتوویی خۆی، وەک سیاسییەکی لێهاتوو، توانی سەربەخۆیی میدیای بچوک بپارێزێت. تەنانەت دیاکۆنۆف بەسەرسامییەوە دەپرسێت: "**ئەترۆپات چۆن بۆی کرا لەسەرەتای ئەو ڕۆژانەدا، کە لێوانلێو بوو لە ململانێ و شەڕی نێوان میراتگرو جێگرەوەکانی ئەسکەندەر، دەوڵەتی میدی سەربەخۆ دابمەزرێنێت؟!**"[٢٣٦].

دیاکۆنۆف، خۆی وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: "**بێگومان ئەترۆپات پیاوێکی بوێرو هۆشیار بووە، ئەگەر بارودۆخە ناوخۆییەکەی نێوان گەلە میدییەکان لەبار نەبووایەو سوپاکەی بەتوانا نەبووایە، هەرچەندە ژیرو زۆرزان بووایە، لەو کاتەدا نەیدەتوانی دەوڵەتێکی نوێی سەربەخۆ دابمەزرێنێت و بیپارێزێت**"[٢٣٧].

---

(٢٣٥) دیاکۆنۆف: میدیا، ل٤٢١-٤٢٢.

(٢٣٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤٢.

(٢٣٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دیاکۆنۆف، پەنجە بۆ سێ فاکتەری گرینگ درێژ دەکات، کە یارمەتیدەری مانەوەی میدیای بچوکی سەربەخۆ بووە. پێچەوانەی بەسەرهاتی میدیای مەزن (باشووری کوردستان و ڕۆژهەلات و بەشەکانی تری باشوری کوردستانی باکور):

**فاکتەری یەکەم:** میدیای بچوک دوور بوو لە دوو ڕێگە بازرگانییەکەو بۆ گەشتن بە ناوچە گرینگەکانی ڕۆژئاوای ئاسیاو ئاسیای ناوەڕاست، سوپا داگیرکەرەکان بەوێدا گوزەریان نەدەکرد، پێچەوانەی میدیای گەورە، کە ڕێگە سەرەکییەکانی بازرگانی بەناو خاکەکەیدا تێدەپەڕی، ئەمەش وای کردبوو بەردەوام چاوی هێزە ڕکابەرەکانی میراتگری ئەسکەندەری لەسەر بێت.

**فاکتەری دووەم:** بەپێی پێوەرەکانی ئەو ڕۆژگارە، میدیای بچوک بەشی خۆی شتومەکی ئابووری و پیشەسازی بەرهەم دەهێناو لە پیشەسازی و کاری دەستی ناوخۆیی پێویستی بە کەرەستەی خاوی دەرەوە نەبوو، ئەمەش پاڵنەرێکی گرینگ بوو تا خۆی لە ململانێ و هاوپەیمانێتی هەرێمایەتی بەدوور بگرێت.

**فاکتەری سێیەم:** بە ژیری و ردبینی خۆی ئەترۆپات کۆنترۆڵی هۆزە شوانکارەکانی میدیای بچوکی کردبوو، بۆیە ئەو هۆزانە بە هێزێکی گرینگی دەوڵەتەکەی دەژمێردرا. هێزێکی جەنگاوەری بەتوانا، کە تاکەکانی خۆبەخش بەشداری شەڕیان دەکردو سوپای ئەم دەوڵەتە جەنگاوەری بەزۆرگیراو و بەکرێگرتەی تیادا نەبوو، پێچەوانەی سوپای ئیمپراتورییەتی فارس و مەکەدۆنییەکان[٢٣٨].

شکۆو شانازییەکانی مەملەکەتی میدیای کەونار تا ئەودەمە لەبیرەوەری ئەترۆپاتدا هێشتا زیندوو بوو، ئەو دەکۆشا ئێستەی بە ڕابردووە پرسەروەرییەکەیەوە گرێ بدات، پێڕەوی لەو شارستانییەت و سیاسەتە دەکرد، کە سەرکردەکانی مەملەکەتی ماد دایانڕشتبوو. دیاکۆنۆف دەڵێت: "**ئەم مەملەکەتە نوێیە، کە بەفەرمی بە دەوڵەتی میدیا ناسرابوو، هاووڵاتییان بە (میدیای ئەترۆپات) یا (ئەترۆپاتیا) ناویان دەبرد.... ئەم دەوڵەتە نوێیە**

---

(٢٣٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٣.

**پەیڕەوی سیاسی و شارستانیی مادی سەردەمی کۆنی (دەیوک)ی پاراستبوو"[٢٣٩].**

ئێمە هیچ زانیارییەکی باوەڕپێکراومان بەرچاو نەکەوت، سەبارەت بە مێژووی مردنی ئەترۆپات، بە کەڵکوەرگرتن لە ڕیڕەوی ڕووداوەکان (ئەو) پاش ساڵی (٣٢٠پ.ز) مردووە.

## چارەنووسی نیشتمانی میدی

ڕاستە لە چەرخەکانی دواییدا میدیا وەک قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ، خۆی ڕانەگرت و کۆتایی پێ هات، بەڵام گەلی ماد بەسەر زەوی و خاکەکەی خۆیەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو باکورو باشور، بوونی خۆی پاراست و گوێڕایەڵی دەسەڵاتەکانی هاوسێی نەبوو، ئەم ئامادەگییە لە (کاردۆخییەکان)دا خۆی دەنوێنێت. لە کتێبی (ئەناباسیس- Anabasis - هەڵکشان)، کە فەیلەسوف و مێژوونووس و فەرماندەی یۆنانی، گەزنەفۆن (زەینەفۆن) نووسیویەتی ناویان هاتووە، لەو دەمەداو لە ساڵی (٤٠١پ.ز) ناکۆکی دەکەوێتە نێوان مەلیک ئەرتگزرسیسی دووەم، (ئەرتەحشەشتا/ ئەردەشێری دووەم)و کۆڕشی برایەوە، بۆیە کۆڕش هانا بۆ سوپایەکی بە کرێگیراوی یۆنانی دەبات و لەنێوان هەردوو برادا لە کونکاس لە بابل شەڕ بەرپا دەبێت و لەو شەڕەدا کۆڕش بە دەستی براکەی خۆی دەکوژرێت و جەنگاوەرە بە کرێگیراوەکانی یۆنان لەژێر فەرماندەیی گەزنەفۆن (ئەکسانۆفۆن)، کە لەنێوان ساڵانی (٤٣٠-٣٥٥پ.ز) ژیاوە[٢٤٠]، پاشەکشە دەکات.

بە کرێگیراوە یۆنانییەکان بەرەو باکور، ڕێگەیەکی دوورو درێژو سەخت دەگرنەبەر، بەنێو چیاکانی کوردستان و ئەرمەنستاندا ڕوو لە دەریای ڕەش دەکەن. گەزنەفۆن لە ڕووبەڕوونەوەی بەکرێگیراوەکانی یۆنان، باس لە سەرسەختی و شرەتیی کاردۆخییەکانی ناوچەی هەکاری دەکات. (باسیلی

---

(٢٣٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٣-٤٢٤.

(٢٤٠) دیاکونوف: میدیا، ل٣٦-٣٧. هـ.ج.ولز: معالم تاریخ الانسانیە، ٣١٦/٢.

نیکیتین) باس لەو کاردۆخییانە دەکات، کە گەزنەفۆن هێمای بۆ کردوون و دەڵێت: **"ئەوان جگە لە باوباپیرانی ڕاستەقینەی کورد کەسێکی تر نەبوون"**[241].

نیکیتین درێژە بە قسەکانی دەدات و یەژێت: **"جارێکی تر دەگەڕێینەوە لای کاردۆخییەکان، هەر وەکو باسمان کرد، ناکرێت بەگشتی پەیوەندییان بە کوردەوە بپچڕێنین، بەپێی بۆچوونەکەی زەینەفۆن، دەبێت بڵێین: کاردۆخییەکان ددانیان نە بە دەسەڵاتی پادشا ئەرتاکسبرکیس و نە بە دەسەڵاتی ئەرمەندا نەدەنا"**[242].

لە سەردەمی ئەخمینییەکانەوە تا بە ئەمڕۆمان دەکات، هیچ دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەتێک نەیتوانیوە حوکمی وڵاتی میدی بکات و ئەو هێزانەش، کە لە ڕۆژئاوای ئاسیادا لە ململانێدا بوونە، پێیان نەکراوە نە جوگرافیای ماد (کوردستانی ئەمڕۆ) نە گەلی ماد (کوردی ئەم سەردەمە) لە حیساباتی ستراتیجی خۆیان دەربکەن. بارودۆخی جیۆسیاسی پاڵی بە سەلجوقییەکان (میراتگری ئەسکەندەر)ەوە ناوە، نێزیک ساڵی (٣١١پ.ز) تا (٢٤٧پ.ز) کۆنترۆڵی وڵاتی مادیان کردووە. پارسەکان (ئەشگان) لە ساڵی (٢٥٠-٢٤٩پ.ز) هەمان شتیان کرد.

لە سەردەمی گەشەکردنی ئەرمەنی و لە دەمی فەرمانڕەوایی پاشا **دیگرانی دووەم** (دیگرانی گەورە، لە ساڵی ٥٥ یا ٥٤ پ.ز) مردووە ، میدیا بوو بە جوگرافیایەکی گرینگ و زیندووی مەملەکەتی ئەرمەن، ئیتر ئەم جوگرافیایە چ لە قەوقاز بوو بێت، لە باکورەوە یا لە باشور یا لە ڕۆژئاوا بوو بێت، چونکە پاشای ئەرمەنی نەیدەتوانی ئیمپراتۆرییەتەکەی ئاوا بکات و بگاتە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست، ئەگەر کۆنترۆڵی نیشتمانی مادی نەکردایە، تا کار گەشتە ئەو ڕادەیەی دووهەمین پایتەختی (دیگرانا کیرتا)ی

---

(٢٤١) باسیلی نیکیتین: الاکرد، ص٤٥.

(٢٤٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.

لەسەر جوگرافیای میدیا بونیات بنێت. (ئەرشاک سافراستیان) دەڵێت: **(فارقین/ میافارقین) هەمان دیگراناکیرتایە**[243].

لە چارەکی یەکەمی چەرخی یەکەمی پێش زاین، نیشتمانی میدی بووە بە گۆڕەپانی سەرەکی جەنگە سەخت و قورسەکانی نێوان سێ هێزی هەرێمایەتی گەورەی ئەو دەمە، کە ڕۆمان و ئەشگان (فرس/ پارس)و ئەرمەن بوون، فەرماندەی ڕۆمانی **بۆمبی** و پاش ئەویش سەرکردەی ڕۆمانی **لۆکۆلس** شاری (نەسیبین)ی کردە بنکەی سوپای ڕۆمانییەکان لە ڕۆژهەڵات[244]، ململانێکانی نێوان هەردوو سەربازگەی نەیارو دژبەیەک، ئەشگان و ئەرمەن- ڕۆمان و ماد زەق بووەوە.

لەو ململانێیەدا پاشای میدی **ئەردافست** (ئەردەوان) چووە پاڵ فەرماندەی ڕۆمانیی **ئەنتۆنیۆ**، ئەمەش بوو بە مایەی تووڕەبوونی دوو **هاوپەیمانەکە، فەرهادی چوارەمی** ئەشکانی و **ئەرداشیسی** دووهەمی ئەرمەنی -نەوەی دیگرانی گەورە، کە لەنێوان ساڵانی (٣٠-٢٠پ.ز) حوکمی کردووە- هەر بۆیە لەو ناوچەی کە دەکەوێتە نێوان تەوریزو هەمەدانەوە، پەلامارێکی دووقۆڵییان کردە سەر مادەکان، لەو پەلامارەدا ئەرداشیس، ئەردەوانی پاشای میدیی دەکوژێت، بەم کارەش پایەیەکی باڵای لە شانشینی ئەشگان بەر دەکەوێت، لە ساڵی (١-٢ز)، کە ڕۆمانەکان کۆنترۆڵی ئەرمەنستانیان کرد، فەرماندەیەکی ڕەگەز میدی بە ناوی (ئەریوبارزان)یان بۆ دەستنیشان کرد. پاش ئەویش لە ساڵی(٢-١١ز) فەرماندەیەکی تری میدی بە ناوی **(ئەردافستی پێنجەم)**یان بۆ دامەزراند.

لە ساڵی (٢٢٤-٢٢٦ز)، کە وڵاتی میدیا دەکەوێتە بندەستی فارسە ساسانییەکانەوە، ئیتر لەو دەمەوە دەنگوباسی مادەکان لەناواندا نامێنێت و لەناو دۆڵ و چیاکاندا گۆشەگیرو دوورەپەرێز دەوەستن و وردەوردە لەپشت پەردەی مێژووەوە بزر دەبن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ساسانییەکان بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو هەوڵی سڕینەوەی ئاسەواری مەملەکەتی ماد یان لە زاکیرەی گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیادا داوە. من وای بۆ دەچم بەرلە

---

(٢٤٣) مجموعه من الباحثين: كركوك، ص٣٨. أرشاك سافراستيان: الكرد وكردستان، ص٤٨.

(٢٤٤) مروان المدور: الارمن عبر التاريخ، ل ١٥٥، ١٥٦، ١٥٧.

هەر شتێکی تر پێداگرییان لەسەر هەڵکێشانی ڕەگوریشەی فەرهەنگی دێرینی مادەکان کردووەو بڕیاریان داوە، کە زەردەشتییەت بە نوسخە فارسییەکەی بکەنە ئاینی فەرمی دەوڵەت و گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیای پێوە پابەند بکەن، سەرەڕای ئەوانە هەر هەموو کورد (نەوەی ماد) لەم ولاتە مێژووییەی خۆیدا (کوردستانی تازە) توانی بوونی خۆی بپارێزێت و درێژە بە ژیان بدات.

لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا، تاوناتاوێک لێرەو لەوێ کورد میرنشین و دەوڵەتی سەربەخۆ لەناوخۆ و داخراو لە ڕواڵەتدا دامەزراندووە. یەکێک لەو دەوڵەتانەی کە لە سێبەری چەتری خەلافەتی عەباسیداو لە باشووری نیشتیمانی میدیی دامەزراوە، ساڵی (٣٣٠-٤٠٥ ک) لە هەمەدان (ئەگباتانای کۆن) ، دەوڵەتی حەسنەوییەی بەرزەکانی بووە.

لە باکوری ولاتی ماد حکومەتی ڕەوادییەکان لە ئازەربایجان و لە ساڵی (٢٣٠-٦١٨ک)و حکومەتی شەددادەییە لە ئاڕان (٣٤٠-٤٦٥ک) بووە. ئاڕان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دابەش بووە بەسەر ئازەربایجان و جۆرجیاو ئەرمەنستاندا، لە شارە ناسراوەکانی ئەو دەوڵەتە شاری نەخجوان، تەفلیس و کەرەباغ، کە ئەمەی دوایی ئازەربایجان و ئەرمەنستان لەسەری کەوتنە ململانێوەو تا لە ساڵی (١٩٩١ز) ئەرمەنستان کۆنترۆڵی کردو کۆماری (ناگورنۆ کەرەباغ)ی لێ دامەزرا.

بەڵام لە باکوری ڕۆژئاوای ماد (باکوری کوردستان) دەوڵەتی دۆستەکی (مەروانی) لەنێوان ساڵانی (٣٥٠-٤٧٨ک) دامەزرا. ئەودەم دەوڵەتی ڕوادی و شەددادی و دۆستەکی بە بەرەیەکی داکۆکیکارو پشتگیری ولاتی موسڵواتان هەژمار دەکران دژ بە هێرش و پەلاماری مەسیحی، کە لە باکورەوە لە قەوقازو لە ڕۆژئاواوە لە دەوڵەتی بیزەنتەوە دەهاتن، ڕادەوەستانەوە. ئەم بەرگرییەشیان لەبەر ئەوە نەبوو، کە باوباپیرانی کورد ئاشقی ململانێ ئاینییەکان بوون، نەخێر، بگرە ئەوسەردەمە ئایدۆلۆژییەتی ئاینی لەپشت شەڕەکانەوە بووە.

گەورەترین بەڵا لەسەر دەستی کۆچەرە تورانییە (تركەکان)، کە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە ڕوویان کردە ناوچەکە، بەسەر نیشتمانی میدیاو نەوەی

ماد(کورد)دا هات. له ساڵی (٤٢٩ک-١٠٣٧ز) کۆچەرە هێرشبەرەکانی (ئاوغوز) پەلاماریان دەست پێکردو له باکوری میدیاوە کورد توانی بەر بە هێرشەکانیان بگرێت و کوشتاری باشیان لێ بکات و ڕاویان بنێت، بەڵام زۆری نەخایاند سەلجوقییەکان جارێکی تر هێرشیان هێناو له ساڵی (٤٤٧ک-١٠٥٥ز) توانیان بچنە ناو شاری بەغداد. ئەودەمە، کە خەلیفەی عەباسییە سوننە مەزهەبەکان (ئەلقائیم بیئەمریللا) بۆ ڕزگاربوونی له چنگی بوەیهییە شیعە مەزهەبەکان، له ساڵی (٤٦٧ک) هانای بۆ بردن[٢٤٥]. زۆری نەبرد سەلجووقییەکان له هەر چوارلاوە بوون بە بەڵایەکی قورس بەسەر شانی کوردو نیشتمانەکەیەوە، ئەودەمە هەرچوار دەوڵەتە کوردییەکە دەسەپاچەو دەستەودامان بەرانبەر بە هێرش و پەلاماری سەلجووقییەکان ڕاوەستان، هۆی ئەم دەسەپاچەییەشیان تەنیاوتەنیا کاریگەریی سایکۆلۆجییەتی چیا بوو بەسەریانەوە، مەبەستم ملنەدان و بێگوێیی تاکی کورد بۆ ئەوی دی، کە کوردە. ئەم تایبەتمەندییەش له دڵ و دەروونی فەرمانڕەواکانی ئەو دەوڵەتە کوردییانە کاری خۆی کردو بووە هۆی لێکترازانی ڕیزەکانیان و پەرت و دابەشبوونی وزەو توانایان. هەر بۆیە یەک لەدوای یەک ئەو چوار دەوڵەتە کەوتنە بندەستی سەلجووقییەکان. ترسناکترین هەنگاوی سەلجوقییەکان نیشتەجێکردنی چڕی هۆزە ترکییەکان، له میدیای بچووک (ئازەربایجان) بوو، ئیتر سەلجووقییەکان کەشێکی وایان ڕەخساند تا زمانی تورکی و خەڵکی تورکی شیعە مەزهەب، زاڵ بێت و باڵ بکێشێت بەسەر زمان و کەسی کوردی سوننە مەزهەبدا، ئەمە و مەزهەبی شیعی ـ سەفەوی ڕۆڵێکی گرینگی گێڕا له گۆڕینی سرووشتی دیمۆگرافی میدی کۆندا.

له ساڵی (٦٩٩ک/ ١٢٩٩ز) تورکە عوسمانییەکان، لەبن عابای تورکە سەلجوقییەکان هاتنە دەرەوە و چالاکییەکانیان دەستدایە. پاش شەڕی چاڵدێران دەستیان بەسەر بارودۆخی ڕۆژئاوای ئاسیادا گرت. کاتێک سوڵتان **سەلیمی یەکەم** بەسەر شا **ئیسماعیلی سەفەوی** ـ دا، سەرکەوت بارودۆخی ناوچەکەی ئەودەم و ململانێی عوسمانی سوننە و فارسی شیعە مەزهەب

(٢٤٥) ابن الاثیر: الکامل فی التاریخ، ٩/٦٠٩.

وای خواست، که سەلیمی یەکەم دەست بەسەر میرنشینەکان و دەسەڵاتی دەرەبەگە کوردەکانی باکوری میدیادا بکێشیت، تا ببێتە بەربەست لەبەردەم دەوڵەتی سەفەویداو پیاوەکانی هۆزە میدییەکان هەردەم لە خزمەتی سوپای عوسمانی و شەڕەکانی دژ بە فارسە سەفەوییەکان بەکار بهێنرێن.

ململانێکانی نێوان عوسمانی و سەفەوی بەرەبەرە خاوبووەوە، تا ساڵی (١٠٤٩ ک /١٦٣٩ز) سوڵتانی عوسمانی **موورادی چوارەم** و **شا عەباسی سەفەویی** لەسەر رەنگرێژکردنەوەی سنوور رێکەوتن و رێکەوتننامەیەکیان بە ناوی (پەیمانی رێکخستنی سنوور) مۆر کرد، ئیتر رێگە لەبەردەم عوسمانییەکان خۆش بوو، تا کۆنترۆڵی ولاتی ماد بکەن.

پاشان سوڵتان **مەحمودی دووەم**، لە ساڵی (١٨٣٩ز) گورزێکی جەرگبڕی ئاراستەی نیشتمانی میدی کرد و میرنشین و دەسەڵاتە دەرەبەگایەتییە کوردییەکان، کە مافی ئۆتۆنۆمییان هەبوو، هەر هەموویانی هەڵوەشاندەوە و ولاتی میدیای لە باکور و باشور و رۆژئاواوە خستە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی عوسمانییەوەو هەردوولا عوسمانی و سەفەوی، رێکەوتنی ئەرزەڕوومی دووەمیان لە ساڵی (١٨٤٧ز) مۆر کرد و بەو پێیەش ولاتی مادیان دابەش کرد.

## (١٤)

## ماد لەڕووی کۆمەڵایەتی و شارستانییەوە

بەپێی بۆچوونی (ویل دیۆرانت) تەمەن کورتیی مەملەکەتی ماد لەمپەری بەردەم ئەو مەملەکەتە بوو لە بەشداری نەکردنی کارای شارستانییەتدا، بەڵام لەهەمان کاتدا هەر خۆی باس لە دەسکەوت و بەرهەمە شارستانییەکانی مادەکان دەکات، کە فارسەکان لێی زەوت کردوون‼ ئەو ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت، کە مەملەکەتی ماد ڕێگەی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری لەبەردەم وڵاتی فارسدا خۆش کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە لەم بوارەدا مادەکان کەمیان نەکردووە[٢٤٦].

بەهەرحاڵ، دەسکەوت و بەرهەمی کەمی میدییەکان تەنیا بۆ کورتی تەمەنی مەملەکەتەکە ناگەڕێتەوە، بگرە زۆرێک لەو دەسکەوتانەیانمان پێنەگەشتووە.

دیاکۆنۆف دەڵێت: "**سەرەڕای ئەوەی کە زانستی مێژووی ئەم سەردەمە بەڵگەی شوێنەوار و سەرچاوەی کۆنی لەبەردەست دایە، کەچی ڕووداوەکانی مێژووی مادەکان لەم دەسکەوتە زانستییە، پێچەوانەی ئەو دەوڵەت و وڵاتانەی کە هاوچەرخی ماد بوونە، هیچ کەڵکی لێ وەرنەگرتووە، ئەوەی کە خستمانە بەرچاو بۆ ئەوە بوو تا بڵێین: شوێنەواری شارستانی و شارەکانی**

---

(٢٤٦) دیاکونوف: میدیا، ص٣٧-١٧٧-١٧٨.

**میدییە دێرینەکان تا بەئەمڕۆمان دەگات لەبن وێرانەو قووڵایی زەویدا حەشاردراوە و هیچ دەقێکمان لەبەردەستدا نییە سەبارەت بە دەسەڵاتی میدییەکان تا بە ڕووداوەکانی دەوڵەتەکەیان ئاشنا ببین»[٢٤٧].**

لێرەوە چەند لایەنێک لە کۆمەڵگەی میدی و بەشداریکردنی دەوڵەتی ماد لەڕووی شارستانییەوە دەخەینە ڕوو.

### یەکەم: لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی

مێژوونووسان پێمان دەڵێن، کە کۆمەڵگەی میدی سرووشتێکی خێڵەکی هەبووەو کۆمەڵگەی میدیای ڕۆژئاوا لە کۆمەڵگەی ناوچە چیاییە ساردەکان پێشکەوتووتربووە. کۆمەڵگەی میدی لەسەر بناخەی بەهای جوامێری و کاری ڕاستی و ئاوەدانکردنەوە دامەزراوە، نەک لەسەر تەمبەڵی و تەوەزەلی و بەرەڵایی. سەرەڕای هەرەشە سیاسییە هەرێمایەتییەکان، جوگرافیای چیا پاڵنەری سەرەکی بووە تا تاکی میدی ئەم تایبەتمەندییانەی لەلا بەرجەستە بێت. سەرکردە مەزنەکانی (دەیاکۆ، خەشتریت و کەیخوسرۆ) و نموونەکانیان دەسپێشخەربوون تا ئەم ڕەوشت و بەهایانە لە ناخی کەسایەتی میدییەکاندا بنج دابکوتێ و نەوەکانی پێ پەروەردە بکرێت. هەر ئەم ڕەوشت و بەها ڕەسەن و دامەزراوەیە بوو، یارمەتی کۆمەڵگەی میدی دا، بەسەر گەورەترین و شرەتترین ئیمپراتۆرییەتی ڕۆژهەڵاتی ئەودەمە (ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور)دا، زاڵ بێت.

میدییەکان گرینگییان بە بەخێوکردنی ڕەشەوڵاخ و مەڕوماڵات و وشتری باکترییەی دووکۆپکە داوە. لەهەمان کاتدا گرینگییان بە بەخێوکردنی وڵاخی بەرز (ئەسپ و ماین) دەدا. وا دیارە وڵاخی بەرزەی مادەکان تایبەتمەندی باش و پەسەندی هەبووە، بۆیە ئاشوورییەکان لە جیاتی باج و خەراج ئەسپی لێ وەرگرتوون. ئەمەو لەچیاکاندا کشتوکاڵ بەربڵاو و پێشکەوتوو بووە.

---

(٢٤٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٤.

لەسەر ئاستی پێکهاتەی کۆمەڵگەی میدی ناوی (کارا- Kara)، کە واتای (جەنگاوەر) دەگەیەنێت، بە هاووڵاتییە ئازادە چەکدارەکان دەگوترا (کارا)، ئەوان بەشێکی گەورەو گرینگی کۆمەڵگەیان پێک دەهێنا[٢٤٨].

دەزانرێت لە زمانی کوردی هاوچەرخدا وشەی (کار- Kar) واتای کارکردن (ئیش) دەگەیەنێت. لەچەرخی شەشی پێش زاین، نازناوی (شۆڕشگێڕ) واتە (کار لە زمانی فارسی کۆندا) بەگشت هاووڵاتییە ئازادەکانی وڵاتی میدیا دەبەخشرا. ئەوان لەلایەنی فەرمی و مەدەنی و مافی یاساییەوە ئازدو سەربەخۆ بوونە. دیاکۆنۆف یەژێت: **"لەسەر دەستی ئەو شۆڕشگێڕانە ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری لەناوچوو و ئیمپراتۆرییەتی مادی بەهێز و مەزن بە هۆی پاڵپشتی ئەو شۆڕشگێڕانەوە دامەزرا"**[٢٥٠].

دیسان دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لە هەموو بارێکدا تەواو ئاشکرایە، کە مەبەست لە وشەی (کارا- Kara) تەنیا لەشکری بەردەوام و خزمەتی سەربازی ناگەیەنێت، بەپێی بۆچوونی هترتسفڵ و کەسانی تریش، تەنانەت بە تەنیا پیاوە خانەدانەکانی دەربارش ناگەیەنێت، بگرە بە هەموو هاووڵاتییە ئازادەکان دەگوترا"**[٢٥١].

(و.أ. یتورین) دەڵێت: لەلای فارس و مادەکان ناوی (کوورتەش- Kurtash) لە گرووپە کرێکارە جیاجیاکان دەنرا، واتە کرێکاری وەرشەکان (کارگەکان) ناویان لێ دەنرا (کوورتەش کینوشکی). واتە (کرێکارە تایبەتەکان) یان کارەکانیان سنووردار بووە، وەک (هەڵکۆڵینی بەردو مسگەری و...هی دی). دەبێ ئەوەش لەبەرچاوبگرین، کە (کوورتەش) وشەیەکی ئیلامییە و هاوتای وشەی (گردا- Grda)یە لە ئێرانی کۆندا، کە شوان و خاوەن پیشە تایبەتەکانی سەر بە توێژی (کوورتەش) بوون. ژن و پیاوی کوورتەشەکان نازناوی (پوهویتیی- مانیش) (ڕیزی لاوەکان)یان پێ دەدرا. ئەو کەسانەی سەر بەم

---

(٢٤٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٥.

(٢٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٥.

(٢٥١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٥.

توێژە بوون، هەر هەموویان هاوولاتی ئازادبوون و دیل و کۆیلەی تیا جێ نەدەبووەوە[٢٥٢].

دیاکۆنۆف باس لە گرینگی کار دەکات لە کۆمەڵگەی میدیداو دەڵێت: **"لە کۆمەڵگەی مادە دێرینەکاندا دەبووایە هەموو کەسی ئەو کۆمەڵگەیە شارەزایی باشی لە کاری جووتیاری و ڕەزوباخ و کشتوکاڵ بەگشتی هەبووایە، بەڵام گەورە پیاوانی ناو کۆمەڵگە دەبووایە شۆڕشگێربوونایە و لەهەمان کاتدا کاریشیان بکردایە، بەو هۆیەوە نەجیبزادەکان، کە توێژێکی باڵای ناو کۆمەڵگە بوون، دەبووایە کاریان بکردایە، لەهەمان کاتدا ئەم نەجیبزادانە جێگری پاشاو فەرماندەو سەرکردەی سوپاش بوون، واتە لە ڕووی کارکردن و بەرهەمهێنانەوە بەشێک بوون لە کۆمەڵگە"**[٢٥٣].

بەپێی لێکدانەوەی دیاکۆنۆف، هێزی میدیا لە بوونی پیاوە ئازادەکان (پیاوماقووڵان)دا خۆی دەبینییەوە، چونکە هێزێکی سەرەکییان پێک دەهێنا. ئەو دەڵێت: **"ڕێکەوت نەبووە، کە ئاشوورییەکان ناویان لە میدییەکان نابوو بەهێزەکان"**[٢٥٤].

دیاکۆنۆف دیسان دەڵێت: **"سەرباری ئەوەی کۆمەڵگەی میدی کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بووە و بەسەر دەوڵەمەندو خاوەن پلەدارەکاندا دابەش بووبوو، بەڵام ئەو دابەشکردنە نەگەشتبووە لووتکە و کۆمەڵگەیەک بوو تا ئەو دەمەش سیستەمی کۆیلایەتی تیادا بڵاونەبووبووەوەو گەندەڵی و بێسەروبەری تیادا سەری هەڵنەدابوو"**[٢٥٥].

---

(٢٥٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٥، ٣٠٦، ٣١٠.

(٢٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٣. بڕی هەڵەی زمانەوانی هەبوو ناچاربووین ڕاستیان بکەینەوە.

(٢٥٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٥.

(٢٥٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩.

### دووەم: لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری

سەبارەت بە زمانی میدی، زانیاری فرە کەم لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکاندا دزەیان کردووەو بەرچاو دەکەوێت. دیاکۆنۆف لەسەر زاری گەڕۆک و مێژووناس و جوگرافیناسی ڕۆمانی (سترابۆن - 64) (Strabonپ.ز - ١٩ز)، دەڵێت: "زمانی میدی و فارسی و باکتری، هاوشێوەی یەکن و زمانی ئیسکیت لە زمانی میدییەوە نێزیکە. بە قسەی دیاکۆنۆف، خشتە نووسراوەکانی بەردەستی، دووپاتی دەکەنەوە، کە پێوەندیی لەنێوان زمانی میدی و زمانی کتێبی پیرۆز (ئاویستا)ی زەردەشتییەت بوونی هەیە و لە زۆر ڕووەوە لەیەکەوە نێزیکن، بەڵام بەڕادەیەکی زۆر نا. ناشکرێت هەردووکیان بە یەک زمان ئەژمار بکرێن، کەچی زمانی میدی زمانێکی هاوبەشی نێوان گەلانی میدی بووە و ڕیشەی دەگەڕێتەوە سەر زمانی خێڵی ئەریزانت (ئاری زانت)، کە یەکێک بووە لە شەش خێڵە سەرەکییەکەی مادو کرا بە زمانی یەکگرتووی نەتەوەکانی ماد"[٢٥٦]. (هارفی بۆرتەر) دەڵێت: "**زمانی مادەکان لە زمانە ئارياييەکانە، واتە هیندۆئەوروپی و زۆر لە زمانەکانی سامی جیاوازە. بەپێی کتێبەکەیان زەندئاڤێستا، کە لە زمانی فارسەوە نێزیکە و جیاوازییەکی زۆر لەنێوانیاندا نییە، هەریەکەیان لە زمانی سەنسکریتی دەچن، کە زمانێکی کۆنی هیندییە. برێ لەو ناوانەی کە باس کراون لای ئێمە دەست دەکەون... ئایا نووسینیان هەبووە؟**

**تا ئێستە بەدڵنیاییەوە نازانرێت. دەشێت نووسینیان هەبوو بێت و نووسینە ئەسفینییەکانیان (مسماری) شێوەی نووسینی ئاشوورییەکان بووە، سی و حەوت پیت و بیست و حەوت دەنگی ڕیشەیی بووە**"[٢٥٧].

---

(٢٥٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٢،٢١٤،١٤٦،٧٢،٦٨.

(٢٥٧) هارفی بورتر: موسوعە مختصر التاريخ القديم ،ل٨٨-٨٩. زەند ئاڤيستا شيکرنەوەی ئاڤێستايەو خەتی ئەسفينی خەتی مێخی.

مێژوونووسانێک هەن پێ لەسەر مادبوونی کورد دادەگرن، بەڵگەشیان ئەوەیە کە **"لێکچوون لەنێوان زمانی کوردی و زمانی مادە کۆنەکاندا هەیە"**[258]. دیاکۆنۆف دەڵێت: **"زمانی مادەکان کاریگەریی لەسەر زمانی ئەدەبی فارسە ئەخمینییەکان داناوە"**[259]. سەبارەت بە کاریگەریی زمان و نووسین و شارستانییەتی مادەکان بەگشتی، کاریگەری لەسەر فارس و دەوڵەتی فارسی، دیورانت دەڵێت: **"فارسەکان زمانە ئارییاییەکەیان لە مادەکان وەرگرتووە، پیتەکانی سی و شەش پیت بووە، ئەوان فارسەکانیان فێر کرد تا لە نووسیندا خشتی قوڕین بە پێست و قەڵەم بگۆڕنەوە. مادەکان لە بونیاتنانی باڵەخانەکاندا بەشێوەیەکی بەربڵاو پایەیان بەکار دەهێناو هەر لەوانەوە یاسای ئەخلاقی فێربوون، کە ڕێنوێنییان دەکات لە کاتی ئاشتیدا دەستبڵاو و فرە خەرجی نەبن و هەر لەوانەوە فێری ئازایەتییەکی بێ وێنە بوون لە کاتی جەنگداو ئاشنابوون بە ئاینی زەردەشتی و خوداوەندی ئاهورامەزداو ئەهریمەن و سیستەمی باوکسالاری و فرەژنی لەناو خانەوادەدا، بڕێکی زۆری یاسای تر هەن، کە لەگەڵ یاساکانی ئیمپراتۆرییەتە درەنگ وەختەکەیاندا هاوشێوەی یەکن، ئەمەش وای لە دانیال کردووە تا وتە کاریگەرەکەی بڵێت: شەریعەتی فارسی و میدی، کە لەبەری ناگیرێتەوە (کۆپی ناکرێت)، بەڵام ئەدەب و هونەرەکەیان داری بەسەر بەردەوە نەما"**[260].

مێژووناسان دەڵێن: فارس خەتی مێخی لە میدەکان وەرگرتووە و زمانی میدی کاریگەریی زۆری بەسەر ئەدەبی فارسییەوە هەبووە، دیاکۆنۆف دەڵێت: **"لەڕووی مەعنەویی شارستانییەوە، دەبێت دان بەوەدا بنێین، کە لەمەڕ ڕادەی پێشکەوتنی شارستانی مادەوە، زانیاری کەم لەبەردەست دایە...خەتی مسماری لە وڵاتی مادیدا بەر لە هەزار ساڵ پێش زاین بوونی هەبووە...خەت و نووسینی ناسراوی ئەمڕۆ، کە بە خەت و نووسینی فارسی کۆن یا**

---

(٢٥٨) طه باقر وأخرون: تاريخ ايران القديم، ص٣٨.

(٢٥٩) دیاکونوف: میدیا، ص٣٥٣.

(٢٦٠) ول ديورانت: قصەالحضارە ٢/٤١٠. دانیال، پێغەمبەری عبرانی (ئیسرائیل)ە.

**ئەخمینییە دێرینەکان دەناسرێت، لە بناخەدا هەمان خەت و نووسینی مادەکانە و لە کەتواردا ڕەگوریشەی میدی هەیە"**[٢٦١].

شایەنی باسە؛ پاش ڕوخانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور لە ساڵی (٦١٢پ.ز)، سێ مەملەکەت لەڕووی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە، باڵی بەسەر ڕۆژئاوای ئاسیادا کێشا، ئەوانیش: مەملەکەتی ماد لە کوردستانی ئەم ڕۆژگارە و مەملەکەتی بابلی کلدانەکان لە عێراقی ئەمڕۆ و مەملەکەتی لیدیا لە ئاسیای بچووک (ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆ).

لە لاپەڕەکانی پێشوودا زانیمان، کە شەڕ لەنێوان مادەکان و لیدییەکاندا هەڵگیرساو بە هۆی پەنابردنی ئیسکیتە نەیارەکانی ماد، بۆ مەملەکەتی لیدیا، شەڕەکە ماوەی شەش ساڵ درێژەی کێشا، بەڵام ساڵی (٥٨٥پ.ز) هەردوولا لەسەر کۆتاییهێنان بە شەڕ ڕێکەوتن و لەوە بەدواوە ئاشتی و ئاسایش باڵی بەسەر ناوچەی ڕۆژئاوای ئاسیادا کێشاو جوڵەی بازرگانی گەشەی کرد. زیاد لە ئاماژەیەک هەیە پێمان دەڵێت: وڵاتی ماد لەو دەمەدا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو پێشکەوتن و گەشەسەندنەوە و وەک لانکەی ڕۆشنبیری و مەعریفە گەشەی کردووە. دیاکۆنۆف دەڵێت: **"دەبێت ئەوە بزانین، کە لەنێوان چەرخی حەوت و شەشی پێش زاین وڵاتی ماد ببوو بە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی ئاگایی ئاینی و فەلسەفی"**[٢٦٢].

### سێیەم: لەسەر ئاستی کارگێڕی

پێوەست بە دامودەزگەی بەڕێوەبردن لە مەملەکەتی ماد، سەرچاوەی زانیاری مێژوویی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام لە لاپەڕەکانی پێشوودا بینیمان، کە دەیاکۆ، پێشەوای میدییەکان بەردی بناخەی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی لە وڵاتی ماد داناوە و کۆمەڵگەی مادەکانی لە (دەوڵەت ـ خێڵ) گواستەوە بۆ قۆناخی (دەوڵەت ـ نەتەوە). ئەوە بوو فەرمانی بونیاتنانی

---

(٢٦١) دیاکونوف: میدیا، ص٣٤٩.

(٢٦٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٧.

پایەختی بۆ دەوڵەتەکەی دەرکرد. هەروەها کۆمەڵێک تەشریعات و یاسای دەرکرد بۆ ڕێکخستنی پێوندییەکانی دەوڵەتە نوێیەکەی، چ لە ئاست ڕێکخستنی پێوەندیی نێوان دەوڵەت و جەماوەر یاخۆ لەنێوان خودی جەماوەر خۆیدا.

بێگومان دامودزگە کارگێڕییەکان هەموو بوارەکانی دەوڵەت لە ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و سەربازیدا لەخۆ دەگرێت، لۆجیکی مێژوو پێمان دەڵێت، کە فیکری ئیداری لە مەملەکەتی ماد پێبەپێ و لەگەڵ ڕۆژدا پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوەو پتر بنج و بناوانی داکوتاوەو هەمەجۆرو کاریگەر بووە، بەتایبەتی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی فراوورت و کەیخوسرۆدا، گەروا نەبوویێت ئەی چۆن لەسەردەمی فەرمانڕەوایی کەیخوسرۆدا مەملەکەتی ماد توانیویەتی ڕووبەڕووی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بێتەوە، ئەو ئیمپراتۆرییەتەی کە خاوەن دامودەزگەی دێرینی ئیداری بووە؟ گەروا نەبوویێت ئەی چۆن دەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێت و بیڕوخێنێت؟ ئایا دەوڵەتێک پێی دەکرێت بەسەر ئیمپراتۆرییەتێکی پێشکەوتوو لە ئاستی فکری و ئیداری و خاوەن ڕێکخراو و یەکەی ئیداری پتەودا زاڵ بێت، گەر خۆی لەو ئاستە باڵایەدا نەبوویێت؟ سەرەڕای ئەمانە هەموو، دەبێت بپرسین: ئایا پاشاکانی ماد دەیانتوانی لەنێوان ساڵانی (٦١٢-٥٥٠ پ.ز)، واتە بۆ زیاتر لە نیو سەدە ئیمپراتۆرییەتێکی پانوبەرین بەڕێوە بەرن ئەگەر دامودەزگەیەکی کارگێڕی پێشکەوتووی بۆ ڕێکخستنی پێوەندییەکان و ڕاپەڕاندنی کاروبارو چارەسەرکردنی گرفتەکانی ناوخۆ و دەرەوە شک نەبردایە؟

دیاکۆنۆف، دەڵێت: **"دەشێت دامەزراوە ئیدارییەکانی ئیمپراتۆرییەتی ماد هەمان دامەزراوە ئیدارییەکانی ئاشوور و ئۆراتۆ بوویێت، بەڵام زۆر ڕێکخراوتر و پێشکەوتووتر لە هی ئەو دوو مەملەکەتەی کە ناومان هێنان. پاشان فارسەکان هەمان سیستەمە ئیدارییەکەی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی مادی مەزنیان پێڕەو کردووە"**(٢٦٣).

---

(٢٦٣) جمال رشيد أحمد: ظهور الكورد في التاريخ، ٢٨١/٢.

سەبارەت بە توانای سیستەمی کارگێڕی لە مەملەکەتی ماد، دکتۆر (جەمال ڕەشید ئەحمەد)، دەڵێت: ج. هەرمانتا-Harmatta لە حەفتاکانی چەرخی بیست، دەستی بەسەر مەبنای کارگێڕی مەملەکەتی مادا هێنا و ڕاستی کردۆتەوەو لەکتێبەکەیدا بەناونیشانی (The Rise of Old Persian Empire Cteas) سیستەمی ئیمپراتۆرییەتی مادی لە ئاستێکی باڵای مێژوویيدا پەسەند کردووە و بە پشتبەستن بە سێ مێتۆد، بڕێ تەمومژی لەسەر ئەم بابەتە ڕەواندۆتەوە، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

١. خواستنی زاراوە میدییەکانی پێوەست بە بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەن ئەخمینییەکانەوە.

٢. ئەخمینییەکان، بەپێی پەیکەری ڕێکخستنی کارگێڕی مادەکان بەردەوامییان بە کارەکانیان داوە.

٣. بەپێی ئەو دوو خاڵەی سەرەوە پێکهاتەی حوکمڕانی بەردەوام بووە.

**چوارەم: لەسەر ئاستی سەربازی**

ئەوانەی لەبارەی ئاشوورییەکان نووسیویانە، گەواهی بەهێزی سوپای ئاشووریی و ئاستی باڵای جەنگی سوپاکەیان داوە، بەراورد بە دراوسێکانی، بە ژمارەیەکی کەمی جەنگاوەرەوە، ئەگەر سوپاکەیان لەو ئاستە باڵایەدا نەبووایە نەیان دەتوانی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەو بەرفرەوان دابمەزرێنن، کە ڕۆژهەڵاتی لە قووڵایی خاکی ئێرانی ئەمڕۆ و ڕۆژئاوایشی لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوینەوە دەستی پێدەکرد تا دەگەیشتە میسر، لە باکووریشەوە قەوقازیای دەگرتەوە، لە باشووریشەوە تا کەنداوی فارس پەلی دەکوتا.

تێکشکاندنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور بەدەست و مەچەکی سوپای میدی هاتە دی. سوپایەک گەر لە سوپای ئاشوور بەهێزتر نەبووبێت ئەوا بێگومان لە ئاست ئەودا بووە. گومانی تیادا نییە ئەگەر کۆمەڵگەیەکی خاوەن پرۆژەی نیشتمانی، نەتەوەیی، ئاینی یەکگرتوو نەبێت، ئەوا کۆمەڵگەیەکی شپرزە و پەرتوبڵاو، ناتوانێ سوپایەکی بەهێز بەرهەم بهێنێت.

ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، کە ئەوە کۆمەڵگەی بەهێز و پڕ بەهای میدی بوو توانی سوپایەکی نموونەیی لەو شێوەیە بهێنێتە بوون. پاشاکانی فارسە ئەخمینییەکان لە هەموو کەس پتر درکیان بەتوانای سەربازیی میدییەکان دەکرد. بۆیە لە شەڕو داگیرکارییەکاندا پشتیان پێ دەبەستن. دیاکۆنۆف سەرچاوەی هێزو کاریگەری سوپای ماد بۆ خۆبەخشی جەنگاوەرەکان دەگەڕێنێتەوە[٢٦٤].

ئاشکرایە لە دڵسۆزی و ڕادەی قوربانیداندا جیاوازی گەورە هەیە لەنێوان جەنگاوەری خۆبەخش و جەنگاوەری بەزۆرگیراو کرێگرتەدا. دیاکۆنۆف لەمەڕ فاکتەری بەهێزبوونی سوپای ماد دەدوێت و دەڵێت: **"ئەو سوپایە، کە بۆ یەکەم جار لەسەر بناخەی دەوڵەتێکی یەکگرتوو دامەزرابوو، پێویست بوو تاکەکانی ئەو سوپایە هەست بە یەکرێزییەکی تەواو بکەن، لەهەمان کاتدا هەست بە پێویستی سوپایەک بکەن، کە لە پێناو ڕزگارکردنی نیشتمان و هاوولاتیاندا دامەزراوە"**[٢٦٥].

لە دەقێکی بابلیدا ناوی پاشای میدی کەیخوسرۆ (کەی ئەخسار) بە پاشای (ئوومان ماندا- Ummanmanada) هێزە تۆقێنەرەکە هاتووە. دیاکۆنۆف **یەژێت: "لەدوا ڕۆژەکاندا، بابلییەکان نازناوی (ئومان- ماندا)یان دەدایە پاڵ میدییەکان و هەموو گەلانی باکور (مەبەست لێرە باکوری بابلە)"**[٢٦٦].

مەبەستیش لە گەلانی باکور هەموو ئەو هۆزانەن، کە لە چیاکانی کوردستان نیشتەجێبوون و سەر بەیەک بنەچەبوون، پاشان لەسایەی مەملەکەتی ماددا لە یەکەیەکی نەتەوەییدا یەکیان گرتەوە، ئەو یەکەیەش نەتەوەی کوردە.

لەناو هەموو گەلاندا سوپای ماد بە چەک و چواڵییەوە ناسرابوو. لەبەراییدا زانیمان؛ کاتێک فارس دەستی بەسەر مەملەکەتی ماددا گرت، هێزە جەنگاوەرەکانی مادی لە شەڕی ئیمپراتۆرییەتەکەی خۆیدا بەکار دەهێنا،

---

(٢٦٤) دیاکونوف: میدیا، ص٢٧٩،١٨٥.

(٢٦٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩،١٨٥.

(٢٦٦) دیاکونوف: میدیا، ل٨٣. هدیب غزالە: الدولە البابلیە الحدیثە، ل٦٣.

نموونەش تیپی سرنجین بوو لەناو سوپای ئەحشەویرەش (خەشیارشاه) کوڕی دارای یەکەم. ئەم تیپە، کە لە ساڵی (٤٨٠پ.ز) بەرەو وڵاتی یۆنان کشا، چەکەکانی تیروکەوان و ڕمی میدی بوو[٢٦٧]، هەروەها جەنگاوەرە میدییەکان هێزێکی کاریگەری ناو سوپای فارس بوون. گرینگییان بە پلەی دووهەم پاش تیپی (خالدییەکان)ی فارس دەهات، ئەمەش وای کرد فارسەکان لە شەڕە قورس و سەخت و یەکلاکەرەوەکاندا سوودیان لێ ببینن.

نموونەش لەم بوارەدا ئەوە بوو، ئەو کاتەی ئەحشویرەش لەڕێگەی مەکەدۆنیاوە سوپاکەی بەرەو یۆنان ئاراستە کرد، گریکەکان لە ڕێڕەوی بیلای بەرپەرچیان دایەوەو بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ سوپاکەیان ڕاگرت. ئەحشەویرەش تورە بوو **"میدییەکان و کسیسیانەکانی ئاراستەکردن تا دەسگیریان بکەن و بەزیندوویی بۆی بهێنن"[٢٦٨]**.

هەروەها ساڵی (٤٧٩پ.ز) لە یۆنان لە شەڕی (Platea) فەرماندە ماردووس هێزی خالدینەکانی ڕووبەڕووی لاکیدیمونەکان کردەوە، لە قوڵی ڕاستەوە هێزی مادەکانی بەرەو ڕووی کۆرنتی و ئەرخەمینوس و سیکیونەکان کردەوە. هیرۆدۆت دەڵێت، کە ئەحشەویرەش لە یۆنانەوە بەرەو فارس گەڕایەوە ماردونیوس سەرکردایەتی ئەو سوپایەی کرد، کە خۆی دەستنیشانی کرد، تا لە بەهاری داهاتوودا پەلامارێکی نوێ بکاتە سەر گریکەکان **"خۆی ئەو هێزەی هەڵبژارد، کە سەرکردایەتیی دەکرد... فارسەکان بە ملوانکەو بازوبەندی مەچەکیانەوە ئەو سوپایەیان پێک دەهێنا، پاش ئەوان میدییەکان دەهاتن. لەڕاستیدا لە ژمارەدا کەمتر نەبوون، بەڵام لەوان ئازاترو بوێرتر نەبوون"[٢٦٩]**.

ئێمە وای بۆ دەچین ئەگەر جەنگاوەرە مادەکان لە سایەی دەسەڵاتی خۆیاندا بوونایەو بەرگرییان لە وڵات و نیشتمانی خۆیان کردبا، ئەوا لەڕووی بوێرییەوە هیچیان لەوان کەمتر نەدەبوو. دیاکۆنۆف سەبارەت بە بوێری و

---

(٢٦٧) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ل٥١٧.

(٢٦٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥١٧.

(٢٦٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٧.

چاوەنترسی جەنگاوەرە مادەکان دەڵێت: "**بەلای فارس و سکایەکانەوە، مادەکان بە ئازایەتی ناسرابوون و پشتیان پێ دەبەسترا. ئەوان هێزێکی دەسوەشێن و کاریگەریی سەرەکی بوون لەناو سوپای خەشیار شادا**"[٢٧٠].

گرینگی ئەسپ و سوارە، لە شەڕە دێرینەکاندا پشتگوێ ناخرێت. چەکی سوارە، کاریگەرترین هێزی یەکلاکەرەوەی شەڕەکان بووە. دیارە مادەکانیش لەبواری ئەسپی ڕەسەندا دەوڵەمەند بوون و ئەسپی میدی لە دنیای کۆندا پەنجەی گەواهی بۆ درێژ دەکرا، دیاکۆنۆف لەم بارەوە دەڵێت: "**ئەو بەرزە ولاخەی (ئەسپ و ماین)، کە لەسەر خاک و زەوی مادەکان بەخێو دەکرا زۆر بە ناوبانگ بوو و ئاشوورییەکان لەبری باج و خەراج تەنیا ولاخی بەرزەیان وەردەگرت** "[٢٧١].

بەپێی قسەی هیرۆدۆت ئەسپی مادەکان بە (نیسابین) ناوبانگی دەرکردبوو. ڕەنگە ئەم ناولێنانەش لە دەشتاییەکانی (نیسیا) یا (نیسییان)ی ولاتی مادەوە هاتبێت. ئەو دەشتاییەی کە نایابترین ئەسپ و ماینی تێدا بەخێو دەکراو بە پیرۆز پەسن دەکرا. لەوانەیە ئەم پیرۆزییە بەهۆی ڕەنگە سپییەکەیەوە بووبێت، چونکە ڕەنگی سپی، ڕەنگی نوورە، کە لە میتۆلۆژیای مادەکاندا زۆر گرینگە"[٢٧٢].

لە پیاهەڵدانی کەژاوەکەی ئەحشەویرەشی پاشای فارس، کاتێک لە ساڵی (٤٨٠پ.ز) لە (سارديس)ی پایتەختی مەملەکەتی لیدیاوە بەرەوە دەردەنیل چوو، تا لەوێوە بپەڕێتەوە بەرەو ئەورووپا و یۆنان داگیر بکات، هیرۆدۆت دەنووسێت: "**هەزار ئەسپسوار، کە لە هەموو ولاتی فارس هەڵبژێردرابوون پێشی کەوتبوون، بەدوایاندا هەزار جەنگاوەری ڕمبەدەست، کە چەکەکانیان سەراوژێر هەڵگرتبوو، پاشان دە دانە ئەسپی پیرۆز، کە بە نیسیان بە ناوبانگ بوون و لەوپەڕی قەشەنگیدا بوون، ئەم ئەسپی نیسیانە بە ناوی دەشتایی نیسیانی ولاتی مادەکان ناسرابوو، کە ئەسپی بێ وێنە و نایابی تێدا بەخێو**

---

(٢٧٠) دیاکونوف: میدیا، ص٤١٢.

(٢٧١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.

(٢٧٢) هیرودوت: تاریخ هیرودوت، ٢٦٨.

**دەکرا، پاشان ئەسپی چەرخە (عارەبانە) زیوسی پیرۆز دەهات[٢٧٣]، کە هەشت ئەسپی سپی رای دەکێشا... پاش ئەوە، کەژاوەی پاشا دەهات، کە چەرخەیەک بوو ئەسپی نیسیانە رای دەکێشا".[٢٧٤]**

## پێنجەم: لەسەر ئاستی ئاینی

**ئاینی بەربلاوی کۆمەڵگەی میدی ـ لەبڕێ پێکهاتەیدا ـ هاوشێوەی ئاینە بەربلاوەکانی دیکەی کۆمەڵگە بەراییەکانی کورد، بەتایبەتی و کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا بەگشتی بووە. ئاشکرایە ئەو ئاینانەش بە توخمی میتۆلۆژییە سەرەتاییەکان دەوڵەمەند بوونە. ئەو توخمانەی کە لەسەر بناخەی فرەخواوەندی نێرو مێ و پێوەستکردنی بە دیاردەی (خۆر، مانگ، ئاو، کەشوهەوا و...هتد)، سەرەڕای بڕێک لە بونیادی ڕۆحانی و تەوتەم، لەسەر دابەشکردنی ئەرکە گەردوونی و مرۆڤاییەتەکان لەنێوان خۆیاندا بەندە".[٢٧٥]**

---

(٢٧٣) زیوس – Zeus گەورەترین خواوەندی کۆڕی خواوەندان بوو لە یۆنان. ئەم ناوەشی لە شێوەی (دیوس ـ Dyaus) خواوەندی خێری ئاسمان وەرگیراوە، هەمان (دیاوس بیتر ـ Diyvuh pitar) خواوەندی ڕۆحانی و (تاوس)ی ئێزدییە. ئەم شێوەش لەبنەچەدا ئارییە (دەیو ـ Dew/Daiw) خواوەندی گەورە لە کولتووری میتۆلۆجی ئاریانیدا. زەردەشت لە (ئاڤێستا)ی پیرۆزدا، بە شەیتانی داناوە و پەرستنی قەدەغە کردووە. لە زمانی پەهلەویدا ئەم ناوە بە شێوەی (Dev) هاتووە، کە ئەمڕۆ بە (دێو) واتە (گەورە جنۆکە) گۆدەکرێ.

لە دەقێکی هیرۆدۆتدا مەبەستی لە (زیوس) (ئارەبانەی پیرۆزە)، چونکە موغەکان (پیاوانی ئاینی زەردەشتی) لە پەلامارەکانی ئەحشەویرەش بۆ سەر وڵاتی یۆنان، هاوڕێیەتییان دەکرد، لە دیاردە بەرچاوەکانی نووسینەکانی هیرۆدۆت ئەوەیە، کە ناوی خواوەندەکانی یۆنان دەداتە پاڵ هاوشێوەکانی خواوەندی گەلانی دی. جفری باریندر: المعتقدات لدی الشعوب، ص٦٦. خلیل جندی: الازدیە والامتحان الصعب، ص٧١،٧٠.

(٢٧٤) هیرودوت: تاریخ هیرودت، ل٥٠٨.

(٢٧٥) تەوتەم - Totemism لە وشەی (ئوت- ئوتیم) Ot–otem هاتووە، بیروباوەڕێکە مرۆڤ بە بەشێکی دانەبڕاوی دادەنێت لەسروشتدا. تەوتەم لە شێوەی ئاژەڵ یاخۆ گیا و گوڵە، کە وێنای بڕێ سیفاتی دیاری گرووپە مرۆڤگەلێکی دەستنیشانکراو دەکات و گرووپەکە دەیپارێزێت و خەڵکەکەی دەیپەرستن. مرۆڤە بەراییەکان و بنەی تەوتەمەکەیان وەک ئاڵای ئابڕوو (شەرەف) لەسەر چادر و ڕەشماڵ دەکێشا و لەسەر گوند و گڵکۆکانیان بەسەر کوڵەگەیەکەوە هەڵیان دەکرد.

**لەڕاستیدا سەبارەت بە ئاینی کۆمەڵگەی میدی وەک زانیارییەکانی تری بوارە جیاجیاکان، زانیاریی کەم لەبەردەستدا هەیە، بۆیە ناتوانین وەک پێویست بە توخم و پێکهاتە تایبەتییەکانی بیروباوەڕی مادەکان ئاشنا بین.**

**لەبواری ئایندا دوو خاڵ هەیە، کە دەکرێ پشتی پێببەستین، ئەوانیش: موغە و زەردەشتە.**

**موغە: موغەکان لە کۆمەڵگەی مادەکاندا پیاوانی ئاینی بوون. ئەوان چینێکی فەرمی پیاوە ئاینییەکان بوون و سەرپەرشتی کەشە ئاینییەکانیان دەکرد. ئەم چینە سەر بەخێڵی ماغویی (ماگی ـ Magoi) شەش هۆزەکەی مادە. وا دەردەکەوێت بەڕێوەبردنی کاروباری ئاینی تایبەت بووە بەم هۆزە. ئەم هۆزە (ماغی) هاوشێوەی خێڵی (لاوی)ی عیبرانییەکان (جووەکان)ە، کە هۆزی موسا پێغەمبەر بووەو تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبردنی ئاین لە ئەستۆیاندا بووە، هاوشێوەی خێڵ (قبیلە)ی قورەیشی عارەبی لە مەککەدا، کە پێغەمبەری ئیسلام، محەمەدی کوڕی عەبدوڵا، سەر بەو هۆزە بووە.**

**بەپێی قسەی دیاکۆنۆف، موغەکان باڵاپۆشێکیان دەپۆشی، کە قۆڵەکانی هەڵنەدەکێشراو بەسەر هەردوو لای شانیاندا شۆڕ دەبووەوە، ئەمەش ئەو عابایەمان بیر دەخاتەوە، کە سەرۆکی ئەفغانی حەمید کەرەزایی دەی دا بەسەرشانیدا و چەند هێڵێکی سەوزی تیادایە و دوو قۆڵی درێژی هەیە، کە بەملاوئەولادا شۆڕدەبێتەوە و قۆڵەکانی تێهەڵ ناکێشێت.**

**ئاشکرایە بانگەشەی زەردەشت لە شاری بەڵخ پێشوازییەکی باشی لێ کرا. شاری بەڵخ دەکەوێتە باکوری ئەفغانستانەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە**

---

**ڕۆحیانەت Animism یان (زیندوو) ئەو باوەڕەیە، کە ڕۆح بە سەرچاوەی گشت شێوەکانی مادە دەزانێت و ڕۆح نیشتەجێی گشت دیمەنەکانی سرووشتە. ئەم ڕۆحە کاریگەری لەسەر ژیانی مرۆڤ وئاژەڵ هەیە، هەموو ڕووداوەکان بە لۆژیکی (ڕۆحە خێرخواز) و (ڕۆحە شەرخوازەکان) لێکی دەدەنەوە و ئەمەی دواییان لەسەر ژیان و چارەنووسی مرۆڤەکاندا ڕۆڵ دەبینێت. مرۆڤە بەراییەکان لە ڕێگەی نوێژکردن و قوربانییەوە وەدەریان دەنا. (فروید، الطوطم والتابو، ص٢٣-٢٥-٩٧-١٠٠- ١٢٤- ١٢٥. م. رونتال: الموسوعە الفلسفیە، ص٢٠-٢٧٨،٢١).**

وڵاتی ئەفغانستان یەکەم وڵات بووە ئاینی زەردەشتیی و نەریتی موغەکانی تیادا بڵاو بووەتەوە[٢٧٦].

بەو پێیەی لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەخمینییەکاندا و لە نێوان ساڵانی (٥٥٠-٣٣٠پ.ز) ئاشنایەتییەک لەڕووی سیاسییەوە لەنێوان یۆنان و فارسدا هاتە ئاراوە. مێژوونووسە یۆنانییەکان - پێش هەموویان هیرۆدۆت - زۆرترین قسەی لەسەر میدییەکان کردووە، ناوی موغی بە (Magos ) گۆ کردووە و نووسیویەتی، هەربۆیە شێوەی (مەجوس) لە ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوای ئاسیادا بەگشتیی ناوبانگی دەرکرد و هەر ئەم ناوەش خۆی خزاندە ناو ڕۆشنبیریی عارەبەوە، تەنانەت هەر ئاینێک لە ئاینەکانی ماد و فارسەکان بە (مەجوسییەت) دەناسرایەوە، بۆیە مێژوونووسە موسڵمانەکان بە زەردەشتی پێغەمبەریان دەگوت (پێغەمبەری مەجووس). مەقدیسی دەڵێت: **"لە سەردەمی دەسەڵاتی کوشتاسبی کوڕی کیلهسراسب، پێغەمبەری مەجووسی زەردەشت بەدەرکەوت و داوای لە خەڵک کرد بچنە سەر ئاینی مەجووس"[٢٧٧].**

ئێستە دەبێت بپرسین: ئەو ئاینە کامە بوو، کە موغەکان پێڕەویان دەکرد؟

بۆ ئەوەی بە ئاینی مادەکان ئاشنابین دەبێت باس لە ئاینەکانی گەلانی ئاریایی بکەین. ئاینی ئارییەکان لەسەر پەرستنی هێزی سرووشت و ڕەگەزو هەسارەکانی ئاسمان دامەزرابوو. لەو ئاینەدا خواوەند (ئاهورات)ی زۆر بوونی هەبوو. ئاینیش سیفەتێکی چینایەتی لەخۆ نەدەگرت، بگرە بۆ هەموو چینەکانی کۆمەڵگە بوو، جونکە لە قۆناخی کۆمۆنەی سەرەتاییدا (چین بوونی نەبووە، بۆیە گرینگی (ئاهورامەزدا) (خودای خێر، خودای ڕۆشنایی) و (ئاهورئامن) ئەهریمەن، خواوەندی شەڕ، خواوەندی تاریکی لەناو خوداوەندکاندا بوونی نەبووە، بەڵام لە سەردەمی گواستنەوەی کۆمەڵگەی ئاریایی لەباری کوچەری و ڕەشماڵنشینییەوە بۆ قۆناخی نیشتەجێبوون، برێ کاری دەستی فێربوون، ئیتر پێگەی خواوەند (ئەمەزدا) دەرکەوت. بۆیە ناوی

---

(٢٧٦) دیاکونوف: میدیا، ص٣٨٣.

(٢٧٧) جفری بارند: المعتقدات الدينيه لدى الشعوب، ص١٣١. المقدسي البدء و التاريخ ،١٤٩/٣.

(مەزدیی) لە ئاینە کۆنەکان نرا. جا چونکە موغەکانی مەجووس خەریکی ڕاپەڕاندنی کاری ئاینی بوون، بۆیە ناوی (مەجوس) لە ئاینی مەزدایی نرا[٢٧٨].

بەڵام **زەردەشتییەت** لە ناوەڕۆک و گەوهەردا بزوتنەوەیەکی چاکسازی بوو لە ئاینی مەزدیی، لە پێناو پێشخستن و گواستنەوەی بو مەزدایی نوێ، کە زەردەشت پێغەمبەر بەشێوەیەکی وا دایڕشتەوە لەتەک باروخواستی ماریفەت و سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئابووریی نوێ لە وڵاتی مادا بەتایبەتی و لە ئاریانا (نیشتمانی ئارییە ڕۆژهەڵاتییەکاندا) بەگشتی بگونجێت. بەڵگەی زۆر هەیە، کە زەردەشتییەت لە خێزان و ڕەگەزی ئاینی مەزدایی بووە، بۆنموونە خواوەندی مەزن و تاک و تەنیا (مەزدا/ ئەمەزدا)، کە ناوی ئاینەکەی (مەزدا یەسنا) بوو لە ئاینی زەردەشتیدا پێگەی خۆی بەناوی (ئەهورامەزدا – Ahura mazda ) خواوەندی ڕۆشنایی و خێر، پاراست. لەم بوارەدا زەردەشت شتێکی نوێی خستەسەر. بەبڕوای ئەو هێزشێکی پیس و چەپەڵ بوونی هەیەو ناوی لێنا ئەهریمەن (ئەهور ئەمن/ ئەنگراماینویو)، کە لەجیهاندا شەڕ بڵاو دەکاتەوە و لەمپەر لەبەردەم پرۆژەی ئاهورامەزدا دادەنێت. ئەو خوداوەندەی کە لەجیهاندا خێر و ڕووناکی پەرش و بڵاوبکاتەوە، ئەمەی دواییش لە ئاینی مەزداییدا بوونی نییە[٢٧٩].

بەڵگەی بەردەوامی توخم و ڕەگەزی زۆر، کە لە مەزداییدا بوونی هەبوو، لەزەردەشتییەتدا پێگەی خۆی لەدەست نەداوە. خۆر، کە لە ئاینەکانی گەلە ئارياییەکاندا بەگشتی، لە ئاینی مەزداییدا چەقی بەستووە و بە پیرۆزی تەماشای کراوە، دەبینن یاشتی شەشەم (خورشید یاشت) لە کتێبی پیرۆزی زەردەشتی (ئاڤێستا_ Avesta) سروودێکە بۆ خۆر دەخوێندرێت، کە دەڵێت: "ئێمە نوێژ بۆ خۆر دەکەین، بۆ ڕۆشنایی نەمر، کە پرشنگەکانی تیژڕەوە، کاتێک خۆر هەڵدێت، خواوەندەکان هەموو ڕادەوەستن، سەدان هەزار لەوان، بەختەوەریی هەڵدەبژێرن و لە ڕێگەی مەزداوە بەختەوەری پێشکێش دەکەنە زەوی بەپیت، پێشکەوتن دەکەنە خەڵات بۆ جیهان و باڵایی بەهەقیقەت دەبەخشن"[٢٨٠].

---

(٢٧٨) حسين قاسم العزيز: البابكيه، ص١٣٠.

(٢٧٩) دياكونوف: ميديا، ص٣٧٨. نوری اسماعيل: الديانه الزردشتير، ل٣١٧.

(٢٨٠) أفستا، ل٤٣٢ و أفستا ياشت ٦، الايه١، ص٤٣٣.

شایانی باسە، زەردەشت (زارادشت، زاراتووشتەرا، زراووستر) بە ڕەگەز میدییەو لە وڵاتی مادو نزیک دەریاچەی ورمێ لەدایکبووە، ئەو لەنێوان ساڵانی (٦٦٠-٥٨٣پ.ز) یان لەنێوان (٦٣٠-٥٥٣پ.ز) یا (٦٢٨-٥٥١) پێش زاین ژیاوە.

ئەگەر دامەزراندنی مەملەکەتی ماد لەبەرچاو بگرین، کە پاش ڕوخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور لە ساڵی (٦١٢پ.ز) بوو بە ئیمپراتۆرییەت، بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە، کە ماوەی پێغەمبەرایەتی زەردەشت لەتەک ئیمپراتۆرییەتی ماددا ڕێک هاوزەمانە. ئەودەمەش سەردەمی خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی و ڕابواردنی مادەکان بووە. بەرئەنجامی ئەو خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندییە، جیاوازی چینایەتی لە کۆمەڵگە میدییەکاندا هاتووەتە ئاراوە و ناکۆکی کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و سیاسی زۆر قووڵ بووەتەوە، هەر ئەو دیاردەش وادەکات، گەندەڵی بەردەوام ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕابواردن و ململانێی چینایەتی[٢٨١].

ڕاستتروایە بڵێین، کە بانگەوازە ئایینییەکەی زەردەشت لەناوەڕۆکدا پرۆژەیەکی نیشتمانی چاکسازی گشتگیر بووە و داوای پتەوکردن و بەهێزکردنی بەهای خێر و ڕووناکی و پێشکەوتن و بەختەوەری کردووە، کە سیمبولی ئەو بزوتنەوەیە (ئاهورا مەزدا) بووە و دژ بە بەهای شەڕ و تاریکی و دواکەوتن و هەژاری، کە لە (ئەهریمەن)دا خۆی نواندووە بجەنگێت، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاسایی بووە، کە چینی باڵادەستی میدی و دەستەبژێری سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابووری باڵادەست، لەڕووی بانگەوازە ڕیفۆرمخوازەکەی زەردەشتدا بووەستن و دژایەتی بکەن، بەناچاری زەردەشت بەرەو هەرێمی باکتریا (باختریا، لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئێران و باکوری ئەفغانستان) کۆچ دەکات و لەوێ هیشتاسپ (فشتاسپ)ی پاشای باکتریا دەچێتە سەر ئاینە نوێیەکەی. ئەمە و لەیەک سەرچاوە زیاتردا هاتووە، کە هیشتاسپ باوکی پاشای فارس دارای یەکەم بووە[٢٨٢].

---

(٢٨١) صموئيل نوح كريمر: أساطير العالم القديم، ص٢٩٤. حامد عبدالقادر: زرادشت بنى قدامى الايرانين، ص٢٩.

(٢٨٢) دياكونوف: ميديا، ص٣٤٠. وليم لانجز: موسوعه تاريخ العالم،٩١/١. هـ.ج، ولز: معالم تاريخ الانسانيه، ٣٥٨/٢. أحمد فخرى: دراسات فى تاريخ الشرق القديم، ص٢٣٠.

زیاد له بەڵگەیەک هەیە، پێ لەسەر ئەو بۆچوونە دادەگرێت، کە سەرکردە فارسەکان زەردەشتییەتیان وەک ئایدۆلۆجییەتێک وەرگرتووە تا دەست بەسەر ئیمپراتۆرییەتی ماددا بگرن و مادەکان کەنارگیر بکەن و خۆیان ئیمپراتۆرییەتەکە بەڕێوەببەن. له ساڵی (٥٢٢-٤٨٠پ.ز) سەردەمی فەرمانڕەوایی دارای یەکەم زەردەشتییەت وەک ئاینێکی فەرمی دەوڵەت پەسەندکراوە. سەبارەت بەم بابەتە دیورانت دەڵێت: **"کاتێک ئاینە نوێیەکەی پەسەند کرد لەوانەیە دارای یەکەم وەک ئیلهامبەخش بۆ گەلەکەی لەو ئاینەی روانی بێت، بۆیە کە دەسەلاتی گرتە دەست شەڕێکی بەربلاو و سەختی دژ بە بیروباوەڕی موغە مەجووسییەکان دەست دایەو زەردەشتییەتی کردە ئاینی فەرمی دەوڵەت"[٢٨٣]**.

بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونە ئەوەیە، کە بڕێک لە فەرمانڕەوا میدییەکان ـ ناودارترینیان گۆماتا (سەمیردیس)ی میدی ـ لە پێناو گەڕانەوەی دەسەلاتی میدییەکان هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی فارسیان داو کودەتایان بەرپا کردو لە دژی زەردەشتییەت ڕاوەستان و ئاینی مەزدایی کۆنیان زیندوو کردەوە، ئەو ئاینەی کە فارسەکان ناوی (مەجوسییەت)یان لێ نابوو.

ول دیورانت دەڵێت: سەمیردیسی میدی **"لە پێڕەوانی مەزهەبی مەجووسی کۆن بوو و لە کاردا بوو بۆ لەناوبردنی زەردەشتییەتی ئاینی فەرمی دەوڵەتی فارس"[٢٨٤]**.

شتێکی تریش لەم بوارەدا ڕامان دەگرێت، ئەویش ناولێنانی مادەکان و باپیرانی تری کورد لەلایەن ئاشوورییەکانەوە بە (ئەومان ـ ماندا)، ئەبێ ڕەگەزی ئەم وشەیە لەکوێوە هاتبێت؟ ئایا ناولێنانێکی ئاینییە؟

ئەمەیان لەڕاستییەوە نێزیکە تا بە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەگات لە کلتوری کوردە ئێزیدییەکاندا ناوی (شێخ مەند) بوونی هەیە، سەیر لەوەدایە، کە لە ناوچەی حومس لە ڕۆژئاوای سوریا شوێنێک هەیە بە ناوی قادش و بە (گردی پێغەمبەر مەند) ناوبانگی دەرکردووە، دوور نییە ئەمەش پێوەندیی بە ڕۆشنبیری

---

(٢٨٣) ول دیورانت: قصه الحضاره، ٤٢٦/٢.

(٢٨٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٤٠٦/٢.

میتانی(حورییەکان)ەوە هەبێت، چونکە ئاشکرایە، کە میتانییەکان لەسەردەمی خۆیاندا کۆنترۆڵی باکوری سوریایان کردووە. (جرنوت فیلهلم) دەڵێت: "**زمانی حورییەکان لە چەرخی چواردەی پێش زاین لە ناوچەکانی سوریادا بڵاوبوویەوە، تا گەیشتە قەتەنا و کادیش** [٢٨٥] لە لاپەڕەکانی پێشووی ئەم کتێبەدا زانیمان، کە دوا کچی پاشای میدی ئەستیاگ ناوی (ماندان) بووەو واتاکەیمان بە (بەخششی خواوەند مەند) لێکدایەوە، خۆ ڕەنگە جۆرە پێوەندییەکی ڕۆشنبیری یا ئەتنی لەنێوان کۆمەڵگەی (ئومان- مندا) و کۆمەڵگەی سابیئە مەندائییەکانەسدا هەبێت، لە کتێبی سوببییەمەندائییەکاندا (حەڕان کووتە) واتە (حەڕانی خواروو) هاتووە، کە ئەمانە لە شاری حەڕان و دەوروبەری چیای مادییەوە هاتوون و ڕوویان لە دەوروبەری شاری بەسرا کردووە: "**لەوێ، لە وەرزی زستاندا کانیاوی گەرم و لە هاویندا سارد و فێنک هەیە**"[٢٨٦].

گەڕان بەدووی بنج و بناوانی میتۆلۆجیادا گرینگە، نەک تەنیا بۆ ڕەواندنەوەی تەمومژ لەسەر میتۆلۆژیای باوباپیرانی کورد لەپێش قۆناخی مادەکان، بگرە بۆ ڕۆشنکردنەوەی زۆر لایەنی میتۆلۆژیا لە ئاینی ئێزیدی و سابیئە مەندائییەکان و میتۆلۆژیای وڵاتی میزوپۆتامیا بەگشتی. سەرەڕای ئەمانەش هەر هەمووی دەروازەیەکە بۆ زانین و ئاشنابوون بە ناوی (ئاینە ئاسمانییەکان)ی جولەکە و کریستیان و ئیسلام.

## شەشەم: ناوبانگی مادەکان

دەسکەوتە نەتەوەییەکان ناو و ناوبانگ بۆ خودی نەتەوە دروست دەکەن. ناوبانگی مادەکان لە جیهانی کۆندا سەرنجڕاکێشە، ڕەنگە هۆکاری ئەم ناوبانگەشیان، ڕووخاندنی ئیمپراتورییەتی ئاشوورو ڕزگارکردنی گەلانی ڕۆژئاوای ئاسیا بووبێت لە ستەم و زەبروزەنگی ئاشوورییەکان. دەشێت ئەم دەسکەوتە مێژووییە دیارترین هۆکاری ناوبانگ دەرکردنی مادەکان بووبێت،

---

(٢٨٥) حرنوت فیلهم لاحوریون، ص٤٩. کادش (قادش) دەکەوێتە سەر ڕووباری (العاصی) لە ناوچەی حومس.

(٢٨٦) محمد عبدالحمید: الدیانە الیزیدیە، ص٢٦.

تەنات پادشاکانی دراوسێی ئیمپراتۆرییەتی فارس لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات بە نازناوی (پاشای مادەکان) نامەیان بۆ پاشای فارس دەنووسی و بەگشتی فارسیان بە میدی ئەژمار دەکرد. لە هەمووی سەیرتر ئەم تێروانینە، نێزیکەی یەک سەدە لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ماد درێژەی کێشا، واتە لە سەرتاسەری فەرمانڕەوایی کۆرشی دووەم، کە ساڵی (٥٥٠پ.ز) حوکمی گرتە دەست تا سەردەمی ئەحشەویرەشی کوڕی دارای یەکەم، کە ساڵی (٤٦٥پ.ز) کوژرا.

نموونە لەسەر شۆرەت و ناوبانگی مادەکان ئەمەیە، کە کاتێک کۆرشی دووهەم نیازی پەلاماردان و داگیرکردنی ماسسا جیتای (ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان)ی بوو، ژنە پاشای ماسسا جیتای نامەیەکی بۆ دەنووسێ و تیایدا دەڵێت: "**بۆ پاشای مادەکان، نیازەکەتمان پێ گەشت و من ڕێنووماییت دەکەم، کە دەسبەرداری ئەم نیازو کارەت بیت**"[287].

کە پاشای فارس ئەحشەویرەشی کوڕی دارای یەکەم ئامادەباشی بۆ پەڕینەوە لە تیسسالیا (لە وڵاتی یۆنان)ەوە، بۆ هەیسپورت (تەنگەی دەردەنیل) دەکرد تا لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ ئاسیا، شاندی ئیسپارتەکان هاتنە لای و پێیان گوت: " **ئەی پاشای مادەکان**"[288].

ئیسپارتەکان دوو کەسیان ڕەوانەی (سووسا)ی پایتەختی فارس کرد، تا چاویان بە ئەحشەویرەش بکەوێت، ئەم دوو پیاوە خۆیان بە پاشای فارس ناساندو پێیانگوت، کە چییان لێ دەکات با بیکات و تۆڵەی خۆی وەربگرێت لەپای ئەو ڕفتارەی کە ئیسپارتەکان بەرانبەر بە پەیامبەرەکانی دارای باوکی کردوویانە. ئەو دەمە، کە دارا پەیامبەرەکانی (نامەبەر) ڕەوانەی لای ئیسپارتەکان کرد و وەک هێمایەک بۆ خۆبەدەستەوەدان داوای ئاو و خۆڵی لێکردن.

ئەو دوو پیاوە ئیسپارتەییە بە پاشایان گوت: "**ئەی پاشای مادەکان، خەڵکی ئیسپارتە ئێمەیان ڕەوانەی لای تۆ کرد تا لەپای کوشتنی نامەبەرەکانی فارس، کە لەوێ کوژران، سزای خۆتمان بەسەردا بسەپێنیت**"[289].

---

(٢٨٧) دیاکونوف: میدیا، ص١٢٦.

(٢٨٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٦٢٨.

(٢٨٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥٣٨.

مادەکان، بە جلوبەرگ و پۆشاک ناوبانگیان دەرکردبوو. دیارە لە پۆشاکی هەر گەلێکدا سێ شت کورت دەبێتەوە: ژینگەی جوگرافی، دیدی جوانکاری و بەهای ڕەوشت. ئەم سێیانەش لە جلوبەرگی مادەکاندا بەدی دەکرێت.

بە پێوەری ئەم سەردەمە، پۆشاکی میدییەکان جوانی و ڕازاوەیی پێوە دیار بووە، تا ڕادەیەک لەسەر ئاستی هەرێمی و دنیادا ناسراو بووە. ئەمەو زۆرینەی فارسەکان جلوبەرگی میدییەکانیان دەپۆشی و بە مووروو و گەردانەو شتی بە نرخی مادەکان، خۆیان دەڕازاندەوە. هیرۆدۆت لە وەسفکردنی فارسەکاندا دەڵێت: **"هیچ کەسێک نییە هێندەی فارسەکان حەزیان بە چاولێکەری بێت، چاولێکەری ئەو شتانەی کە بەخۆیان نامۆیە، بۆنموونە ئەوان جلوبەرگی مادەکان لەبەر دەکەن، چونکە بڕوایان وایە، کە جلوبەرگی مادەکان لە هی خۆیان جوانترە"**[290].

لە پیاهەڵدانی پۆشاکی فارسەکان و چەک و چواڵی سوپاکەی ئەحشەویرەشی کوڕی دارای یەکەم، کە پەلاماری یۆنانی دابوو، هیرۆدۆت دەڵێت: **"کڵاوێکی سێگۆشەی لباد (خوری)ی نەرم و کراسێکی پڕ نەخشی چنراو و ڕازاوە بە قۆڵەکانیشیەوە (قەڵغان)ێک لەشێوەی گوێچکەماسی بەسەر کراسەکەوەو شەرواڵیان لەپێ دەکرد، بەڵام چەکەکانیان زرێیەک بوو لە تووڵ و شووڵی داربی دروست کرابوو، لە ژێریدا لایتەی هەڵکەندن و ڕمێکی کورت و کەوانێکی بەهێزو پتەو و تیرێک لە دار حەیزەران و خەنجەرێک بە لاڕانی ڕاستیدا شەتەک دەدا"**[291].

هیرۆدۆت، درێژەی پێ دەدات و دەڵێت: تیپە میدییەکەی سوپای ئەحشەویرەش، هەمان جلیان دەپۆشی و هەمان چەک و چۆڵیان هەڵدەگرت **"ئەم مۆدیلە لە پۆشاک، مۆدێلێکی ڕەسەنی مادەکان بوو، بە هیچ شێوەیەک جلوبەرگی فارس نەبوو"**[292].

---

(٢٩٠) هیرودوت: تاريخ هيرودوت، ص٩٦.

(٢٩١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦١٥.

(٢٩٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥١٦.

لەهەمان کاتدا هیرۆدۆت دەڵێت: هەر حەوت هاوپەیمانە فارسەکە کاتێک ڕووبەڕووی گۆماتا (سەمیردیس)ی میدی بوونەوە (دوای کشانەوەی ئۆتانیس لە خۆپاڵاوتن بۆ پاشایەتی "لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە هەرکامیان بوو بە پاشا، ئەوا لەپاڵ دیاری پڕ بایەخ، کە لەلایەن فارسەکانەوە ساڵانە پێشکێش دەکرێت، دەستێک جلوبەرگی میدیی بە هەر یەک لە ئۆتانیس و نەوەکانی پێشکێش دەکەن"[٢٩٣]. لە ترقیا "کاتێک ئەحشەویرەش و سوپاکەی گەشتنە ئەکانتوس، دڵنەوایی خەڵکەکەی کردو وەک هاوڕێ جلوبەرگی میدی پێشکێش کردن"[٢٩٤].

دیاکۆنۆف، باس لە پێکهاتەی جلوبەرگی میدی دەکات و دەڵێت: "دوو قۆڵی بلندو درێژی پێوە بوو، شەرواڵێکی قەد پێچ و چەمک شۆڕ، لەگەڵ ڕۆبێکی کورت لە پارچەو کوتاڵی ڕەنگاوڕەنگی ئاوریشم، کڵاوێکی قووچیان لە سەر دەنا، ئەم جلوبەرگە پۆشاکی سوارەکانی ئەریزانت بوو و هەر هاوولاتییەکی میدیای ڕۆژئاواو ناوەند ئەم پۆشاکەیان لە نیوەی یەکەمی هەزارەی پێش زاین دەپۆشی، بەلام لە ڕۆژهەلاتی ئەم ولاتە خەڵکەکەی لەدێر زەمانەوە ئەم جلوبەرگەیان لەبەر دەکرد، ئەم پۆشاکە تایبەت بە گەلانی مادی ڕۆژهەلات لەسەرتاپای ولاتی مادەکان بەگشتی بەربلاو بوو، لە چەرخی شەشەمی پێش زاین فارسەکانیش ئەم پۆشاکەیان دەپۆشی"[٢٩٥].

بێجگە لە جلوبەرگ و پۆشاک، دیاکۆنۆف دەڵێت: خاکی میدیا و بەتایبەتی ڕووی ڕۆژئاوای چیاکانی زاگرۆس (کەرکووکی ئێستە دەکەوێتە ئەوێوە) یەکەمین ناوچەی جیهان بوو، کە نەوتی لێ هەڵدەقوڵا، ئەو دەبێژێت: "لە زەمانی کۆندا و تەنانەت لە ئەورووپا، ناویان لە نەوت نابوو (زەیتی میدی)"[٢٩٦].

(٢٩٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٩.

(٢٩٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣١.

(٢٩٥) دیاکونوف: میدیا، ل٣٤٨-٣٤٩. (الایزرانت) خێڵێکی میدییە.

(٢٩٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩

# پێرستی سەرچاوەکان


١- ابن الأثير ( عز الدين ) : الكامل فى التاريخ ، دار صادر ، بيروت ، ١٩٧٩ م .

٢- الدكتور أحمد الخليل : تاريخ الكرد فى الحضارة الاسلامية ، دار هيرو للطباعة و النشر ، بيروت ، الطبعه الألى ٢٠٠٧ م .

٣- أحمد عدوان : الدولة الحمدانية ، المنشأة العربية ، ليبيا ، الطبعة الأولى ، ١٩٨١ م .

٤- أرشاك سافارستيان : الكرد و كردستان ، ترجمة الدكتور أحمد الخليل ، دار هيرو للطباعة والنشر ، بيروت ، الطبعة الأولى ٢٠٠٧ م .

٥- أرنولد توينى :مختصر لدراسة التاريخ ، ترجمة محمد شبل ، الادارة الثقافية فى جامعة الدول العربية ، الطبعة الأولى ،١٩٦٤ م .

٦- أفستا ، اعداد الدكتور خليل عبد الرحمن ، مطبعة دار الحياة ، دمشق ،الطبعة الأولى ، ٢٠٠٧ م .

٧- ألبرت كيرك كريسون : الكتاب الملكية لآشور ناصربال الثانى ، ترجمة صلاح سليم على ، دار ادى شير للنشر و الاعلام ، أربيل ، ٢٠٠٤ م .

٨- أنطون مورتكارت : تاريخ الشرق الأدنى القديم ، تعريب توفيق سليمان ، على أبو عساف ، قاسم طوير ، ١٩٥٠ م .

٩- جرنوت فيلهلم : الحوريون تاريخ و حضارتهم ، ترجمة و تعليق الدكتور فاروق اسماعيل ، دار جدل ، حلب ، الطبعة الأولى ، ٢٠٠٠ م .

١٠- جفرى بارندر(مشرف على التحرير ): المعتقدات الدينية لدى الشعوب ، ترجمة الدكتور امام عبد الفتاح امام ، عالم المعرفة ، الكويت ، ١٩٩٣ م .

١١- جيمس ميلارت : أقدم الحضارات في الشرق الأدنى ، ترجمة محمد طلب ، دار دمشق للطباعة و النشر و التوزيع ، دمشق ، الطبعة الأولى، ١٩٩٠ م .

١٢- جيمس هنرى برستد : انتصار الحضارة ، ترجمة أحمد فخرى ، مكتبة الأنجلو المصرية ، الطبعة الأولى ، ١٩٥٥ م .

١٣- حامد عبد القادر : الأمم السامية ، دار نهضة مصر للطباعة والنشر ، القاهرة ، ١٩٨١ م .

١٤- حامد عبد القادر : زرادشت الحكيم نبى قدامى الايرانين ( حياتة و فلسفته ) مكتبة نهضة مصر و مطبعتها ، القاهرة ، ١٩٥٦ م .

١٥- حسين قاسم العزيز : البابكية ، دار المدى ، دمشق ، الطبعة الأولى ، ٢٠٠٠ م .

١٦- ابن خلدون : تاريخ ابن خلدون ، دار الكتاب المصرى ، القاهرة ، دار الكتاب اللبنانى ، بيروت ، ١٩٩٩ م .

١٧- الدكتور خليل جندى : الأيزدية و الامتحان الصعب ، دار آراس للطباعة و النشر ، أربيل ، كردستان العراق ، ٢٠٠٨ م .

١٨- دياكونوف : ميديا ، ترجمة وهبية شوكت ، رام للطباعة و التوزيع ، دمشق .

١٩- الزبيدى ( محب الدين ) : تاج العروس من جواهر القاموس ، الطبعة الخيرية ، القاهرة ، ١٣٠٦ هـ .

٢٠- سامى سعيد الاسعد ، و رضا جواد الهاشمى : تاريخ الشرق الأدنى ، ايران و الأناضول ، وزارة التعليم و البحث العلمى ، العراق .

٢١- سيغموند فرويد : الطوطم و التابو ، ترجمة بو على ياسين ، دار الحوار للنشر و التوزيع ، اللاذقية ، الطبعة الأولى ، ١٩٨٣ م .

٢٢- صموئيل نوح كريمر ( نشر و قدم له ) : أساطير العالم القديم ، ١٩٧٤ م .

٢٣- الأستاذ ته باقر ، الدكتور فوزى رشيد ، الأستاذ رضا جواد هاشم : تاريخ ايران القديم ، مطبعة بغداد ، بغداد ، ١٩٧٤ م .

٢٤- دكتور عبدالحميد زايد : الشرق الخالد ( مقدمة فى تاريخ و حضارات الشرق الأدنى من أقدم العصور حتى عام ٣٢٣ ق.م ) ، دار النهضة العربية ، القاهرة ، ١٩٦٧ م .

٢٥- الفردوسى ( أبو القاسم ) : الشاهنامه ملحمة الفرس الكبرى ، ترجمة سمير مالطى ، دار العلم للملاين ، بيروت ، الطبعة التابعة ، ١٩٨٦ م .

٢٦- ل . ديلابورت : بلاد مابين النهرين ، الحضارتان البابلية و الآشورية ، ترجمة محرم كمال ، الطبعة النموذجية .

٢٧- مجموعة من الباحثين : كركوك ( بحوث الندوة العلمية حول كەكوك ) ، دار آراس ، أربيل ، كردستان ، ٢٠٠١ م .

٢٨- محمد عبدالحميد الحميد : الديانة اليزيدية بين الاسلام و المانوية ، الأوائل للنشر التوزيع و الخدمات الطباعية ، دمشق ، ط ١ ، ٢٠٠٢ م .

٢٩- محمد عبدالقادر : ايران منذ فجر التاريخ حتى الفتح الاسلامى ، مكتبة الأنجلو المصرية ، القاهرة ، ١٩٨٢ م .

٣٠- م . روزنتال ( اشراف ) : الموسوعة الفلسفية ، ترجمة سمير كرم ، دار الطليعة للطباعة والنشر ، بيروت ، الطبعة الثانية ، ١٩٨٠ م .

٣١- تمروان المدور : الأرمن عبر التاريخ ، دار مكتبة الحياة ، بيروت ، الطبعة الأولى ، ١٩٨٢م.

٣٢- المسعودى : مروج الذهب و معادن الجوهر ، تحقيق محمد محى الدين عبد الحميد ، دار الفكر ، الطبعة الخامسة ، ١٩٧٣م .

٣٣- المقدسى ( مطهر بن طاهر ) : البدء و التاريخ ، مكتبة الثقافة الدينية ، ١٩٧٠م .( الكتاب منسوب الى أبى زيد أحمد بن سهل البلخى ) .

٣٤- نورى اسماعيل : الديانة الزردشتية ( مزديسنا ) ، منشورات دار علاء الدين للنشر و التوزيع و الترجمة ، دمشق ، ١٩٩٩م .
٣٥- هارفي بورتر : موسوعة مختصر التاريخ القديم ، مكتبة مدبولى ، القاهرة ، الطبعة الأولى ، ١٩٩١م .
٣٦- هـ . ج . ولز : ماعالم تاريخ الانسانية ، ترجمة عبد العزيز توفيق جاويد ، لجنة التأليف و النشر ، القاهرة ، ١٩٦٧- ١٩٧٢م .
٣٧- هديب غزالة : الدولة البابلية الحديثة ( ٦٢٦- ٥٣٩ ق.م ) الأهالى للطباعة و التوزيع ، دمشق ، الطبعة الأولى ، ٢٠٠١م .
٣٨- الهمذانى ( رشيد الدين ) : جامع التواريخ ، ترجمة محمد صادق نشأت ، محمد موسى هنداوى ، فواد عبد المعطى الصياد ، دار احياء الكتب العربية ، القاهرة .
٣٩- هيرودوت : تاريخ هيرودوت ، ترجمة عبد الاله الملاح ، المجتمع الثقافى ، أبو ظبى ، ٢٠٠١م .
٤٠- ول ديورانت : قصة الحضارة ، الادارة الثقافية ، جامعة الدول العربية .
٤١- وليام لانجز : موسوعة تاريخ العالم ، أشرف على الترجمة الدكتور محمد مصطفى زيادة ، مكتبة النهضة المصرية ، القاهرة ، ١٩٥٩م .
٤٢- Mehrdad R. Izady;The Kurd , C rane Russak Washington , philadelphid , London , 1992 .



CAUCASUS
MESOPOTAMIA
Amuq Culture
(Early Ubaid Culture)
Jarmo
Tell Hasan
Culture)
Extent of the Halaf Culture of Kurdistan,
Circa 6000-5400 BC: Distribution of Pottery
Halaf
Halaf related
Halaf, mixed with neighboring cultures
Areas with Kurdish majority today
Remark: Northern boundaries of the Halaf Culture are presently less certain than the southern.
Source: Michael Roaf, Cultural Atlas of Mesopotamia and the Ancient Near East (New York: Equinox-Oxford, 1990), p. 49.
Scale
Km 0 100
Miles 0 50 100



رسم محفور على القبر الحجري لـ (قز قابان) لـ كياكسار (كيخسرو)



الثائر الميدي ضد الأخمينيين (فرورتيش) مأخوذ من حجر بيستون



محاربان ميديان يصارعان اثنين من السكيث



فرسان من قبائل الساكا ((السكيث))



محارب ميدي يحارب بأسلحة خفيفة محاربا يونانيا

مأخوذ من ختم القرن الخامس قبل الميلاد



محارب ميدي يصرع محاربا يونانيا

مأخوذ من ختم القرن الخامس قبل الميلاد



عربة للميديين يجرها فرس من برسيبوليس استقبل القرن

الخامس قبل الميلاد

